فاروق ڕەفیق

# ستەمکاری

## مەملەکەتی ترس و لەمرۆڤ خستنی مرۆڤ و ترۆر کردنی عەقڵ

٢٠٠٣

فاروق ڕەفیق

# ستەمکاری

مەملەکەتی ترس و لەمرۆڤخستنی مرۆڤ و ترۆرکردنی عەقڵ

٢٠٠٣

نرخی تەنها (١٥) دینارە

ناوی کتێب: ستەمکاری: مەملەکەتی ترس و لەمرۆڤخستنی مرۆڤ و ترۆرکردنی عەقڵ
ناوی نووسەر: فاروق رەفیق
بابەت: لێکۆڵینەوە
تیراژ: ٢٠٠٠
ساڵی: ٢٠٠٣
ژمارەی سپاردنی (٢٠١)ی ساڵی ٢٠٠٣ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە
چاپ: چاپخانەی رەنج

پێشکەشە:

## بە رەنج و جوامێری و غروری

## (رەفیق حەمە کەریم عەزیز ئاغای شیوە کەڵ)

# ناواخن

# دەروازەیەك:

## فەلسەفەو ستەمكاری

ستەمكاری ئەو دیاردە ترسناكەیە كە فەلسەفە لەمێژووی دوورودرێژی خۆیدا مامەڵەی لەتەكدا كردوە، رووناكی خستۆتە سەرو پرسیاری لەنارەوایەتی ئەو دیاردەیە، ئەو سیستەمە كردوە. زیادەڕۆیی نییە گەر بڵێین یەكێك لەغەمە بنەڕەتیەكانی فەلسەفە بریتییە لەبوونی ستەمكاری، ئەو دیاردە ترسناكەی كە نەك هەمیشە هەڕەشەی لەبوونی ئینسانو ژیانی سیاسیو رۆحی ئینسانو هەڕەشەی لەخودی ژیان كردوە بگرە هەڕەشەی لەخودی فەلسەفەش كردوە، چونكی گەر لەبەر هیچ نەبێت لەبەرئەوەی فەلسەفە تەنیا لەكەشو هەوایەكی ئازاددا دەتوانێ هەناسەبداو ستەمكاریش هەموو ئازادییەك زەوت دەكا.

لێرەوە دەتوانین بڵێین كە پەیوەندی فەلسەفەو ستەمكاری پەیوەندییەكی مێژوویی تەنگا تەنگە، ئەم پەیوەندییەش كۆمەڵێ رەهەندی هەیەو كۆمەڵێ پرسیار لەخۆدەگرێ هەر لەسەر هەڵدانی فەلسەفەوە، بەتایبەتی فەلسەفەی سیاسی، تاكو سەردەمی ئەمرۆكە گەر لەتەك هایدگەردا نەڵێین سەردەمی مەرگی فەلسەفەیە ئەوا بەلانی كەمەوە دەشێ بەسەردەمی سەرەو لێژبوونەوەی فەلسەفە لەقەڵەمی بدەین كە یەكێك لەنیشانەكانی ئەو سەرەو لێژبوونەوەیە پرسیارنەكردنی فەلسەفەی هاوچەرخە لەستەمكاری لەرۆژگاری ئەمرۆدا.

لەو پرسیارانە كە پێ بە پێ لەتەك سەرهەڵدانی فەلسەفەو سەرهەڵدانی ستەمكاری وەكو سیستەمێكی سیاسی نەگونجاوو پڕ لەتەڵزگە هەمیشە بەشێوازی جۆراوجۆر بەئاشكراو بە پەنهانی خۆیان خستۆتە روو دەتوانین ئاماژە بەچەند پرسیارێك بدەین: چۆن فەلسەفە لەتەك ستەمكاریدا هەڵدەكا؟ فەلسەفە چۆن لەستەمكاری دەڕوانێ؟ ستەمكاری وەكو سیستەمێكی دژ بەعەقڵو هەستی گشتی (Common Sense) هەڵوێستی بەرانبەر بەفەلسەفە چییە، فەلسەفە وەكو سیستەمێكی عەقڵیو لۆژیكیو فەلسەفە وەكو گەشتێك بەرەو راستیو عەدالەت؟ ئایا فەلسەفە دەتوانێت هۆكارێك بێت بۆ چاككردنی (ریفۆرمی) ستەمكاری یا هەر رژێمێكی دی؟

ئایا پەیوەندی فەیلەسوفو ستەمكار چ جۆرە پەیوەندییەكە؟ پەیوەندی حیكمەتو دەسەڵات چ جۆرە پەیوەندییەكە؟ ئایا فەلسەفە دەشێ دەست وەرداتە

ناو کاروباری سیاسەتەوە یاخود فەلسەفەو فەلسەفاندن بەناچاری کارێکی "سیاسییە"؟ ئایا فەلسەفە خۆی بەشێك نییە لەستەمکاری؟ ئەمانە مشتێکن لەخەرواری لەپرسیارو رەهەندی ئەم پەیوەندییە ئالۆزە.

قسەکردن لەسەر ئەم پەیوەندییەی نێوان فەلسەفەو ستەمکاری ناشێ تەنیا کارێکی عەقلی رووت بێتو تەنیا گرنگی مێژوویشی نییە، بەڵکو ئەم باسو لێکۆڵینەوەو پرسیارکردنە باسکردنە لەفەلسەفە خۆی، لەمێژووی فەلسەفەو بگرە هەمیشەش سەرەتای هەموو فەلسەفاندنێکیشە. گەر خوداناسی (سیۆلۆجیا) ئەو زانستە، ئەو بوارە مەعریفییە بێت کە باس لەخودایەتی دەکاو باس لەسیفاتو خاسیەتو جیۆ مەقامی یەزدانو ئیمانو پەیوەندی خوداو ئینسانو پەیوەندی واقیع بەترانسندێنتاڵ (متعالی)یەوە، ئەوا فەلسەفە وەکو پرۆژەیەکی عەقلی ئینسانی باس لەواقیع، لەو شتەی کە هەیە، باس لەئینسانو پەیوەندیە ئینسانییەکانو رەهەندە ئۆنتۆلۆژیەکەی ژیانو ئنجا رەهەندە ژیانیو مەعریفییەکانی وجودو بوونی ئینسان لەبووندا دەکا، کە بەناچاری رەهەندێکی سەرەکی ئەم بوونە پرسیارکردنە لەچۆنێتی ژیان، چۆنێتی پەیوەندی سیاسیانەی ئینسانەکانو پرسیارکردن لە چۆنێتی ژیان لەژێر سایەی چ جۆرە سیستەمێکی سیاسی ئەو تۆدا کە گونجاوە، عەقلانییەو لەبارە بۆ مەیسەرکردنی ژیانێکی چاك بۆ ئینسانەکان. فەلسەفەی سیاسی ئەوکاتە سەرهەڵدەدا کە ئەوپرسیارە خۆی قووت دەکاتەوە "باشترین سیستەمی سیاسی کامەیە؟" بەواتایەکی دی ئینسانەکان بۆ ئەوەی رێکخستنێك بخەنە نێو شێوازی ژیانیانەوە، نێو کاروباری رۆژانەو رێکخستنی کاروباری شارەوە (ولاتەوە) لەرووی سیاسییەوە، واتە رێکخستنی پەیوەندی فەرمانڕەواو فەرمان جێبەجێکەر (Rulers and Ruled)، دەبا کۆمەڵێ پرسیار بخەنە روو کە هەر هەمووی باس لە سەرهەڵدانی هەم شار وەکو رێکخستنێکی سیاسیو رۆحی دەکاو هەم سەرهەڵدانی فەلسەفەی سیاسی وەکو بوارێکی مەعریفی کە ئەو پەیوەندییەو ئەو جۆرە ژیانە دەکاتە ئیشکالیەتو شوێنی پرسیار. کەواتە لەتەك سەرهەڵدانی ستەمکاریدا فەلسەفەش سەرهەڵدەدا، لەتەك یەکەم رێکخستنی سیاسیانەی گروپو دەستەو تاقمەکاندا لەبۆتەقەی جڤاتێکدا، یا بەقەولی یۆنانییە کۆنەکان لەبۆتەقەی شار (Polis)دا فەلسەفەی سیاسیش سەرهەڵدەدا بەرمەبنای پرسیارکردن لەژیانو بوونو جۆری سیستەمی سیاسیو ئەو رێکخستنە ئالۆزەکە لەژێر سایەیدا ئینسانەکانو پەیوەندییە ئالۆزەکان کۆدەکاتەوە. لێرەوە پرسیارکردن لەجەوهەری ستەمکاری وەکو رێکخستنێکی سیاسیانەی پەیوەندی ئینسانەکان، وەکو رێکخستنو بەڕێوەبردنی سیاسیانەی شار (ولات) سەر هەڵدەدا، پرسیاری ئەوەی ئایا ئەم سیستەمە سیستەمێکی چاکە، عادلە،

ستەمكاری وەكو رێكخستنێكی سیاسیانەی پەیوەندی ئینسانەكان، وەكو رێكخستن‌و بەڕێوەبردنی سیاسیانەی شار (وڵات) سەر هەڵدەدا، پرسیاری ئەوەی ئایا ئەم سیستەمە سیستەمێكی چاكە، عادلە، بەرمەبنای عەقڵە یا غەریزەكان؟ یاخود ناعادل‌و خراپ‌و نا ئەقلانییە؟ گەر وەك پرۆژەیەكی عەقلانی سەیری فەلسەفە بكەین‌و دایبڕین لەهەموو ئەو بۆچوونانەی كەوا سەیری فەلسەفە دەكەن وەكو تێڕامانێكی رووت لەبوون لەدەرەوەی هەل‌و مەرجی ئینسانی، ئەوا دەبێت بڵێین فەلسەفە ئەو كاتە وەكو سیستەمێكی عەقلی‌و وەكو هەوڵدانێكی مەعریفی سەر هەڵدەدا كە سیستەمێكی سیاسی بەناو (Polis) شار سەرهەڵدەداو لێرەوە فەلسەفە لەپاڵ رەهەندە ئۆنتۆلۆژی‌و ئیبستیمۆلۆژی‌و جوانناسییەكەیدا رەهەندێكی ئەخلاقی‌و سیاسیانە لەخۆ دەگرێ كە جەوهەرین‌و مەرجن بۆ سەرەتاو سەرهەڵدانی فەلسەفەو بگرە لەرەهەندە بنەڕەتییەكانی فەلسەفە كە لەدواجاردا پەیوەندیان بەپرسیاری چۆنێتی ژیان‌و چاكەو خراپەی سیستەمی سیاسییەوە هەیە، هەر ئەمەشە پەیوندی فەلسەفە بەستەمكارییەوە.

لێرەدا چاكترە هەڵوێستەیەك بكەین‌و بپرسین مەبەستمان لەستەمكاری چییە؟ هەموو هەوڵێك بۆ پێناسەكردنی ستەمكاری هەوڵێكی خۆكوژییە ، جۆرێكە لە خۆكوشتن لەرووی مەعریفییەوە، چونكی ستەمكاری ئەو مەخلوقەیە كە شێوەی خۆی دەگۆڕێ، چونكی ستەمكاری لەلایەكەوە كورت ناكرێتەوە بۆ لایەنێك، رەهەندێك بەڵكو دیاردەیەكە فرە رەهەندو لەوكاتەدا كە دوای هەوڵدانێكی زۆر دەڵێین "ئائەمەیە ستەمكاری"و دەرەوەی ئەم حاڵەتەش حاڵەتێكی نا ـ ستەمكارییە یا دوورە لەستەمكارییەوە، ئا لەوكاتەدا ستەمكاری لەبەرگێكی دیكەدا خۆی بەیان دەكا، ئالەوكاتەدا ستەمكاری هەندێك رەهەندی خۆی دەشارێتەوەو ئیدی سەرئەنجام ئێمە نەمانتوانیوە ستەمكاری پێناسە بكەین‌و بیناسینەوەو بگرە هەندێك جار بەسیستەمێكی سیاسی كە بەڕاستی ستەمكارییە ناوی تری لێدەنێین‌و رەنگە بڵێین ئەو سیستەمە پەیوەندی بەستەمكارییەوە نییە. وێڕای ئەم هۆشیار كردنەوەیەش دەتوانین چەند پرەنسیپ‌و لایەنی سیاسی ئەو سیستەمە كە پێی دەڵێین ستەمكاری دیاری بكەین بەڵام بەومەرجەی كە هەمیشە لەیادمان بێت كە ستەمكاری هەمیشە ئەگەرێكی كۆمەلایەتی‌و سیاسییە بەروو و شێوەی جیاواز جیاوازەوە، بەو مەرجەی هۆشیاربین كە باشترین رژێم، چاكترین‌و عادل ترین سیستەم دەكەوێتە نێو زەلكاوی ستەمكارییەوە، یاخود ستەمكاری ئەگەرێكە لەوێ گەر بێتو پشتی لێبكەینەوەو دەستەلات وەك پرنسیپ‌و پێویستییەكی هەمیشەیی تاقینەكەینەوەو فەحسی دەستەلات نەكەین‌و بەشداری نەكەین لەبڕیارە

چارەنوسسازەکاندا. ئێستا دەتوانین بڵێین کە زۆر جاران ستەمکاری وابیری لێدەکرێتەوە وەك سیستەمێکی زاڵم کە لەسەر زوڵمو پەخشکردنەوەی ترسەوە بەندەو لەسەر ترس دەژی، ترسو تۆقاندنی دانیشتوان وەك سیستەمێکی فەرمانڕەوایەتیکردنی کەسێك یا چەند کەسانێك یا گروپێك (کە لەرۆژگاری مۆدێرندا دەتوانین بڵێین دەستەڵاتی حیزبێکی سیاسی بە ئایدیۆلۆژیایەکی خەفەقان ئامێزەوە)، سیستەمێك کە یەکێك لەنیشانە سەرەکیەکانی ناسینەوەی ئەم سیستەمە بریتییە لەنەبوونی رەوایەتی (مەشروعیەت) نەبوونی رەوایەتی یاسایی‌و ئەخلاقی‌و سیاسی. سیستەمێك کە لەلایەکەوە هیچ رەوایەتیەکی نییەو پڕیەتی لە زۆرە ملیّو بەتۆبزی سەپاندنی شتەکان‌و بەڕیوەبردنی کاروبارەکان، لەلایەکی دیکەوە حوکم کردن بەرمەبنای ترس‌و تۆقاندن لەدەرەوەی یاساو رێککەوتن (اجماع)ی هاونیشتمانیان، بگرە لەناوچوون‌و مەحف بوونەوەی ئایدیای "هاونیشتمانی"و کردنی خەڵکی بەرەعیەت (Subjects) لەجیاتی هاونیشتمانیانێك بەخۆیان‌و ماف‌و راوو بۆچوون‌و بەشداربوونیانەوە لەکاروباری سیاسی‌و یاسایی‌و کۆمەلایەتی جڤاتدا. ستەمکارەکان لەرژێمە ستەمکارییەکاندا سەرەتا بەدەست بەسەراگرتنی دەستەڵات دەست پێدەکەن‌و دواجار کێشەی ئاسایش خود بەخود سەرهەڵدەدا کە خۆی بەهانەیەکە بۆ پاراستنی دەستەڵات‌و لێرەوە سیستەمێك دروست دەبێت سەرکوتکەر (Oppressive). لەتەك سەختی پێناسەی ستەمکاریشیدا دەتوانین وەك نەخشەیەك چەند پرنسیپێکی ستەمکاری دیاری بکەین، بەڵام بەومەرجەی لەیادمان بێت کە ستەمکاری دیاردەیەکی ئاڵۆزەو کورت ناکرێتەوە بۆ چەند پرنسیپێك‌و ئەم هەوڵەش تەنیا بۆ چوار دەورگرتنی ئەو دیاردەیەیە یاخود هەنگاوێکە بۆ تێگەیشتن لەستەمکاری، یاخود نەخشەیەکە بۆ دۆزینەوەی رێگاکانی تێگەیشتن.

پرنسیپێك کە مەوقعێکی سەرەکی هەیە کێشەی رەوایەتی‌و نەبوونی رەوایەتییە لەسیستەمی ستەمکاریدا کە ئاماژدەمان بۆکرد. ستەمکاری دەتوانین بەوە بناسینەوە کەسیستەمێکە تێیدا دەستەڵات‌و جۆری حوکم رەوایەتی لەدەست داوە، بەرمەبنای رەوایەتی سیاسی‌و یاسایی نییەو ئۆتۆرەتی (Authority) تێیدا زۆرە ملێیەو دەستەڵات بە تۆپزی دەستی بەسەردا گیراوەو ئنجا لەمەترسناکتریش ئەوەیە کە میکانیزمێك یا میکانیزمەکان بوونیان نییە بۆ فەحسکردنی ئەو دەستەڵاتە، واتە نەبوونی فەحس‌و بالانس (Check and Balance)ی دەستەڵات. دەشیّ دەست بەسەراگرتنی دەستەڵات بەرمەبنای کۆمەڵیّ بەهانەی جیاواز بێت وەکو حاڵەتی تەواری (Emergency) ناکاو فەسادی سیاسی یاخود بەرژەوەندی گشتی یاخود

لەبەدترین حاڵەتدا کێشمەکێش لەسەر دەستەڵات لەنێو گروپو دەستەو تاقمە جیاوازەکاندا یاخود تاکەکاندا. بەهانە هەرچییەك بێت بەرئەنجامەکە یەکێکە ئەویش مۆنۆپۆڵکردن (ئیحتکار کردن)ی دەستەڵاتو ئۆتۆرەتیو مۆنۆپۆلکردنی بەکارهێنانی هێزو چەك بۆ سەپاندنی شێوازێکی تایبەتی لەدیدو سیاسەتو رێکخستنێکی تایبەتی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانو سەپاندنی یەك گوتار لەدەرەوەی رێککەوتن (اجماع)ی جڤاتو یاساو گفتو گۆی مەدەنیانەو عەقڵیانەی فەرمانڕەواو فەرمان بەسەردا کراوەکاندا. خاسیەتێکی دیکەی ستەمکاری بریتییە لەکۆنترۆڵکردنی زانیاریو سەرچاوەکانی مەعریفەو راوبۆچوونو ئینجا بڕیار. ستەمکاری بەکۆنترۆڵکردنی زانیاری سەبارەت بەسیستەمو سەبارەت بەچۆنێتی کارکردنی دەستەڵات دەست پێدەکاو لەئەنجامدا بەوە دەشکێتەوە کە بۆ چوونەکان، عەقڵەکان، دیدەکان کۆنترۆڵ دەکاو یەك جیهانبینی، دیارە جیهانبینیەكو دیدێکی نا عەقلانیو فەحس نەکراو لەلایەن عەقڵەوە، بەسەر هەمووان‌دا دەسەپێنیو دواجار بڵاوکردنەوەی جۆرە زانیارییەك کە ئالودەبووەو بەدوورە لەراستیو ئنجا سەپاندنی بڕیارەکان، جا چ سیاسیە یا ئابوری یا کۆمەلایەتی یا یاسایی، لەدەرەوەی بەشداریکردنو گفتوگۆی عەقڵی. بەڵام ئەم حاڵەتە مەیسەر نابێت، واتە ئەم کۆنترۆڵکردنو سەپاندنی یەك گوتارەو بەیەك بەرگ کردنە نایەتەدی گەر پڕۆسەی بەسەربازیکردنی یاساو کۆمەڵگا پیادە نەکرێت، پڕۆسەی بەسەر بازیکردنیش واتە جەنگ دژ بەئازادییەکانو ملکەچکردنی هاونیشتمانیان لەرێگای بڕیارو فەرمانە هەڕەمەکیەکانەوە، ئەو فەرمانو بڕیارانەی کە هیچ بنەمایەکی یاساییو فیکریو ئەخلاقیان نییەو سەرچاوەکەشیان کەس نییە جگە لەستەمکارو گروپی فەرمانڕەوا. پڕۆسەی بەسەربازیکردنی کۆمەڵگاو سیاسەت ئەو سەرنجە دەخولقێنێ کە ئەسڵی سیاسەت واتە دەست بەسەراگرتنی دەستەڵاتو ئیدی پیادەکردنی ئەجێندایەك (بەرنامەیەك) کە بتەویو مەبەستت بێ لەدەرەوەی پێویستییە مەدەنیو عەقڵییەکان، واتە رەوایەتی بەخشین بەلاقەکردن، (تەجاوزکردن)ی سیاسەتو جڤاتو دەستەڵات، ئەمە لەکاتێکدا کە چ سیاسەتو چ جڤاتو چ دەستەڵات لەدەرەوەی ئەم لاقەکردنە بەناچاری کۆمەڵێ مانای قووڵی دیکە لەخۆدەگرن. یەکێك لەبەرئەنجامەکانی ئەم لاقەکردنەی دەستەڵاتو بواری مەدەنی بریتییە لەپشت گوێ خستنی ئەرکە مەدەنییەکانو لەجیاتی ئەمە ئەزبەرکردی فەرمانو رێسای ستەمکارو ستەمکارەکان کە بێ گومان لە دەرەوەی ئەخلاقی مەدەنینو دژ بەبەرژەوەندی بواری گشتین. لێرەوە ئەوکاتەی کە خەڵکی یا هاونیشتمانیان ئەخلاقی مەدەنی لەیاد دەکەنو جاهیلن بەرانبەر بەئەرکە سیاسیو مەدەنیەکانیان، واتە دوورە

پەرێزی دەکەن لەسیاسەت ئەو حاڵەتە هیچ نییە جگە لەستەمکاری یاخود بەرئەنجامەکەی دروستکردنی ستەمکارییە ئەو کاتەی خەڵکی گوێ نادەنە ئەوەی کەمەشق بەئازادییەکانیان بکەن ئیدی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ترۆرایزی جڤات بکەن بەئاسانی دەتوانن ئەو کارەبکەن‌و ستەم نواندن دەبێتە کارێکی رۆتین. ئەوکاتە خەڵکی یا هاونیشتمانیان دەستبەرداری ئازادی خۆیان دەبن، ستەمکارەکان دەتوانن لەژێر هەرناوو دروشمێکدا بێت کۆت‌و زنجیرو نیر بهاوێنە سەر مل‌و دەست‌و قاچ‌و رۆحی ئینسانەکان. ستەمکاری لەناوبردنی ئەخلاقی مەدەنی‌و ئازادییە مەدەنیەکانەو کردنی ئینسانە بەرەعیەت، مەخلوقێك کە تەنیا جێبەجێکردنی فەرمانی لەسەرە نەك بوون بەئەندامێکی چالاکی نێو جڤات‌و نەك بوونەوەرێك کە لەبڕیارە چارەنووسسازەکاندا بەشدارە، تەنیا پەیڕەویکردنی لەسەرەو بێ تواناو مافی پرسیارکردن، بێ گوتنی "من بۆ پەیڕەوی بکەم؟" ستەمکاری تەنیا جۆرە حوکم کردنێکی تاکە کەسێك، کەسی ستەمکار یا دیکتاتۆر، نییە بەڵکو دەشێت‌و بگرە واقعێکی مێژووییە کە ستەمکاری حوکمی گروپێك بێت بەناوی "بەرژەوەندی نەتەوەیی"، "بەرژەوەندی خەڵکی"، "بەرژەوەندی ستەمدیدەکان"، "بەرژەوەندی وڵات" تا دوایی لەم جۆرە دروشمانە کە بەهانەن بۆ درێژە پێدانی سیستەمێك کە لەبەردەم پرسیارێکی سادەی عەقڵدا هەرەس دەهێنێت. وەك گوتمان ستەمکاری سیستەمێکی ئاڵۆزو فرە رەهەندەو لەکۆمەڵێ بەرگی جیاواز جیاوازدا لەمێژووی مرۆڤایەتیدا خۆی بەیانکردوەو بەرمەبنای پرنسیپ‌و بەهانەی جیاواز جیاواز کە دوا نمونەی ئەو سیستەمە ستەمکارییە کە بەناوی ئازادی مرۆڤ‌و دیموکراسیەتەوە لەرۆژگاری ئەمڕۆدا خۆی بەیان دەکا. بابگەڕێینەوە بۆ کێشەی فەلسەفەو ستەمکاری.

گەر سەیری فەلسەفەی کلاسیك بکەین لەیۆنانی کۆنداو لەشارستانێتی رۆمانیداو بگرە لەرەوتی فەلسەفە لەهەندێك لەترادسیۆنەکانی دیکەدا وەکو ترادسیۆنی ئیسلامی‌و مەسیحی، دەبینین ستەمکاری هەمیشە وەك کێشەیەك قووت بۆتەوەو شوێنی مشت‌و مڕی فەلسەفیانەی فەیلەسوفەکان بوە. بەڵام لەسەردەمی مۆدێرنداو لەگەڵ سەرهەڵدانی فەلسەفەی مۆدێرنداو بەتایبەت ئەو وەرچەرخانە گەورەیەی کە ئەوبوارەی پێی دەڵێن "زانستی سیاسی" بەخۆیەوە دەبینێت، کێشەکە شێوەیەکی دی بەخۆیەوە دەبینێت‌و ئیدی فەلسەفە یا لە باشترین حاڵەتدا سەرقاڵی ستەمکاری نابێت‌و بەتایبەت بواری زانستی سیاسی لەژێرکاریگەری پۆزەتیڤیزم‌و مێژوویێتی (HIistoricism)دا خۆی لەقەرەی حوکمی بەهایی (Value Judgment)نادا، یاخود لەهەندێك حاڵەتدا سەرقاڵی بەشداریکردن دەبێت لەبیناکردنی ستەمکاریدا بەشێوازی

جیاوازو بەبەهانەی جودا جودا. وێڕای ئەمەش کە گوتمان "ستەمکاری" خۆی لەخۆیدا ئەم زاراوەیە حوکمدانە بەسەر ئەو سیستەمەدا کە سیستەمێکی بەدەو بەدوور لەعەقلْ. بەلاّم ئەوکاتەی کە "زانستی سیاسی"و زانستە کۆمەلاّیەتیەکانی دی دەیەوێت (دەیانەوێت) لاسایی زانستی سروشتی بکاتەوە (بکەنەوە) بەناچاری دەبێت دوورەپەرێزی بکا (بکەن) لەحوکمدان، ئەمەش بەواتایەکی دی قسەکردنە لەکێشەیەکی گەورە کە پەیوەندی بەجیاوازی خستنە نێوان Fact (حەقیقەت، واقیع)و Value بەهاوە هەیە. لیۆشتراوس یەکەم کەسە کەسەرنجمان بۆ ئەم کێشەیە بەووردیو زرنگیو ژیرانە رادەکێشێ. ئەو دەنووسێ "رێك کەوت نییە کە زانستی سیاسی ئەمڕۆ شکستی هێناوە لەوەدا کە لەجەوهەری ستەمکاری بگا وەك ئەوەی کە هەیە، زانستی سیاسی ئێمە ئەمڕۆکە سەرقالّی ئەو باوەڕەیە کە حوکمدانی بەهایی شیاونییە لە لەبەرچاوگرتنی زانستیانەدا" ئەم کێشەیە وەك گوتمان لەوێوە دەست پێدەکا کە ئەو شتەی پێی دەلّێن "زانستە کۆمەلاّیەتیەکان" لەوانە زانستی سیاسی، هەولّدەدەن لاسایی زانستە سروشتییەکان بکەنەوەو خۆیان وەك زانستی دەقیق لەقەلّەم بدەن وەکو فیزیاو کیمیاو ماتماتیك..هتد. ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی کە دوورە پەرێزی بکەین لەقسەکردن یا حوکمدان لەسەر یا بەسەر ستەمکاریدا. ئەمە لەکاتێکدا کە ستەمکاری مۆدێرن دڕاندانەتر، وەحشیانەتر، ترسناکترو سەراپاگیرترە لەستەمکاریەك کە فەلسەفە لەکلاّسیکدا رووبەرووی دەبوەوە، هەر شتراوس ئاماژدە بەخالّێکی جەوهەریو گرنگی ستەمکاری مۆدێرن دەکا: "ستەمکاری ئەمڕۆکەیی <u>تەکنۆلۆژیای</u> لەبەردەمدایە لەپالْ <u>ئایدیۆلۆژیاکاندا</u>، بەگشتی تەعبیری لێبکەین، ستەمکاری مۆدێرن لەسەر بوونی <u>زانستەوە</u> خۆی دادەرێژێ، واتە تەفسیرکردنێکی تایبەتی یاجۆرێك لەزانست. بە پێچەوانەوە، ستەمکاری کلاّسیك، بەپێچەوانەی ستەمکاری مۆدێرنەوە، رووبەڕوی زانستێك نەدەبووە وە کە بیر لە "داگیرکردن یا کۆنترۆلکردنی سروشت" بکاتەوە"[1] (جەغد کردنەکان لەم کۆتەدا ئێمە زیادمان کردون). داگیرکردنی سروشت بەسروشتی ئینسانیشەوە تاکە خاسیەتێکی جەوهەرییە کە مۆدێرنتی لەکلاّسیكو هەموو ترادسیۆنەکانی دیکە جیادەکاتەوە. هەروەك شتراوس دەلّێت "ئێمە ئەمڕۆ رووبەرووی ستەمکاریەك دەبینەوە کە مەترسی ئەوە دەکرێ، سوپاس بۆ ئایدیای "داگیرکردنی سروشت"و بەتایبەت داگیرکردنی سروشتی ئینسان، مەترسییەك کە ستەمکاری لەقۆناغەکانی پێشوودا نەیتوانیوە دروستی بکا ئەویش ستەمکارییەکی <u>هەمیشەییو گەردوونی</u>". کەواتە ئێمە ئەمڕۆ لەدنیای مۆدێرنداو سوپاس بۆ مۆدێرنتی لەهەرکات زیاتر رووبەڕووی ستەمکارییەکی ستەمکار دەبینەوە، بەلاّم

ئەوە فەلسەفەیە کە بەکاری خۆی هەڵناستێ‌و قسە لەستەمکاری ناکا. قسەکردن لەسەر سەرەو لێژبوونەوەی فەلسەفە لەدنیای مۆدێرنداو ئەو کارەساتەی پێی دەڵێن "زانستە کۆمەڵایەتیەکان" بەناچاری دەبێت هەڵبگرین بۆ بۆنەیەکی دیو هەلیکی دیو لێرەدا بەگشتی تەنیا لەیەك رەهەندی پەیوەندی ستەمکاری‌و فەلسەفە قسەبکەین.

گەر بۆ ساتێك کەم‌و کورییەکانی فەلسەفەی مۆدێرن بخەینە لاوە دەتوانین بڵێین بەگشتی فەلسەفە هەمیشە کێشەی هەبووە لەگەڵ ستەمکاریدا گەر لەبەر هیچ نەبێت ئەوا لەبەر ئەوخاڵە جەوهەرییەی کە فەلسەفەو چالاکی فەلسەفی پێویستی بەفەزایەکی تاڕادەیەك کراوەو ئازاد، فەزایەکی بەدوور لەکۆنترۆڵ‌و هەڕەشەو ترس هەیە تاکو گەشەبکا، ئازادی ئۆکسجینی فەلسەفەیە، بەڵام مەبەست چییە لەئازادی ئەوە کێشەیەکی دیکەیە. فەلسەفە وەکو بوارێکی مەعریفی ناتوانێ لەفەزایەکی سەرکوتکەرانەو ستەمکارانەدا بژی‌و بەرهەم بهێنێت‌و شتەکان بخاتە ژێر پرسیارەوە. وەك چالاکیەك، گفتوگۆیەکی عەقڵانی، وەك گەشتێك بەدووی حەقیقەتدا فەلسەفە پێویستی بەلانی کەمی ئازادی هەیە کە بەدڵنیاییەوە ستەمکاری ناتوانێ ئەو ئازادییە فەراهەم بکا. هەر لێرەشەوە دەبێت بڵێین‌و چەندین جار جەغدی لەسەربکەینەوەکە سروشتییە فەلسەفە وەك کێشەیەکی گەورەی خۆی سەیری ستەمکاری بکا، وەك تەڵزگەیەك، رێگرێك لەبەردەم گفتوگۆی ئازادو عەقڵانیدا. بێ هۆنییە کەفەلسەفە لەیۆنانی کۆنداو بەتایبەت لەشاری ئەسینادا رەونەق پەیدادەکاو بەرهەمدێت‌و گەشەدەکا، بێ هۆنییە کە فەلسەفە لەشارستانێتی ئیسلامیدا تا ئەوکاتە گەشەدەکاو بوونی هەیەو ئامادەیی هەیە، کە کرانەوەیی هەیەو پەراوێزێکی ئازاد بۆ گفتوگۆی عەقڵی.

با سەرنجێکی خێرا بدەینە دووشاری یۆنانی، سپارتاو ئەسینا[٢] سپارتا وەکو شارێکی گرنگی یۆنانی کە رەقیبی ئەسینابوو، شارێك بوو خاوەن سیستەمێکی سیاسی‌و سەربازی‌و کۆمەڵایەتی تایبەت[٣] یەکێك لەسیفاتە سەرەکییەکانی سپارتا گەر نەڵێین ستەمکاری بەلانی کەمەوە دەبێت بڵێین زاڵ بوونی میلیتاریزم (سەربازیگەرێتی)بوو، واتە زاڵ بوونی کەڵکەڵەی سەربازی‌و سەربازیگەری، کردنی کۆمەڵگا بەیەك سەربازگەی گەورە رێکخستنی شار (Polis) بەرمەبنای بۆچوون‌و پرنسیپی سەربازی. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە سپارتا وێڕای گرنگی سیستەمی پەروەردەشی، لەمێژووی خۆیدا یەك تێکستی فەلسەفی بەرهەم نەهێناوە، فەیلەسوفێکی بەرهەمنەهێناوە، دیارە چەندین ژەنەڕاڵ‌و سەرکردەی سیاسی‌و سەربازی‌و ستراتیژیستی گەورەی خستۆتەوە بەڵام لەبواری فەلسەفەدا

تێکستێکی ناچیزیش چییە لەو شارەوە بۆ ئێمە نەماوەتەوە. لەبەرامبەر سپارتادا ئێمە ئەسینامان هەیە کە شارێکی لیبڕاڵ (بەمانای کلاسیکی لیبرال)و دیموکرات کە لەیۆنانی کۆندا بۆتە مەرکەزی چالاکی فەلسەفەو فەیلەسوفانی وەکو سوکراتو ئەفلاتوونو زینۆفۆنو ئەرستۆیی بەرهەمهێناوە. رەوایە لێرەوە وەکو دوو تایپ سەیری سپارتاو ئەسینا بکەین، تایپێك کە تایپی سپارتاییە. رەنگە بێ بەری نەبێت لەفەزیلەت، لەوانە دروستکردنی ستراژیسیستو جەنگاوەرەکان، بەڵام تایپێکە کە فەلسەفە بەرهەمناهێنێ چونکی ناتوانێ لانی کەمی ئازادی فیکرو گفتوگۆی عەقڵیی فەراهەم بکاو تایپێکی دی کە تایپی ئەسیناییە تایپێکە رەنگە بێ بەری نەبێت لەکەمو کوڕی لەوانە بڵاوبوونەوەی جۆرێك لەبەڕەڵایی، ئازادییەکی منداڵانە کە لەلایەن گاڕانەوە بەهەڵە بەکار دەهێنرێت، بەڵام وێڕای ئەمەش فەلسەفە تەنیا لەژێر سایەی ئەم تایپەدا گەشەدەکاتو دەتوانێ قسەی خۆی بکا. گەر بەووردی لەبۆچوونە فەلسەفییەکانی سوکراتو ئەفلاتوونو ئەرستۆو زینۆفۆن وردبینەوە دەبینین کە هەریەك لەم فەیلەسوفانە لەلایەکەوە رژێمی سپارتایان بەرز نرخاندەوە، بەڵام نەیانتوانیوە لەژێر سایەی ئەو سیستەمەدا بژین، لەلایەکی دیکەوە کێشەیان هەبوە لەتەك ئەسینادا، رژێمی دیموکراسی ئەسینایدا، بەڵام هیچ کام لەم فەیلەسوفانە نەیانتوانیوە لەدەرەوەی ئەسینا بەکاری فەلسەفییەوە سەرقاڵ بن، بەواتایەکی دی ئەسینای لیبراڵو دیموکرات بەهەموو کەموکوڕیەکانیشیەوە تاکە مۆڵگەیەکی فەلسەفەو تاکە پەناگایەکی چالاکی فەلسەفەبوە. تایپی سپارتایی دەشێ فەزیلەتی خۆی هەبێت، ئینسانی چوستو چالاکو جوامێرو جەنگاوەر دروست بکا بەڵام فەلسەفە لەو کەشو هەوایەدا هەناسەی بۆ نادرێو هەر بۆیەشە سپارتای مێژوویی یەك بەرهەمی فەلسەفی بەرهەم نەهێنا. بەپێچەوانەوە تایپی ئەسینایی کە رەنگە سیستەمێك بێت زۆر رەزیلەت لەخۆبگرێو ئینسانی عەوامو بازاڕی (Vulgar) دروست بکا بەڵام فەزیلەتێکی گەورەی ئەسینا رێگەدانیەتی بەگەشەکردنی فەلسەفە. بەدرێژایی مێژوو هەردوو تایپی سپارتاییو ئەسینایی خۆیان دووبارە دەکەنەوە، لەهەر چرکەساتێکدا، وێڕایی جیاوازی کلتوورو بەهاو ئایینو ئەو ئەفسانەیەی کەپێی دەڵێن "رەگەز" تایپی ئەسینایی، واتە هەبوونی پەراوێزێك بۆ ئازادیو جۆرێك لەکرانەوەو زاڵ بوونی ئەخلاقی مەدەنیو هەبوونی فەزای گشتی (public)، باڵادەست بووبێت ئەوا فەلسەفەو چالاکی فەلسەفی،و دامو دەستگایەك بوونی هەبووە بۆ برەو پێدانی گفتوگۆی فەلسەفیو لەهەر چرکەساتێکیشدا تایپی سپارتایی باڵا دەست بووبێت ئەوا فەلسەفەو چالاکی

فەلسەفی یا بوونیان نەبووە یاخود لەپەراوێزێکی لەبیرکراودا بوون بێ کاریگەریو بێ هەستکردن بەبوونیانو فەیلەسوفەکان لەحاڵەتی کۆچدا بوونو لەبیری مەنفا.

بالەیۆنانی کۆنەوە بازێکی زۆرگەورەو مێژوویی بدەینو نموونەیەك لەسەدەی بیستەم بهێنینەوە لەمەڕ پەیوەندی فەلسەفەو ستەمکارییەوە. بەر لەوشتەی کەپێی دەڵێن "شۆڕشی کۆمەنیستی رووسی" فەلسەفە لەرووسیادا لەگەشەکردندا بوو، یانەی فەلسەفیو بنکەی فەلسەفیو گفتوگۆی فەلسەفی لەئەکادیمیاکانداو گۆڤاری فەلسەفی خاسییەتێکی ژیانی فیکری روسیای پێش ئەو بەناو شۆڕشەبوو. کاتێك ئەو ئاشوبە کۆمەڵایەتیو رۆحییە روودەداو ستەمکارەکان حوکم دەگرنە دەست ئیدی فەلسەفە پاشەکشێ دەکا، لەو سەرودەمی ئەو ئاشوبەدا چەند فەیلەسوفێك نەك ئازادی قسەکردنیان نامێنێت، نەك بواری چالاکییە فەلسەفییەکان کەم دەبنەوە بەڵکو ئەو چەند فەیلەسوفە کەمەی ئەو سەردەمەی رووسیا لەبۆنە جیاوازەکاندا رووبەرووی نەك ستەمکاری حیزبی کۆمیونیستو کۆمیونیستەکانو دەوڵەت دەبنەوە بەڵکو لەلایەن مێگەلیشەوە تەماتە باران دەکرێن، باشترین نموونە بەسەرهاتی نیکۆلای بردیایڤە. بردیایڤ وەکو فەیلەسوفێك ناچاردەکرێت رووسیا بەجێ بهێڵێو لەفەرەنسا نیشتەجێ بێتو هەر لەفەرەنساشەوە درێژە بەکارە فەلسەفییەکانیبدا. لەماوەی هەفتاو چوارساڵی حوکمی کۆمیونیستەکاندا لەرووسیا یەك فەیلەسوف لەدایك نابێتو چالاکی فەلسەفی کۆتایی پێ دێت (دیارە پێویست بەئاماژدە بۆ کردن ناکا کەمارکسیزم ئایدیۆلۆژیایە نەك فەلسەفە). گەر چالاکییەکی فەلسەفیش بوونی هەبووبێت ئەوا (١) لەپەراوێزدا بووە، (٢) دژ بەدەوڵەت بووەو رێگای پێنەداوە، (٣) وێڕای ئەمەش بۆ مێژوو بڵێین کە لەپەراوێزدا یەك دوو فەیلەسوفی گەورە لەکار نەکەوتن بەڵام دەبا مرۆڤایەتی بەچارەنووسیان ئەو کاتە بزانێو ئاگادار بێت کە کۆمیۆنیزم وەکو سیستەمێکی ستەمکاری کۆتایی دێت. لەکاتێکدا کە فەلسەفە لەژێر سایەی ستەمکاری کۆمیۆنیزمدا وەکو پرۆژەیەك لەبار دەبرێتو هەموو چالاکیەکی فەلسەفی یاساغ دەکرێت، لەو شوێنەی کەپێی دەڵێن "خۆرئاوا" وێڕای هەموو کەموکورییەکانی سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووری، چالاکی فەلسەفە برەو پەیدا دەکا. بۆ نموونە لەئەمریکا، کە دەشێت ژیانی ئەمریکیو خەونی ئەمریکیو سیستەمی سیاسی ئەمریکیو سەرمایەداری ئەمریکی کە وەحشیترین جۆری سەرمایەدارییە شوێنی چەندین رەخنەی قووڵو ماندار بن وێڕای ئەمەش لەسەدەی بیستەمدا گرنگترین سەنتەری چالاکی فەلسەفی پێك دەهێنێت، بەپلەیەك ئەو چالاکییە فەلسەفیانەو چاپکردنەوەی میراتی فەلسەفی شوێنی سەرسوڕمانە. لێرەوە تایپی سۆفیەتی لەگەڵ رێزماندا بۆ سپارتاو فەزیلەتەکانی،

تایپێکی سپارتایی بوو هەر بۆیەشە لەژێر سایەیدا فەلسەفە نەك گەشەی نەکرد بەڵکو پووکایەوە، تایپی ئەمریکیش لەگەڵ ڕێزماندا بۆ ئەسینا، تایپێکی ئەسینایییە، دیموکراتی لیبراڵە کە تێیدا فەلسەفە لەگەش و نمادایە. بەڵام بۆ ئەوەی بەساویلکەیی تاوانبار نەکردرێین دەڵێین کە نمونەی ئەمریکی لەسەرەو لێژبوونەوەدایەو لەرۆژگاری ئەمڕۆدا وێڕای ئەو چالاکییە هەرە دەوڵەمەندەی فەلسەفەش، فەلسەفە دەستەوەستانە لەبەردەم جێهێشتنی کاریگەری لەسەر ئەو سیستەمەو بگرە بەهۆی سەرەو لێژبوونەوەی خودی فەلسەفەشەوە فەلسەفە تێناگا یا نایەوێت تێ بگا چی لەئەمەریکادا دەگوزەرێ.

مەبەست لەباسکردنی ئەونمونە زیندوە لەدنیای مودێرن وەبیرهێنانەوەی ئەو ڕاستیەیە کەفەلسەفەو ستەمکاری دوو دژەیەکن، دوو دوژمنی خوێنینی یەکدی، ستەمکاری لەفەلسەفەدا کەوتنی خۆی دەبینێتەوەو فەلسەفەش لەستەمکاریدا مەرگی خۆی. ستەمکاری ترسی گەورەی لە فەلسەفەو فەیلەسوفەکانە، فەلسەفەش دەزانێ کەستەمکاری ئەو ئاوو هەوایە، ئەو کەشە نییە کەئەم تێیدا گەشەبکا، قسەبکا فەیلەسوف دەزانێ لەژێر سایەی ستەمکاریدا ئەو دەبێت یاماڵی چۆڵ بکا یا لەپەراوێزدا بەنهێنی قسان بکاو بەزمانێکی تەمو مژئاسا بدوێ یا دەبێت ئامادەبێت بچێتە ژوورەساردەکانی زیندانەکانی ستەمکارەکانەوە یاخود ترۆرکردنی کاراکتەری لەلایەن کۆیلەکانی دەستەڵاتەوە، ئەو مەخلوقە عەجیبەی دەستەڵاتی مۆدێرنە دروستی کردووە (رۆشنبیر)، هێرشە شەخسییەکان و گاڵتە پێکردنەکانی ئایدیۆلۆژیستەکانی ستەمکاری. لەفەزایەکی نا ئازاددا، لەنێو جڤاتێکدا کە جگە لەستەمکاری هیچ سیستەمێکی دیکەی ئەزموون نەکردوە، فەلسەفە ناتوانێ هەناسەبدا. بەڵام لەبیرمان بێت کەلەو شوێنەدا کەخەڵکی تامی ئازادی فیکریان نەچەشتوەو هەمیشە دەستو پەنجەیان لەتەك ستەمکاریدا نەرم کردوە، ئەوە بەتەنیا ستەمکار نییە کەدژی فەلسەفەیەو دژی سیاسەت بەڵکو جەماوەریش و بگرە خوێنەوارەکانی ئەو جڤاتەش دژ بەفەلسەفەن و دژ بەفەیلەسوفەکانن. لێرەوە دەبێت تێبگەین لەو دژایەتیکردنەی فەلسەفەو فەیلەسوفەکان لەدنیای ئێمەدا لەلایەن ئەو مەخلوقە عەجیبەوە کە پێی دەڵێن "رۆشنبیر" ئەم دژایەتیە دژایەتیەکە هەم لەلایەن سیستەمی سیاسییەوەو هەم ئەو مەخەلوقانەوە کە فەلسەفە نیشانەی پرسیار لەسەریان دادەنێ لەوانە "رۆشنبیران". هۆکەشی ئەوەیە کە ستەمکاری لەمێژووی دوورو درێژی خۆیدا زەوقێکی هەرەناشرین، دیدێکی هەرە کەچ و خێل بەسەر کەسەکاندا دەسەپێنێ کە یەکێك لەرەهەندەکانی ئەو زەوقە ناشرینە دژایەتیکردنی فەلسەفەو حەقیقەتە، گەرچی لەلایەن ئەوکەسانەشەوەبێت کە خۆیان

بە "خوێندەوار" دەزانن. ئەمجارە ستەمکار رۆڵی پاسەوان، گارد، جەللاد بەجێدەهێڵێ بۆ ستەمکارە گرگنەکان، ئەو ستەمکارە گرگنانەی دژ بەحەقیقەت و فەلسەفەو عەقڵن لەجیاتی خودی ستەمکارو لەژێر پەردەی "پێشکەوتن" و عەقلانیەت و ئازادیدا، هەر ئەمەشە خاسییەتێکی سەرەکی "رۆشنبیر" کە لەجیاتی ستەمکار هەڵدەستێ بە بەدناوکردنی فەلسەفەو فەیلەسوف بەلام ئەمجارە لەژێر ناوی "رۆشنگەریدا"، هەرئەمەشە کارەساتی ئێمە لەم سەردەمەدا.

ستەمکاری تەنیا کێشەیەکی سیاسی نییە کە خۆی لەسیستەمێکی سیاسی خراپدا بەیاندەکا، بەڵکو ئەوکاتە ستەمکاری دەبێتە خوو عادەت و جۆرێك لەدنیابینیی و کۆمەلانی خەڵکی جگە لەستەمکاری شێوازێکی دی، ژیانێکی دی نابیننەوە لەو دیو ئەو سیستەمەوە، ئیدی ستەمکاری نەك ریشەکانی لەداموو دەستگا سیاسیی و حکومییەکاندا دادەکوتێ، بەڵکو ریشە لەناو هەموو دەستگا کۆمەلایەتیی و بگرە لەمەترسناکتر لەرۆحی خەڵکیدا دادەکوتێ و لەجیاتی ستەمکارێك کە لەسەرەوەی هەرەمە کۆمەلایەتیەکەوەیە سەدەها ستەمکاری گرگن دروست دەبن لەپەیوەندیە کۆمەلایەتییەکاندا، لە پەیوەندی ژن و مێردەوە بگرە تا پەیوەندی دۆستایەتیی و تا پەیوەندی نێوان قوتابیی و مامۆستاو بگرە تاپەیوەندی "رۆشنبیران". ئیدی لێرەوە تێگەیشتن لەمۆنتسیکیۆ، کە دواجار لێی دەدوێین، ئاسان دەبێت کە پێی وایە دۆستایەتی لەژێر سایەی ستەمکاریدا مەحاڵە. مەبەستی سەرەکی ئێمە لەم ئاماژەدە بۆکردنە نیشاندانی ئەو راستییەیە کە ستەمکاری تەنیا کێشەیەکی سیاسی نییە بەڵکو کێشەیەکی ئەخلاقیی و دەروونیی و فیکریی و کۆمەلایەتییەو کەسانی ژێر سایەی ئەو سیستەمە هیچ شتێك نییە لەژیانی ئەو خەڵکەدا کە سروشتی بێت، هاورێیەتی درۆیە، پەیوەندی عەشقی درۆیە، پەیوەندی سیاسیانە بوونی نییە لەجیاتی ئەوە پەیوەندی شوان و مەرومالات بوونی هەیە، داموو دەستگای مەدەنی بوونی نییە، لەهەمووی ترسناکتر پەیوەندی رۆحانی بوونی نییەو بگرە رۆحانیەت هەروەك فەلسەفە هەرگیز لەژێر سایەی سیستەمی ستەمکاریدا گەشەناکا. بگەرێنەوە سەرئەو خاڵەی کە بۆ فەلسەفە لەژێر سایەی ستەمکاریدا گەشەناکاو فەلسەفە چۆن لەستەمکاری دەروانێ. فەلسەفە گەشتێکی مەعریفی لەسەرخۆیە بەرەو حیکمەت، گفتوگۆیەکی مرۆڤە ئازادەکانە لەفەزایەکی دۆستیی و ئازاددا لەمەر رەهەندە جیاوازەکانی بوون. بێ هۆنییە کە فەیلەسوفەکانی یۆنان، لەوانە ئەفلاتوون و ئەرستۆ، فەلسەفە دەبەستنەوە بە هاورێیەتیەوەو لەکۆمەڵێ تێکسدا پەیوەست کردنێکی فەلسەفەو سیاسەت و هاورێیەتی دەبیننەوە، بەپلەیەك کەدەتوانین بڵێین فەلسەفە گفتوگۆی هاورێکانە یا جەنتڵمانەکان لەمەجلیسی

هاوڕێیانەدا. ستەمکاری کە سیستەمێکە لەسەر ترۆرو ترس بەندە بوارێك بۆ ئەو فەزا ئازادو پڕ لە بڕواو هاوڕێیەتیە نا هێڵێتەوەو جەنتڵمان دروست ناکا بەڵکو کۆیلە بەرهەمدەهێنێ،و ئیدی لێرەوە فەلسەفەو کاری فەلسەفی مەحاڵ دەبن، کۆیلە حەزی لەفەلسەفە نییە، فەلسەفە کاری جەنتڵمانەو ستەمکاریش جەنتڵمان بەرهەم ناهێنێ. لەژێر سایەی ستەمکاریدا، منداڵەکانی ستەمکاری بەبوغزو تۆڵەو پاشقول لەیەکگرتن پەروەردە دەکرێن. ستەمکار ئەو ڕۆحە نەخۆشە پەروەردەدەکا کەناتوانێ بێ بوغزو نەفرەتو ڕۆحی تۆڵەسەندنەوە بژی، بێ ڕقو کینەو گومان بژی، لەژێر سایەی ستەمکاریدا کە کاریگەریەکی سەنگینی لەسەر هەموو ئەندامانی جڤات هەیە، تەنیا ستەمکارە گرگنەکان دروست دەبن نەك هاوڕێکان.

هەموو چرکەساتە پڕ لەڕەونەقەکانی فەلسەفە ئەو چرکەساتانەن کە یا ستەمکاری بوونی نەبووە یاخود ستەمکاری لاواز بووەو دەستەڵاتێکی سەراپاگیریی نەبوە تاکو ڕێگا لەکاری فەلسەفەو فەیلەسوفان بگرێ دەتوانین، ئەم ئەرگومێنتە (حجەیە) بەکار بهێنین دژی ئەو ڕەگەز پەرستانەی کە فەلسەفە بەموڵکی ڕەگەزێکی تایبەت، واتە ڕەگەزی سپی، دەزانن‌و لەو باوەڕەدان کە تەنیا ڕەگەزی سپی فەلسەفەی بەرهەمهێناوەو بەرهەمدەهێنێ. ئەو ڕەگەزپەرستانە، لەوانە تەنیا بۆنمونە ئاماژدە بۆ ئەمانوێل کانتو ئێرنست رینان بکەین، ئەو ڕەگەزپەرستانە ئەو خاڵە جەوهەرییەی کە لەبیری دەکەن بریتییە لەچۆنێتی سیستەمی حوکم‌و فەرمانڕەواو ئاوو هەوای سیاسی کە بمانەوێت یانەمانەوێت ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن‌و کاریگەریەکی زیاد لەپێویستیان هەیە لەسەر هەبونی یا نەبوونی چالاکی فەلسەفی[٤] کاتێك ئێرنست رینانی ڕەگەز پەرست دەڵێ ڕەگەزی سامی ناتوانێ فەلسەفە بەرهەم بهێنێ، ئەمە رایە نەك بۆچوونێکی ڕەگەز پەرستی رووتە بەڵکو موغاڵەتەیەکی مێژوویشە لەوەدا کە ناتوانێ ئەو ڕاستییەببینێ کە بەناو "ڕەگەز"ی سامی فەیلەسوفی گەورەی دروستکردوە، کەواتە کێشەکە "ڕەگەز" نییە بەڵکو کێشەکە ستەمکارییە، ئەوە ستەمکارییە کە ڕێگرە لەبەردەم چالاکی فەلسەفیدا، ئەوە ستەمکارییە کە کەشی ئازاد لەناودەباو فەلسەفەش لەخەفەقاندا ناتوانێ هەناسەبدا، کەواتە "ڕەگەز" توخمە سەرەکیەکە نییە لەنەبوونی چالاکی فەلسەفیدا بەڵکو هەبوونی یا نەبوونی ستەمکاری توخمە سەرەکیەکەیە. لەو شوێنەدا کە پەراوێزێك بۆ ئازادی بوونی هەیە فەلسەفە گەشەدەکاو لەوشوێنەش کە خەفەقان هەیە ستەمکاری دەژی‌و فەلسەفە دەمرێ. لێرەوە فەلسەفەو ئازادی بێیەك ناژین‌و فەلسەفەو ستەمکاریش پێکەوە ناژین، هەربۆیەشە فەیلەسوفە گەورەکانی وەکو ئەفلاتون‌و ئەرستۆو شیشەرۆو فارابی‌و مۆنتیسکیوو ئارێنتو شتراوس هەمیشە جەغدیان لەسەر

لایەنە کاولکارییەکەی ستەمکاری کردوەو پێیان لەسەر بوونی پەراوێزێك لەئازادی داگرتوە تاکو فەلسەفە بوونی هەبێت.

قسەکردنی ئێمە لەسەر ستەمکاری پرۆژەیەکی درێژەو لێرەدا تەنیا بەشێك لەبۆچوونەکانمان و خوێندنەوەکانمان دەخەینە روو. لەم کتێبەدا چەند فەیلەسوفێك، و چەند بیریارێك و چەند تێکستێك هەڵدەبژێرین بۆ قسەکردن لەسەر ستەمکاری. بەدەگمەن فەیلەسوفێك بەدی دەکەین لەمێژووی فەلسەفەدا، تاکو فەلسەفەی مۆدێرن کە راوبۆچوونی نەبێت بەرانبەر بەستەمکاری و ئازادی و چۆنێتی باشترین سیستەمی سیاسی، لێرەوە قسەکردن لەسەر ستەمکاری نەك سەخترین پرۆژەیە لەپەیوەندیدا بەفەلسەفەو، بگرە پرۆژەیەکە کۆکردنەوەی لەدوو توێی کتێبێکدا مەحاڵە، بەتایبەت کە دەگەینە قۆناغی مۆدێرن گفتوگۆکەمان روویەکی دیکە وەردەگرێت و پێویستی بەووردەکارییەکی تایبەت هەیە چونکی رووبەڕوی بیریاری ئەو تۆ دەبینەوە کە بەشداریدەکا لەبیناکردنی ستەمکاریدا، لەوانە ماکیاڤیلی و هۆبزو لۆك و کارڵ مارکس و.. هتد. بەڵام ئێمە لێرەدا چەند فەیلەسوف و چەند تێکستێکمان هەڵبژاردوە بۆ قسەکردن لەسەر ستەمکاری، باسنەکردنی فەیلەسوف و بیریارەکانی دی لەم روەوە مانای ئەوەناگەیەنێت کە راو بۆچوونی گرنگ و جەوهەریان نییە لەسەر ئەوکێشەیە بگرە باسنەکردنیان تەنیا کێشەیەکی تەکنیکییە ئەویش ئەوەی کە کتێبێك ناتوانێ هەموو ئەو بۆچوونانە، ئەو هەموو خاوەن راو سەرنجانە بەسەربکاتەوە. ئەم کەموکوڕییە تەنیا بەوە پڕدەبێتەوە کەئێمە نیازی خۆمان دەربڕین بۆ خوێنەران، نیازی ئەوەی کە ئەم کتێبە سەرەتای پرۆژەیەکی درێژخایەنە لەسەر ستەمکاری، بەواتایەکی دی ئەمە هەنگاوی یەکەمەو ئێمە لەبوارەکان و هەلەکانی داهاتودا بۆ کێشەی ستەمکاری دەگەڕێینەوەو ئەو تێکستانە، ئەو فەیلەسوفانە بەسەر دەکەینەوە کە باس لەستەمکاری دەکەن.

بۆئێمەستەمکاری پرسیارێکی وجودی و سیاسیانەی گرنگەو بگرە بنەڕەترین پرسیارە لەبەرئەوەی ستەمکاری یەکێکە لەبنەڕەترین کێشەی کۆمەڵگاکانی ئێمە هەر لەمەراکیشەوە تاکو چین، لێرەوە قسەکردن لەسەر ستەمکاری و تێگەیشتن لەم دیاردەیە، ئەم نەخۆشییە سیاسی و کلتوری و رۆحییە مەرجی یەکەمە بەرەو رزگاربوون لەستەمکاری و دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ئازاد. هەر بۆیەشە قسەکردنی ئێمە لەسەر ستەمکاری پرۆژەیەکی درێژخایەنە. لەلایەکی دیکەوە تێگەیشتن لەستەمکاری لای ئێمە تەنیا گرنگیەکی تیوری و عەقلی نییە بەڵکو مەسەلەی ژیان و مەرگە بۆ ئێمە، چونکی ستەمکاری تەنیا سیستەمێکە کە ئێمە پێی ئاشناین و سەدەکان تێدەپەڕن و ئێمە تەنیا پەنجە لەتەك ستەمکاریدا نەرم دەکەین،

بەمانایەکی دی، ستەمکاری تەنیا سیستەمێکە کە لەمێژە باڵادەستە لەدنیای ئێمەدا بەشێوازی جیاواز جیاواز، بەشێوەو رەنگو قەبارەی جیاوازو بەشـێوەیەك کە ئێمـە رام بووبن، راهێنراوین، پەروەردەکراوین، زەینێکمان بۆ دروست بوە کە لەدەرەوەی ستەمکاری هیچ شتێکی دیکە ناتوانین ببینین، لەو چرکە ساتانەشدا کـە هـەلی رزگـار بوونمان بۆ دەرەخسیێ، لەو هەلو بۆنانەشدا کـە دەتوانـین لەستەمکاری دەربـازبین وەکو باڵندەیەکی عاشقی دیلی دەگەڕێینەوە بۆ ناو قەفەسەکەمان، بەڵێ هەندێ جار ستەمکاری لای ئێمە لەقەفەسێکی دەرگا کراوە دەچێت، ئەوە ئێمەین کـە نـاتوانین، جورئەت ناکەین لەقەفەسەکە بێینەدەرەوە، یاخود گەر بێینە دەرەوە یا بمانهێننـە دەرەوەی قەفەسـەکە هـــەر زۆر زوو خۆمـــان دەگەیەنینـــەوە نـــاو قەفەســـەکە. لـــەدەرەوەی قەفەســـیش تووتـــی ئاســـا گۆرانیـــەکانی ســـتەمکاری دەچڕیـــن، لەمامەڵەکردنماندا لەتەك یـەکدی وەك سـتەمکار مامەڵـە دەکـەین، بـەڵێ سـتەمکاری ئێمەی لەمرۆڤ خستووە، ئێمـە جەوهـەری ئینسـان بوونمـان لەدەسـتداوە. هـەرگیز نـابێت بەکۆمـەڵێ دروشمـی عـەدەمی (ناهیلیسـتی)و ئانارشیسـتیو وشـەی "یـاخی بـوون"و "بوهیمـی بـوون" هەڵبخەڵـەتێینو وابزانـین هـەلگرانی ئـەو درووشمانـە دژ بەســتەمکارینو کەسـانی ئـازادن، نـاو هـەزار جارنـا، ئەوکەسـانە پـــەروەردەی ستەمکارین، منداڵە ورکەکانی ستەمکارین، پیاوانی ستەمکارینو مۆرکـی سـتەمکاری لەسـەر رۆحیانـەو ئـەو دروشمانـەش راکردنـن لەمامەڵـەکردن لەتـەك سـتەمکاریدا، مامەڵەکردنێکی عەقڵیو بەرمـەبنای مەعریفـەو ئـەرگومێنت، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە پەرتـەوازەییو بـێ بەرنامـەییو بـێ سـتراتیژیەتی ئـەو سـتەمکارە بچووکانـە خـۆی لەبەرژەوەندی ستەمکارییە، لێرەوە هەموو دروشمێکی عەدەمی بوونو بانگـەواز بـۆ عەدەمیـەتو دژایـەتیکردنی فەلسـەفەی سیاسـیو فەلسـەفە خـۆی خزمەتێکـــە بەسـتەمکاری. هەمیشـە سـتەمکارەکان، چ لـەرابووردودا چ لـەدنیای مۆدێرنـدا، چ بەرمـەبنای سـتراتیژیەتێکی داڕێـژراو بێـت یـاخود لـەڕێگای تـرۆرو تـرسو تۆقـاندنو شـیعرەوە، هـەوڵیانداوە کـە خـەڵکی دیـارە رەعیـەت، بـیر لەسیاسـەت نەکەنـەوە. سیاسەت بەمانا قووڵەکەی نەك حیزب حیزبێنەکەی نـاو وڵاتـانی ئێمـە، هـەوڵیانداوە کەڵکەڵەی سیاسەتو بیرکردنەوە لەدەستەڵاتو بگرە لەرۆژگاری ئەمڕۆدا کەڵکەڵەی گاڵتـەکردن بەسیاسـەتو سیاسـەتمەدارەکان بڵاوبکەنـەوە تـاکو بـوار برەخسـێ کـە ستەمکارو سیستەمی ستەمکاری کاروباری بـەچاکی بـڕوا. بۆسـتەمکاری گـەورەترین کێشـەو مەترسـی ئەوکاتـە سـەرهەڵدەدا کەخـەڵکی پرسـیاری سیاسـیانە بخەنـەڕوو، ئەوکاتـــەی سیاســـەت لەدەســـتەیەك بســـێننەوەو بیگەڕێننـــەوە ژێـــر رکێفـــی هاونیشتمانیان، ئەمەش بەو مانایە نا کەشەڕ لەسەر دەستەڵات بکـەن بـەڵکو بـەمانا

ئەفلاتوونیو ئەرستۆییەکەی سیاسەت واتە پرسیارکردن لەعەدالەتو ژیانی چاکو هەبوونی فەرمانڕەوای عادلو ئنجا فەحسکردنی دەستەلات. سوکرات لەبۆنەیەکدا دەلێت سیاسەت بریتییە لەوەی کە دووهاوڕێ یەکتریان بینی لەباشترین ژیان پرسیار بکەن. مەبەستی سوکرات ئەوەیە کە ئێمە پرسیار دەکەین چۆن بژینو چ ژیانێك دروستترین ژیانەو کامە ژیان زۆرترین بەختەوەریمان بۆ فەراهەم دەکا ئا ئەمەیە کرۆکی سیاسەت. بەلام ستەمکارو کۆیلەکانی ستەمکاری کاریان ئەوەیە کە ڕێگە نەدەن ئەو فەزایە دروست بێت کەتێیدا مرۆڤەکان لەبوونیانو ژیانیان پرسیار بکەن، کاریانڕەزیلکردنی سیاسەتەو سەرقالّ کردنی خەلکی بەژیانی ڕۆژانەو ڕابواردنەوە. لێرەوە ئەو کەسەی کە ئەمڕۆ دژی سیاسەتە لەڕاستیدا لەلایەکەوە گەورەترین خزمەت بەستەمکارەکانو ستەمکاری دەکاو لەلایەکی دیکەوە شەکەرۆکەیە کە (مهرج) کە ستەمکاری بەکاری دەهێنێ بۆ دلّخۆشکردنو مەستکردنی گاڕان تابیر لەپرسیارە سیاسییە چارەنوسسازەکان نەکەنەوە. لێرەوە لەباسکردنی ستەمکاری هاوچەرخدا زۆر پێویستەو مەسەلەیەکی جەوهەرییە کە دەبێت ڕۆلّی "ڕۆشنبیران" لەڕاگرتنی ئەو سیستەمەدا لەبەرچاوبگرین، یەکێك لەکۆلّەکە هەرە سەرەکییەکانی ستەمکاری ئەمڕۆ "ڕۆشنبیرە".

وەکو گوتمان ئێمە لێرەدا تەنیا چەند فەیلەسوفو بیریارێك بەسەردەکەینەوە، چەند تێکستێکی فەلسەفی دەخوێنینەوە، ئەویش لەترادسیۆنی ئەوروپیدا. لێرەوە ڕەخنەیەکی ماندار، کە دیارە لەپالّ ڕەخنەی دیکەدا، بشێ لەم بەرهەمەی ئێمە بگیرێت ئەو ڕەخنەیە دەبێت کە دەلێت "ئەم بەرهەمە لەدیدێکی نێوەندێتی ئەوروپییەوە (Eurocentrism) مەرکەزێتی ئەوروپییەوە نوسراوە. ئێمەش لەتەك پێزانینماندا دەلێین ئەمە عەینی حەقیقەتە. ئێمە وێڕای خەباتمان دژ بەمەرکەزێتی ئەوروپی ( )، پەروەردەبووی ئەوترادسیۆنەین، ڕزگاربوونیش لێی ئاسان نییە. ئێمە زیاتر ئاشنای میراتی فیکری ئەوروپینو لەوبوارەدا مەشقمان بینیوەو پەروەردەبووین. بۆ ئێمە ئاسان نییەو بگرە جورئەتی ئەوە ناکەین کە لەحالّی حازردا دەم لەترادسیۆنی چینیو هیندیو ئیسلامی بدەینو بلێین لەوترادسیۆنانەدا کێشەی ستەمکاری چۆن کەوتۆتەوە. ئێمە لەویژدانێکی تەندروستەوە هەق بەخۆمان نادەین کەیەك دووکتێبۆچکە لەم لاو ئەولا خڕبکەینەوەو پەڕە پەڕەیان بکەینو دواجار بلێین "ئا ئەمەیە دیدی ئێمە لەسەر ئەوترادسیۆنە"، ئەمەکاری ویژدانە بیمارەکانە کە لەکوردا نمونەی زۆرە. ئەو تێکستانەی لێرەدا قسەیان لەسەر دەکەین لەزانکۆو لەسەردەستی شارەزایانی فیکرو فەلسەفە بەوانە خوێندوومانن ئنجا جورئەتی ئەوەمانکردوە دەم لەتەفسیرو خوێندنەوەی خۆمان بدەین، ئەمەش ئەو

ئەخلاقەیە کە لەکوردا بوونی نییە، ئەوەی کە هەیە بریتییە لەچەند ویژدانێکی بیمار، بەڵێ بیمارو چەند ئیگۆیەکی لەخۆڕا فوو تێکراو. ترادسیۆنێکی دیکە کە ئێمە کەمێك شارەزاییمان لەسەر هەیە ترادسیونی ئیسلامییەو ئێمە لەژێر دەستی دوو فەیلەسووفی عێراقیدا ئیسلاممان خوێندۆتەوە، دکتۆر حسام ئالوسیو دکتۆر عیرفان، بەڵام وێڕای ئەمەش قسەکردن لەسەر ئیسلام خۆ ئامادەکردنی دەوێ مەشقکردنو شەونخونی بەسەر کتێبو سەرچاوەکانەوە کە لەئێستادا ئێمە جورئەتی ئەوە ناکەین، گەرچی سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەو میراتە دەوڵەمەندەشین بەڵام جورئەتی ئەوەناکەین خۆمانی لەقەرە بدەین، ئەمەلەکاتێکدا پێویستە لەیادمان بێت کە سۆفستائییەکانی کورد (واتە رۆشنبیرانی کورد) ئیسلامو قسەکردن لەسەر ئیسلام بەنێچیرێکی سانا لەقەڵەم دەدەن، ئەو نێچیرەی کە هەرچی لەسەر بڵێی دروستەو پێویست بە خۆمائامادەکردنو چوون بۆ زانکۆو خوێندنەوەی کتێبەکان ناکاو پێویستی بە شەهادەکان نییە، هەرئەوەندەی کە توانیت شعرێك بنوسی دەتوانی لەسەر ئیسلام قسەبکەیت. گەر جورئەتمان کردباو بمانتوانیبا لەسەر ئیسلام قسەبکەین ئەوا دەمانتوانی کۆمەڵێك فەیلەسوفی ئیسلامی لەوانە فارابی بخەینە ژێر سەرنجو وردبوونەوە وە لەوشوێنەدا کە پەیوەندی بەستەمکارییەوە هەیە. رەنگە بەهانەیەك کە ئێمە بیدەین بەدەستەوە لەبەرانبەر ئەو رەخنەیەدا کە ئاماژدەمان پێکرد واتە یۆرۆ سینتریك بوونی هەندێ بۆچوونی ئێمە رەنگە ئەمە بێت کە ئەو تێکستانەو ئەو فەیلەسوفانەی ئێمە لێیان دەدوێن بەشێکن لەمیراتی فیکری مرۆڤایەتی. ئێمە دەبێت لەتەك ئەو تێکستانەدا خۆمان هاوشێوە بکەینو بەم کارەش ئەو تێکستانە لەناوچەگەرێتی رزگاریان بکەینو خۆشمان بەم کارە لەناوچەگەرێتی رزگار بکەینو ببینە هاونیشتمانیەکی گەردوونی، گەر هاونیشتمانی جیهانی مانایەکی هەبێت.

بەندی یەکەم لەم کتێبەدا تایبەتە بەشیکردنەوەی دایەلۆگەکەی زینۆفۆن تیرانیکۆس ـ کە ئێمە لێرەدا بەپێویستمان زانی دەقی ئەو دایەلۆگە بکەینە کوردیو لەتەك راڤەکردنماندا بۆی لەچوارچێوەی فەسڵێکدا بیخەینە بەردەم خوێنەران. بەندی دووهەم تایبەتە بەئەفلاتوون: "ستەمکاری وەك پەتای رۆحو شار، ستەمکار بەرجەستەبووی ئیرۆس" لێرەدا پێویستە سەرنجی ئەو خاڵە بدەین کە ستەمکاری کێشەیەکی گەورەیە لای ئەفلاتوونو لەکۆمەڵێ دایەلۆگدا بۆ ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوەو بگرە جگە لە چەند دایەلۆگێك نەبێت دەتوانین بەم شێوە یا بەو شێوەیەی دی مەسەلەی ستەمکاری لەدایەلۆگەکانی ئەفلاتووندا ببینینەوەو تەفسیری بۆ بکەین. ئەوەی ئێمە لێرەدا دەیخەینە روو نابێت وەکو کۆی بۆچوونی

ئەفلاتوون سەیربکردرێت لەمەڕ ستەمکارییەوە، داستانی ئەفلاتوون و ستەمکاری بابەتی چەند کتێبێکە، کە بەو هیوایەی لەداهاتوودا بتوانین بۆی بگەڕێینەوەو بەتێروتەسەلی تر قسەی لەسەر بکەین.

بەندی سێیەم "ستەمکاری: لەناوبردنی شارو خەساندنی مرۆڤ و دیلکردنی عەقل: تەفسیرێکی ئەرستۆییانە"

تایبەتە بەڕاوو بۆچونی ئەرستۆ. لێرەشدا دەبێت ئەوە بزانین کە بۆزانینی سەرجەم رای ئەرستۆ لەسەر ستەمکاری پێویستمان بەخوێندنەوەی کۆمەڵێ بەرهەمی ئەرستۆیە، ئێمە لێرەدا تەنیا جەغدمان لەسەر کتێبی "سیاسەت"ە.

بەندی چوارەم "کۆڵەکەکانی ستەماکاری: ترس، عیشق، خووی پەرستن گۆشەگیری" تایبەتە بەخوێندنەوەی دووکتێبی مۆنتسیکیو. لەباسکردنی مۆنتسیکیودا دەمانتوانی رەخنە لەبۆچوونی ئەو بگرین وەکو ئەوروپییەك کە چۆن مامەڵە لەتەك ئەوی دیکەدا (other) کە لێرە ئیسلام و موسڵمانەکانن دەکاو کێشەی "من و ئەوی دیکە" زیندوو بکەینەوەو لێرەشەوە هەم قسە لە نێوەندێتی ئەوروپی بکەین و هەم لەسەر ئۆرێنتالیزم بدوێین. بەڵام وێڕای گرنگی ئەو باسەش ئێمە دوورە پەرێزیمان کرد لەئاماژدە بۆکردنێکی لەو جۆرە چونکی پەیوەندییەکی راستەوخۆی بەباسەکەمانەوە نییە. لەلایەکی دیکەشەوە قووتکردنەوەی ئەو رەخنەیە ئەگەری ئەوە لەخۆ دەگرێ کە پرسیار بخاتە سەرگرنگی بۆچوونەکانی مۆنتسیکیو.

بەندی پێنجەم "دیموکراسی و ئەگەری ستەمکارییەکی نەرم و نیان" تایبەتە بەخوێندنەوەی کتێبەکەی تۆکیوڤیل. بێ گوومان ئەوەی لێرەدا ئێمە گوتومانە خوێندنەوەییەکی سەراپاگیری ئەو کتێبە نییە، ئێمە تەنیا لەپەیوەندیدا بە ستەمکارییەوە قسە لەسەر ئەو کتێبە دەکەین. "دیموکراسی لەئەمریکا" یەکێکە لەهەرە کتێبەگرنگەکانی سەدەی نۆزدە کە تەنیا دەشێ بەراووردی بکەین لەتەك کتێبەکەی هیگڵدا "فینۆ مینۆلۆژیای رۆح" لەگرنگیداو پێویستی بەخوێندنەوەو خوێندنەوەهەیە.

بەندی شەشەم "ئایدیۆلۆژیا هەڵگری تۆوی ستەمکاری" تایبەتە بە هانا ئارێنت. هەرچی پەیوەندی بەم ئافرەتە ژیرو دلێرەوە هەیە دەبێت بڵێین کە عەقڵێکی گەورەی سەدەی بیستەمەو بەردەوام خوێندنەوەی نوێی بۆ دەکرێ و بەتایبەت لەدنیای ئەنگلۆ ـ ئەمریکیدا. فەسڵێك کافی نییە بۆ بۆچون و تیوریەکانی ئەو ئەقڵە لەمەڕ تۆتالیتاریانیزمەوە بەڵکو ئەو کارە بەکتێب دەکرێ، لێرەدا بەتکا وەکو دەروازەیەك بۆ قسەکردن لەسەر ئەو عەقڵە لەم کارەی ئێمە بڕوانن.

دوابەش تایبەتە بە پەروەردەی لیبڕاڵو زانکۆو ستەمکاری. ئـەم فەسڵەش خۆی بابەتی کتێبێکە گەر چەند کتێبێك نەبێت، ئێمە لێرەدا جگە لەچەند سەرنجێك زیاتر هیچی دیکەمان نەخستۆتە روو.

دوا سـەرنجمان ئەوەیە کـە هیواداریـن ئـەم بەرهەمـە هـەنگاوی یەکـەم بێـت بـۆ قسەکردن لەسەر ستەمکاری‌و سەرەتای پڕۆژەیەکی گەورە بێت لەسـەر ئـەو دیاردە ئاڵۆزەو بەوهیوایەی ئەم بەرهەمە ببێتـە مایەی خولقاندنی کۆمـەڵێ پرسیار لەمـەڕ بارودۆخی ستەمکاریانەی کوردەوەو سەرەتایەك بێت بۆ پرسیارکردن لەو نەخۆشییە رۆحی‌و سیاسییەی کە ئێمە لەمێژە موبتەلاین پێی، سەرەتایەك بێـت بـۆ رزگـاربوون لەسـتەمکارییەك کـە ئێمـە تـەنیا قوربانیـەکی نـین بـەڵکو لەدروسـتکەرەکانی ئەوستەمکارییەین‌و ستەمکاری لەرۆحماندا مۆڵگـەی خسـتوەو نـاتوانین لـەدەرەوەی ستەمکاری هیچ سیستەمێکی دیکـە ببینـین یـا خـەون بـەهیچ سیسـتەمێکی دیکـەوە ببینین، بەو هیوایەی ئـەم بەرهەمـە سـەرەتای بیرکردنـەوە بێـت لـەرزگار بـوون لـەو بیمارییە.

**فاروق رەفیق**
**ئازاری دوو هەزارو سێ**
**کەنەدا**

# هونەری ستەمکاری؟

زینۆفۆن Xenophon ( 354ـــ430 پێش زاین) وەك فەیلەسوفو مێژوونوسو بیریارێکی سیاسی کۆمەڵێك بەرهەمی لەدوا بەجێ ماوە کە ئەمڕۆ لەکۆمەڵێك بەرگدا لەبەردەستماندان، لەوانە "بیرەوەرییەکان Memorabilia" و "ئیکۆنۆمیکۆس Oeconomicus" و "سیمپۆزیەم" و "عوزرخوایی سوکرات" و "پەروەردەی کوروش Cyropaedia" (لەدوو بەرگدا)و هیلینیکا "کاروباری یۆنانی" و ئانابەسس Anabasis و ئنجا دایەلۆگی تیرانیکۆس Tyrannicus یاخود هیرۆ Hiero.

تیرانیکۆس دایەلۆگێکی کورتە لەنێوان هیرۆ، ستەمکاری سیراکۆسو سایمۆندیسی شاعیردا سەبارەت بەستەمکاری کەتێیدا کۆمەڵێ راووبۆچوون شەنو کەو دەکرێن، کۆمەڵێ وێنە لەمەڕ ستەمکارو ژیانی ستەمکاری دەکەون، کۆمەڵێك رەهەندی ستەمکاری دەخرێنە روو. ستەمکاری کێشەی یۆنانیە کۆنەکان بوو، واتە شوێنی بیرکردنەوەیان بوو، هەر بۆیەشە ئەفلاتوون لەچەند دایەلۆگێکدا لەستەمکاری دەدوێ، ئەرستۆ بەهەمان شێوە، بەڵام ئێمە تێکستێکمان نییە راستەوخۆ بەناوی ستەمکارییەوە جگە لەئەم دایەلۆگەی زینۆفۆن، "تیرانیکۆس، واتە ستەمکار."

لەسەرەتاوە سەرنجی خوێنەران بۆ ئەو راستییە رادەکێشین کە تێگەیشتن لەم دایەلۆگە لەدەرەوەی بەرهەمەکانی دیکەی زینۆفۆن کارێکی ئاسان نییە، واتە ئایدیاڵترین حاڵەت ئاگاداربوونە لەنوسینەکانی دیکەی زینۆفۆن، یاخود لەباسکردنی "هیرۆ"دا گەڕانەوە بۆ هەندێك بەرهەمی دیکەی ئەو لەوانە بەلانی کەمەوە پەروەردەی کوروش (Cyropaedia). بەڵام بەهۆی نەبوونی ئەو بەرهەمانە بەهیچ زمانێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، تائەو شوێنەی ئێمە ئاگادارین جگە لەبەشێکی کەمی گەشتەکەی زینۆفۆن بەوڵاتی فارسدا لەژێر ناونیشانی "The Persian Expedition" ئەمە وادەکا کە خوێنەر سوودێکی ئەوتۆ نەبینێت. وێڕای ئەم سەرنجەش ئەم دایەلۆگە سەربەخۆیەو بێ ئاماژەکردنیش بە بەرهەمەکانی دیکەی زینۆفۆن خۆی وەك تێکستێك مەحکەمەو دەتوانین مامەڵەی لەتەکدا بکەینو بیخوێنینەوە. خاڵێکی تر ئەوەیە کە شارەزا بوون لەیۆنانی کۆنو بەتایبەت لەرووی سیاسیو مێژووییەوەمەرجی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لەو رەوتە (سیاقە)ی کە ئەم تێکستەی تێیدا لەدایك بوە. بەڵام ئێمە لێرەدا لەبەر مەسەلەیەکی فیکری بەپێویستمان نەزانی کە ئەو رەوتە مێژووییە باس بکەین، ئەویش لەبەر دژایەتی کردنمان بۆ فیکرو

مەنهەجی مێژوێتی (Historicism) کە وەك کەڵکەڵەیەك کۆمەڵێ گورزی لەفیکرو ترادسیۆنی مرۆڤایەتی داوە. گەر ئەو رەوتە مێژووییە باس بکەین کە ئێمە کۆمەڵێك سەرچاوەمان لەبەردەستدایەو بەئاسانی دەتوانین ئەوکارەبکەین، بەلاّم رەنگە ئەو ئینتباعە بدەین بەدەستەوە کە ئەم تێکستە مێژووییەو لەسەردەمێکی تایبەتیدا هاتۆتە ئاراوەو باس لەسەردەمێکی تایبەتی دەکا، ئەمە لەکاتێکدا بەهەڵبژاردنی ئەم تێکستەو بەقسەکردنمان لەسەری دەمانەوێت کێشەیەکی یونیڤێر سالْ (گەردوونی) بھوروژێنین‌و هەژاری فیکری سیاسی ئەمڕۆکە دەربخەین‌و بڵێین چۆن تێکستێکی کۆن کە لەسەر ستەمکارییە سنورەکانی مێژوو دەبڕێت‌و دەیەها وانەی پێیە بۆ ئێمە. ئێمە دەمانەوێت بەم هەڵبژاردنەو تێکستەکانی دیکەی نێو ئەم کتێبە هەژاری‌و کلۆڵی زانستی سیاسی هاوچەرخ دیاری بکەین کە نایەوێت لەستەمکاری‌و بەتایبەت لەستەمکاری هاوچەرخ قسەبکا ئەمەش لەبەر زالْ بوونی دوو کەڵکەڵە، پۆزە تیڤیزم‌و مێژووێتی، لەلایەکی دیکەوە ئەم دایەلۆگە دەبێت وەك تێکستێکی سەربەخۆ بخوێندرێتەوە لەدەرەوەی ئەو رەوتە مێژووییە. لەبەردووهۆ ئێمە دەقی ئەم دایەلۆگەمان لەزمانی ئینگلیزییەوە کردە کوردی، یەکەم: لەبەر گرنگی دایەلۆگەکە کە راستەوخۆ دەربارەی ستەمکارییە، دووهەم: لەبەرئەوەی کە قسەکردنەکانی ئێمە لەسەر ئەو دایەلۆگە سیخناخ نەبێت بەکۆتەیشن (ئیقتباس)، وەرگرتنی نمونە لەو تێکستەوە، واتە ناچار نەبین بۆ هەرخاڵێك، بۆ شیکردنەوەی هەر بیرۆکەیەك نموونەیەك بهێنینەوە. لەجیاتی ئەمە ئێمە تێکستەکە بەکوردی دەخەینە بەردەم خوێنەران‌و ئەوساکە ئێمە ناچارنابین راڤەکردنەکەمان سیخناخ بکەین بەنمونەی ئەو تێکستە، بەڵکو خوێنەران دەتوانن زوو زوو بۆ تێکستەکە بگەڕێنەوە. ئەوەش بڵێین کە ئەم تێکستە قسەکردنێکی زۆر هەڵدەگرێ‌و ئێمە لێرەدا تەنیا راگوزاری قسەی لەسەر دەکەین‌و ئەو مافە بەخۆمان دەدەین کە لەبۆنەی دیکەدا بۆ ئەم تێکستە بگەڕێینەوە بەتایبەت کێشەی حیکمەت‌و ستەمکاری، کێشەی فەیلەسوف‌و ستەمکار هەڵدەگرین بۆ بۆنەکانی دیکە. ئەمەش دەقی دایەلۆگەکە.

## هیرۆ یا تیرانیكۆس Tyrannicus

## زینۆفۆن[١]

## (1)

(1) سایمۆندیسی شاعیر جارێك لەجاران هات بۆلای هیرۆی ستەمكار. دوای ئەوەی هەردووكیان حەوانەوە، سایمۆندیس گوتی "هیرۆ ئامادەییت تێدایە ئەو خاڵەم بۆ روون بكەیتەوە كەچ شتێك هەیە تۆ لەمن باشتر بیزانی؟"

هیرۆ گوتی: "جۆری ئەوشتانە دەبێت چی بن كە رەنگە من بیانزانم چاكتر لەپیاوێكی حەكیمی وەكو تۆ؟"

(2) سایمۆندیس گوتی: "بەش بەحاڵی خۆم دەزانم كە تۆ كەسێكی تایبەت (private)[٢] بوویتو ئێستاش ستەمكار، رێی تێدەچێ، چونكی هەردوو حاڵەتەكەت ئەزموون كردوە، كە ئەوە لەمن باشتر بزانی كە ژیانی ستەمكاریو ژیانی تایبەتی جیاوازن چ لەرووی چێژەوەو چ لەرووی ئازارەوە."

(3) هیرۆ گوتی: "باشە بۆچی ئەوشتانەی ژیانی تایبەتیم وەبیرناهێنیتەوە لەبەرئەوەی لەحاڵی حازردا بەلانی كەمەوە تۆ كەسێكی تایبەتیتو سەربەخۆ؟ لەم رێگەیەوە لەو باوەڕەدام بتوانم بەچاكی جیاوازییەكانی ئەو دووجۆرە ژیانەت. نیشان بدەم"

(4) سایمۆندیس بەم شێوەیە دووا: "زۆرچاكە هیرۆ، لەبەر رۆشنایی سەرنجدانەكانمدا لەرابووردوودا دەتوانم بڵێم كە كەسانی تایبەت هەست بەچێژ یا ئازار دەكەن لەبەرانبەر بینراوەكاندا لەرێگای چاوەوە، لەبەردەم شتە بیستراوەكانیشدا لەرێگای گوێوە،بۆندارەكان لەرێگای لووتەوە، خواردنو خواردنەوە لەرێگای دەمەوە، ئینجا سێكس، لەڕێگای دیارە هەموو دەزانین لەكوێوە.

(5) هەرچی پەیوەندی بەوشتەوە هەیە كە ساردە یاگەرم، رەق یا نەرم، سووكە یا سەنگین، كاتێك كەجیایان دەكەینەوە من وای دەبینم كە لەرێگای هەموو جەستەمانەوە هەستیان پێدەكەین، چ خۆشحاڵمان بكەن یاخود ئازارمان بدەن. هەروەها وا بۆمن بەدیار دەكەوێ كە ئێمە خۆشحاڵ بین یا ئازار بچێژین بەهۆی ئەو شتەوە كە چاكە یاخراپە، ئەمە هەندێك جار تەنیا لەڕێگای رۆحەوە دەبێت، هەندێ جاری دی لەڕێگای رۆحو جەستەوە.

(6) "ئەوەی كە نوستن خۆی جۆرێكە لەخۆشی، دەتوانم بڵێم كە من لەمە بەئاگام بەڵام لەڕێگای چییەو لەچ كاتێكداو چۆن، ئەمەیان تاڕادەیەك لێی بێ ئاگام".

"هەروەها رەنگە شوێنی سەر سوڕمانیش نەبێت کە شتەکان لەوکاتەدا کە بێدارین زیاتر وێنەیەکی ئاشکرامان دەدەنێ وەك لەحاڵەتی خەوتندا".

(7) هیرۆ لەبەرانبەر ئەوشتانەی گووتران ئاوها وەلامی دایەوە: "سایمۆندیس، بەش بەحالّی خۆم ناتوانم بلّێم کە چۆن ستەمکار شت، جا هەر شتێك بێت، دەبینێ لەدەرەوەی ئەو خالانەی کە تۆ ئاماژدەت بۆکردن. تائێرە بەلانی کەمەوە من نازانم کە چۆن ژیانی ستەمکارانە جیاوازە لەژیانی تایبەتی جا لەهەر روویەکەوە بێت".

(8) سایمۆندیس گوتی: "بەلام بەم شێوەیە ئەو دوو ژیانە جیاوازن، چێژ لای ستەمکار چەندین جار رێژەی زیاد دەبێت لەرێگای هەریەك لەو هۆکارانەوەی کە ئاماژدەمان پێدان، هەروەها ستەمکار خاوەنی ئەو شتانەیە کە کەمتر ئازار بەخشن".

"ئەمە بەهیچ شێوەیەك وانییە سایمۆندیس" هیرۆ گوتی: ئەوە باش بزانە کەستەمکارەکان چێژو خۆشیان کەمتر هەیە وەك لەوپیاوانەی کە ژیانی تایبەتی خۆیان دەژین‌و لەسەر هۆکاری متەوازع دەژین،و هەروەها ستەمکارەکان زۆرترین‌و گەورەترین ئازارو دەردەسەریان هەیە".

(9) سایمۆندیس لەوەلامدا گوتی: "ئەوەی دەیلّێیت بەراستی سەرسورهێنەرە" لەبەرئەوەی گەر ئەمە ئاوها بێت ئەی بۆچی زۆربە ئارەزوو دەکەن ببنە ستەمکار، هەروەها زۆربەی ئەوانەی ناوبانگیان دەرکردوە وەك کەسانی بەتوانا هەمان ئارەزوویان هەیە؟ هەروەها بۆچی هەر هەموو ئیرەیی بەستەمکارەکان دەبەن؟"

(10) هیرۆ گوتی: بەزیۆس سوێندبێ، لەبەرئەوەی تەنیا مەزەنە دەربارەی مەسەلەکە دەکەن، هەرچەندە بێ ئەزموونن لەڕووی کردارەوە دەربارەی هەردوو جۆری ژیانەکە. من هەولّ دەدەم مەسەلەکەت بۆ روون بکەمەوەو راستی مەسەلەکەت پێ فێربکەم، لەبینینەوە دەست پێدەکەم گەر لەبیرم مابێت تۆش قسەکانت لەوێوە دەست پێکرد.

(11) "هەر لەخالّی سەرەتاوە، کاتێك لێی رادەمێنم، وای دەبینم کە ستەمکارەکان هەرچی پەیوەندی بەشتە جوان‌و شاکارەکانەوە هەیە کەسەرنجمان بۆلای خۆیان رادەکێشن لەرێگای بینینەوە، ستەمکارەکان لەوەزعیەتێکدان کە زەرەریانە. بۆ نمونە، شتی جیاوازی زۆر هەن لەولاتە جۆراو جۆرەکاندا کەشایانی بینینن، کەسانی تایبەت دەچن بۆ هەریەك لەو شوێنانەو هەرشارێك کە دلّیان بخوازێ بۆ بینینی ئەو شتە جوان‌و شاکارانە. هەروەها دەچن بۆ ڤیستڤالّە باوەکان کە لەوێدا ئەو شتانە نیشان دەدرێن کە لەلایەن هەموانەوە بەرز دەنرخێندرێن.

(12) بەڵام ستەمكارەكان كەمترین شانسیان هەیە بۆ بینینی ئەوشتانە لەبەرئەوەی لەرووی ئاسایشەوە گونجاو نییە بۆ ئەوان بچن بۆ ئەوشوێنانەی كە تێیدا ئەمان (ستەمكارەكان)، بەهێزتر نابن لەهەموو ئەوانی دیكەی كە لەوێ ئامادەن. هەروەها لەماڵیشەوە ئاسایشێكی ئەوتۆیان دابین نەكردووە كە بتوانن بەدڵنیاییەوە بڕۆن بۆ دەرەوە موڵكو ماڵیان بەكەسانی دەوروبەر بسپێرن. چونكی ئەو ترسە لەئارادا هەیە كە لەدەستەڵات بخردرێنو بێ دەستەڵات بمێننەوەو نەتوانن تۆڵە لەو كەسانە بكەنەوە كە ناعەدالەتیان نواندوە".

(13) "رەنگە بڵێیت بەڵام هەموو ئەو دیمەنانە، ئەوشتانە دەهێنرێنە بەردەمیان هەرچەندە لەماڵیشەوە نەجوڵێن". بەزیۆس سوێندبێ، سایمۆندیس، ئەمەوایە، بەڵام ژمارەیەكی زۆر كەم لەنمونەیەكی ئێجگار زۆر ئنجا ئەمانە بەهۆی سروشتیانەوە بەنرخێكی زۆرگران بەستەمكار دەفرۆشرێن بەشێوەیەك ئەو كەسانەی كە ئەو شتانە دەخەنە روو چاوەڕوانی ئەوە دەكەن كە لە چركەساتێكدا هێندە پارە لەستەمكار وەربگرن چەندین بار زیاتر لەوەی كە لەئینسانەكانی دی وەریدەگرن لەهەموو ژیانیاندا".

(14) ئنجا سایمۆندیس گوتی: "گەر هەرچی پەیوەندی بە دیمەنە جوانەكانەوە هەبێت ئاوها لەبارێكی خراپدا بیت، بەلانی كەمەوە لەرووی بیستنەوە لەبارێكی چاكتردا خۆت دەبینیتەوە، لەبەرئەوەی هیچ كات تۆبێ بەش نیت لەپێداهەڵدانو ستایشكردن كە چ دەنگێكی شیرینە. ئەوانەی لەمەجلیسی تۆدا ئامادە دەبن ستایشی ئەو شتانە دەكەن كەدەیانڵێیتو بەكردەوەكانتا هەڵدەدەن. لەبەرانبەریدا تۆ دووریت لەمەودای سوكایەتی پێكردن، قورسترینو ناخۆشترین شت بۆ بیستن، چونكی هیچ كەس ئامادەنییە كە بەرەو رووی ستەمكار خودی ستەمكار تاوانبار بكا".

(15) ئنجا هیرۆ گوتی: "كامە چێژ؟ تۆ لەوباوەڕەدایت كە ستەمكار لەو كەسانەوە كە هیچ شتێكی خراپ ناڵێن لەبەردەمیدا چی دەست دەكەوێت لەكاتێكدا ئەو دەزانێ كە هەر بیركردنەوەیەكی ئەو پیاوە بێدەنگانە خۆی لەخۆیدا بۆ خودی ستەمكار خراپەو شوێنی گومان؟ یاخود، چ چێژێك، لەو باوەڕەدایت ئەو بەدەستی بهێنێ لەوانەوە كەستایشی دەكەن لەكاتێكدا ئەو دەزانێ كە ئەوان بۆیە ستایشی دەكەن تەنیا لەبەر خاتری تەمەلوق كردن؟"

(16) ئنجا سایمۆندیس گوتی: "بۆخاتری زیۆس، هیرۆ ئەم هەقەت پێدەدەم، شیرین ترین ستایش لەوكەسانەوە دێت كە ئازادن بەپلەیەكی زۆر. بەڵام ببینە، تۆ

ناتوانی هیچ کەس رازی بکەیت بەوەی کە تۆ چێـژی زیـاتر نـابینیت لەوشـتانەی کـە ووزەو توانا بەئێمەی ئینسان دەدەن."

(17) من دەزانم سایمۆندیس کەبەلانی کەمەوە زۆربـە لـەو بـاوەڕەدان کـە ئێمـەی ستەمکار دەخۆیین‌و دەخۆینەوە بەچێژو زەوقێکی زۆرەوە زیاتر لەکەسـانی تایبـەت لەودیدەوە کە بەشداربوونیان لـەژەمێکدا لەسـەر سفرەی ئێمـە چێـژی زۆرتـرە وەك لـەخواردنی هـەر سفرەیەکی دی، ئـاخر ئـەو شتەی کـە لـەودیو عـادی بوونەوەیـە چێژێکی نائاسایی دەبەخشیٚ.

(18) هـەر لەبـەر ئـەم هۆیەشـە کـە هـەموو ئینسـانەکان جگـە لەسـتەمکارەکان بەخۆشییەکی زۆرەوە چاوەڕوانی هاتنی کـاتی ئاهـەنگ‌و جەژنـەکان دەکـەن. مـێزی ستەمکارەکان هەمیشە بەو شێوازە زۆرە دەڕازێنرێتەوە کە هەلی زیـادکردنی چێـژوو خۆشـی نـامێنێت بـۆ ستەمکارەکان لـەکاتی ئاهەنگـەکاندا. لەبەرئــەوە لــەم روەوە بارودۆخی ستەمکارەکان خراپ ترە لەکەسانی تایبەت".

(19) دواجـار گوتـی: "مـن بـاش دەزانم کـەتۆش لـەم روەوە ئـەزمونت هەیـە، مەبەستم ئەوەیە بلێم کەسێك تـا زیـاتر خزمـەتی بکردرێـت بەڕێژەیـەکی ئـەوتۆ کەزیاتربێت لەو ڕێژەیەی پێویستە، زیاتر هەست بەتێربوون دەکـاو کـەمتر ئیشـتیای خواردنـی دەبێـت. هـەروەها سـەبارەت بـەماوەی چێژیش ئەوکەسـەی کـە کۆمـەلێ خواردنــی زۆری بــۆ دروســت بکــردریٚ لــەوەزعێکی خراپتردایــە وەك لەوکەســـەی بەتەوازعەوە دەژی."

(20) سـایمۆندیس گوتـی: "بـەلام بۆخـاتری زیـۆس، هـەتاکو ئـەو کاتـەی کـە دلٚ ئارەزوودەکا، ئەو کەسانەی لەسەر خواردنی دەولەمـەند دەژیـن چێـژی زۆر دەبینـن وەك لەوانەی کە لەسەر ژەمی سادەو هەرزان دەژین."

(21) هیرۆ گوتـی: "سـایمۆندیس، کەواتـە تـۆ لـەو بـاوەڕەدایت ئـەو کەسـەی کـە زۆرترین چێژ ببینیٚ لەهەر کردەوەیەك ئەوا عیشقێکی زۆریشی دەبێت بۆ ئەوشتە؟".

"بەدلنیاییەوە" سایمۆندیس گوتی:

"باشە، تـۆ وای دەبینیـت کەسـتەمکارەکان بەتاسـەو خۆشییەکی زۆرەوە بچنـە سەر سفرەکانیان زیاتر لەپیاوانی تایبەت؟"

سایمۆندیس گوتی: "نەء بۆ خاتری زیـۆس مـن هـەرگیز وای نـابینم، بـەلام وا بـۆ زۆربەی خەلك دەردەکەویٚ."

(22) هیرۆ گوتی: "بەڕای تۆ هۆی چییە ئەو هەموو ژەمـە پێشکـەش بەسـتەمکار دەکریٚ، تیژ، تالٚ، سوێر، ترشاو، نمونەکانی دیکەی وەکو ئەمانە؟".

سایمۆندیس گوتی: "بەدلنیاییەوە من زۆر بەناسروشتیان دەزانم".

(23) تۆ لەو باوەڕەدایت کە ئەم خواردنانە شتێك بن جگە لەبابەتی ئارەزوو بۆ ڕۆحە ناسك یانەخۆشەکان؟ "لەبەرئەوەی بەش بەحاڵی خۆم دەزانم، ڕەنگە تۆش بزانی، کە ئەو کەسەی بەتاسەوە نان دەخوا هیچ پێویستی بەم بیٚ مانایيە نییە".

(24) سایمۆندیس گوتی: "باشە سەبارەت بەو بۆن و بەرام و ڕۆنە گرانبەهایانەی کە لەخۆتیان دەدەیت، لەو باوەڕەدام ئەوانەی لەدەورتن لە تۆ زیاتر چێژیان لیٚ دەبینن، هەروەك چۆن پیاوێك خواردنێکی بۆن ناخۆشی خواردبێت کەسانی نزیك لێوەی زیاتر هەستی پێدەکەن وەك لەخۆی".

(25) هیرۆ گوتی: "لەمەزیاتر، هەرچی پەیوەندی بەخواردنەوە هەبێت، ئەو کەسەی هەموو جۆرە خواردنێکی هەبێت بەتاسەوە لەهیچیان ناڕوانیٚ. بەڵام کەسێك کە لەشتێکی کەم بێت لەکاتی بینینی لەو شتەدا بەتاسەوە خۆی لەوشتە تێردەکا."

(26) سایمۆندیس گوتی: "ڕەنگە چێژوەرگرتن لەسێکس بەپلەی یەکەم بێت بۆ ئارەزوو خواستن بۆ ستەمکاری، ئارەزووکردنی بوون بەستەمکار، چونکی تۆ دەتوانی لەگەڵ کیٚ بتەویٚ، جوانترین کەس، بخەوی".

(27) هیرۆ گوتی: "ئێستا تۆ ئاماژدەت بەشتێکدا کە باش ئەوەبزانە ئێمەی ستەمکار لەم ڕووەوە حاڵمان خراپترە لەکەسانی تایبەت. دەربارەی ژن هێنان، سەرەتا ژن هێنانێك هەیە لەتەك کەسێکی دەوڵەمەنترو بەدەستەڵات تر کە من وای دەبینم نەجیبترین جۆری ژنخواستنە کە چێژ ببەخشێتە بوك و زاوا. دووهەم، جۆرێکی دیکەی ژنخواستن هەیە کە لەنێوان دووکەسی یەکساندا ساز دەدریٚ. بەڵام زەماوەندکرن لەتەك ئەو کەسانەدا کە لەپلەی خوارەوەن بەزەماوەندێکی بیٚ کەڵك و بیٚ ڕێز حیساب دەکریٚ".

(28) کەواتە، مەگەر لەوحاڵەتەدا نەبێت کەستەمکار لەتەك ئافرەتێکی بیانیدا زەماوەندبکا، دەنا ناچار دەبێت لەتەك ئافرەتێکی ئاست نزمدا زەماوەندبکا، بەواتایەکی دی ئەوشتەی کە ڕازی دەکا بەئاسانی بەدەستی ناگات. لەمەزیاتر، بەتەنگەوە هاتن و سەرنج ڕاکێشیانی ئافرەتێکی حەکیم زۆرتر چێژ بەخشە وەك لەهی ئافرەتی کۆیلە، ئەمەی دواییان هیچ شوێنی ڕەزامەندی نییە، نەك ئەوەندە بەڵکو بۆنەی ئەو تۆ زیاتر دەڕەخسیٚ بۆ تووڕەبوون و ئازارو دەردەسەری لەکاتی پشت گویٚ خستنی شتێکدا.

(29) بەڵام هەرچی پەیوەندی بە سێکسەوە هەبێت لەتەك کوڕە جوانەکاندا، ستەمکار لێرەشدا زەرەریەتی، هەروەك چۆن لەتەك ئافرەتاندا بۆ مندال هێنانەدنیاوە. وابزانم هەموو دەزانین کە سێکسیٚ چێژ زۆر دەبەخشیٚ گەر پیٚ بەپیٚ لەتەکیدا عەشق هەبێت.

(30) بەڵام لەستەمکاردا عەشق کەمتر سەرهەڵدەدا، کەمتر خۆی نیشان دەدا، چونکی عەشق قسە لەچێژێ ناکا کە لەبەردەستدابێت، بەڵکو چێژی عەشق لەو شتەدایە کەشوێنی ئاوا تخواستنە. هەروەك چۆن پیاوێك کە ئەزموونی تینوێتی نەکردبێت چێژ لەخواردنەوە نابینێت، ئاوهاش پیاوێکی بێ ئەزموونی عەشق بێ بەشە لەئەزموونی چێشتنی شیرینی سێکس".

(31) سایمۆندیس بەمە زۆر پێکەنیی و گوتی: "هیرۆ مەبەستت چییە؟ ئایا ئەوە ئینکار دەکەیت کە عەشقی کوڕوکاڵ مەسەلەیەکی سروشتییە لەستەمکاردا؟ گەر وایە چۆن دەتوانیت (دەیلۆخیۆس)ت خۆش بوێ، ئەوەی کە دەڵێن جوانترین کوڕە؟.

(32) بەزیۆس سوێندبێت، سایمۆندیس، ئەمە لەبەر ئەوەنییە کە من ئارەزووی ئەو شتە دەکەم کەلە ئەودا بوونی هەیە، بەڵکو بۆ بردنەوەو بەدەست هێنانی ئەو شتەیە کە بەکەڵکی ستەمکار نایەت."

(33) لەبەرئەوەی من (دەیلۆخیۆس)م خۆش دەوێ بۆ ئەو شتەی کە سروشت ئینسان ناچار دەکا لەکەسێکدا بخوازێ کە باشترینە، ئەمەش ئەو شتەیە کە من دەبێت بەدەستی بهێنم، بەڵام من بەقووڵی ئارەزووی بەدەست هێنانی دەکەم هاوڕێ لەتەك عەشقدا، لەتەك کەسێکدا کەڕازی بێت هەروەها کەمتر ئارەزووی ئەوە دەکەم کە بەتۆپزی لێی بستێنم وەك لەوەی خۆم ئەزیەت بدەم.

(34) من خۆم لەو باوەڕەدام کە سەندن بەزۆری لەدوژمنێك کەڕازی نییە خۆشترین شتە، بەڵام خزمەتی ئەوکەسانەی کەخۆیان دەخوازن لای من خۆشترین شتە.

(35) بۆ نمونە، غەمزیەکی ئەو کەسەی کە وەڵامی عەشق دەداتەوە زۆر ئارامی بەخشە، پرسیارەکان چێژ بەخشن، وەڵامەکانیش هەروەها، بەڵام شەڕکردن و ململانێ زۆرترین ئارەزوی سێکسی دەهوروژێنێ.

(36) بەدڵنیاییەوە وای دەبینم کە چێژێك لەکەسێکەوە کە خۆی رازی نییە زیاتر لەکرداری قۆڵ بڕین دەچێ وەك لەسێکس. هەرچەندە بێزاری کەسی قۆڵ بڕاو جۆرێك چێژ بەکەسی قۆڵ بڕ دەبەخشێ، لەگەڵ ئەمەشدا چێژوەرگرتن لە ئازاری ئەوکەسەی کە خۆشت دەوێ، ماچی بکەیت و شوێنی بوغزی ئەو بیت، دەستی بۆ بەریت و شوێنی بێز هاتنەوەی بیت، ئایا بەڕاستی ئەمە ئیدی شوێنی بێزاری و بەزەیی هاتنەوە نییە؟.

(37) کەسێکی تایبەت کاتێك کە مەعشوقەکەی خزمەتێکی پێشکەش بکا تێدەگاو وەکو نیشانەی عەشق سەیری دەکا چونکی ئەو دەزانێ کە مەعشوقەکەی لەژێر هیچ

پاڵەپەستۆیەکدا هیچ خزمەتێك ناکا. بەڵام هەرگیز شیاو نییە بۆ ستەمکار کەبڕوا بەو کەسە بکا کە خۆشی دەوێت.

(38) چونکی ئێمە دەزانین ئەو کەسانەی بەهۆی ترسەوە هەوڵ دەدەن خزمەتێك بکەن، بەهەموو شێوازێك هەوڵ دەدەن وا خۆیان نیشان بدەن وەکو هاوڕێ. لەمەزیاتر لەبیرمان بێت کەپیلان دژ بەستەمکاران لەهیچ کەسێکەوەو لەلایەن هیچ کەسێکەوە داناڕێژرێن جگە لەو کەسانەی کە ئیدعا دەکەن کە گوایە ئەمانیان (ستەمکارەکان) خۆشی دەوێ".

# (2)

(1) ئنجا سایمۆندیس سەبارەت بەقسەکانی هیرۆ گوتی: "ئەو هەموو لەبەرژەوەندی نەبوونانە کە ئاماژدەت پێدان بەلای منەوە زۆر سادەن، چونکی من دەبینم ئەو کەسانەی کە بەپیاوی کامڵ ناوبانگیان دەرکردوە، بەدەستی خۆیان خۆیان خستۆتە حاڵەتێکەوە کە لەرووی خواردن و خواردنەوەو شتی ناسکەوە زۆر لەبەرژەوەندیان نەبێت، بگرە لەسێکسیش دوورەپەرێزیان کردوە.

(2) بەڵام ئێوەی ستەمکاران لەم شتانەی خوارەوەدا لەکەسانی تایبەتیتان تێپەڕاندوە. ئێوە پرۆژەی گەورە دادەهێنن و بەجوانی جێ بەجێیان دەکەن، ئێوە رێژەیەکی زۆر ئەوشتانەتان هەیە کە پێویست نین، ئەو ئەسپانەتان هەن کە بێ وێنەن، چەکی ئەوتۆ کە ناوازەن، خشڵی نایاب بۆ ژنەکانتان، خانوە هەرە قەشەنگەکان، ئەو خانوانەی کە رازێنراونەتەوە بەشت و مەکی بەهادار، لەمەزیاتر، ئەو خزمەتکارانەی ئێوە هەتانن هەم لەژمارەدا زۆرن و هەم لەمەعریفەدا باشترینن، ئنجا ئێوە ئەوکەسانەن کە دەتوانن. هەم بەدوژمنەکانتان زەرەرو زیان بگەیەنن هەم سوود بەهاوڕێکانتان ببەخشن.

(3) بەرانبەر بەمە هیرۆ گوتی: "سایمۆندیس من هیچ سەرسام نیم لەوەی کەزۆرینەی ئینسانەکان بەستەمکاری هەڵدەخەڵەتێن. چونکی من لەوباوەڕەدام کە حەشامات (Crowd) ئەو سەرنجەیان لادروست دەبێت کە هەندێك بەختەوەرن و هەندێکی دی کلۆڵ ئەمەش لەرێگای بینینەوە.

(4) ستەمکاری بەئاشکرا ئەو موڵك و ماڵانە دەخاتە روو کە بەهادارن. بەڵام ئەوشتەی کەڕەق و شوێنی زەبرو زۆنگە لەرۆحی ستەمکاردا پەنهان دەهێڵێتەوە، لەوشوێنەدا کە بەختیاری و کلۆڵی ئینسانی تێیدا خەزن کراوە.

(5) ئەوەی کە ئەمە بەسەر زۆربەدا تێدەپەڕێ، وەك گوتم شوێنی سەرسوڕمان نییە. بەڵام ئەوەی کە تۆش لەمەبێ ئاگایت، تۆیەك کە ناوبانگت دەرکردوە بەوەی بەچاکی ئەو کێشانە دەبینیت کە شوێنی ئیشکالیەتن لەرێگای عەقڵتەوە نەك لەرێگای چاوانتەوە، ئا ئەمە بۆ من شوێنی سەرسوڕمانە.

(6) بەڵام، سایمۆندیس، من لەرێگای ئەزمونەوە دەزانم و پێت دەڵێم کە ستەمکار کەمترین بەشی شتەچاکەکانی هەیەو خاوەنی بەشێکی زۆری شتەخراپەکانیشە.

(7) سەیری ئەم نمونەیە بکە: گەر ئاشتی سەیربکردرێ وەك ئەوەی کەباشترین چاکەیە بۆ ئینسانەکان، ئەوا ستەمکارەکان کەمترین بەشیان پێ دەبڕێ لەئاشتی،

گەر جەنگیش گەورەترین خراپە بێت ئەوا ستەمکارەکان زۆرترین بەشیان هەیە لەم خراپەیەدا.

(8) چونکی، شیاوە بۆ کەسانی تایبەت، مەگەر لەوحاڵەتەدا نەبێت کەشارەکەیان سەرگەرمی جەنگ بێت، دەنا دەتوانن بۆ هەرکوێیەك دڵیان دەخوازێ گەشت بکەن بێ ئەوەی بترسن لەوەی کە کەسێك ترۆریان دەکا. بەڵام ستەمکاران، هەر هەموویان، ئاوها سەیری هەموو شوێنێك دەکەن وەك ئەوەی سەرزەمینێکی پڕ لەکەڵکەڵەی دوژمن کارانە بێت. خۆیان وا بیردەکەنەوە کە زۆر پێویستە بەحاڵەتی پڕ چەك بوونەوە بڕۆنو هەمیشەش چواردەوریان بەپاسەوانی تایبەتی بگیردرێت.

(9) لەمەزیاتر، گەر کەسانی تایبەت بەهۆی کارێکەوە پێ بنێتە خاکی دوژمنەوە ئەوا لەو باوەڕەدا دەبن کە سەلامەت دەبن بەلانی کەمەوە دوای ئەوەی کە دەگەڕێنەوە ماڵەوە. بەڵام ستەمکاران دزانن ئەوکاتەی دەگەنەوە شاری خۆیان ئا لەوێدا زیاتر لەهەر شوێنێکی دی خۆیان لەنێو دوژمنەکانیاندا دەبیننەوە.

(10) دووبارە، گەر ئەوانەی بەهێزترن پەلاماری شاریاندا،و ئەوانەی کە لەدەرەوەی دیوارەکانی قەڵان، لاوازنو لەوباوەڕەدان کە لەمەترسیدان، هەر هەموو هەست بە ئەمنو ئەمان دەکەن بەلانی کەمەوە کاتێك خۆیان دەگەیەننەوە ناو قەڵاکە. بەڵام ستەمکار تەنانەت لەناو ماڵی خۆشیدا بەدوور نییە لەمەترسیو لەئاسایشدا نییە، نەك ئەوەندە بەڵکو بگرە لەماڵی خۆیدایە کە ئەو لەوباوەڕەدایە دەبێت زیاتر لەهەر شوێنێك زۆرتر ووریا بێت.

(11) زیاتر لەمە، بۆ کەسانی تایبەت، رزگار بوون لەجەنگ لەڕێگای پەیمانەکانو ئاشتییەوە فەراهەم دەکرێت. کەچی لای ستەمکاران هەرگیز ئاشتی لەتەك رەعیەتی ستەمکاریدا مەیسەر نابێت، هەروەها ستەمکار ناتوانێ باوەڕ بەرێککەوتنو پەیمان بهێنێتو پشتی لێ بکاتەوە.

(12) "دیارە ئەو جەنگانە هەن کەشارەکان بەرپایان دەکەن، یا جەنگێ کە ستەمکاران بەرپای دەکەن دژ بەوانەی بوونەتە قوربانی زۆرو ستەم. لەم جەنگانەدا، هەرچی تاڵیو سەختیەك کە ئینسان دەیچێژێو لەشاردا پێیدا تێدەپەڕێ، بەهەمان شێوەش ستەمکاریش پێیدا تێدەپەڕێ.

(13) هەردوو لا دەبێت پڕچەك بن، هۆشیاربن، ریسك بکەن، ئنجا لێیان درا دیارە ئەزیەت دەخۆن، هەریەکە لەم جەنگانەدا بەشی خۆی ئازار دەچێژێ.

(14) تا ئێرە، جەنگی هەردوولا وەك یەکن. بەڵام هەرچی پەیوەندی بەو چێژو خۆشییەوە هەبێت وەك بەرئەنجامی شەڕکردن کە کەسانی ناو شار لێی بەهرەمەند

دەبن لە جەنگ دژ بەشارەکانی دیکە، ئەوا ستەمکاران لەم چێژو خۆشیەش بێ بەشن.

(15) بەدڵنیاییەوە ئەو کاتەی شارەکان نەیارەکانیان لەشەڕدا دەبەزێنن، ئاسان نییە تەعبیرکردن لەوچێژو خۆشییە کە کەسەکان بەدەستی دەهێنن لەبەرئەنجامی شکاندنی دوژمن دا، لەراونانی دوژمندا، چەندە خۆشی دەبینن لەکوشتنی دوژمنەکانیاندا، چەندە بەکردەوەکان شاگەشکە دەبن، چەندە ناوو ناوبانگ بۆخۆیان بەدەست دەهێنن،و چۆن بەختەوەریەکی ئەو تۆ بەدەست دەهێنن لەو قەناعەتەوە کە شتێکیان بۆ شارەکەیان زیادکردوە.

(16) هەریەکە ئیدعای ئەوەدەکا کە لەپلانەکەدا بەشداربوەوەو زۆرترینی کوشتوە، زەحمەتیش نییە کە ئەو راستییە نەبینرێ چۆن زیادەڕۆیی دەکەن‌و پێوەی دەنێن، ئیدعاکردنی ئەوەی کەهێندەیان کوشتوە، لەراستیدا زیاتر لەوەی کەمردوون. ئەوشتە نەجیبانەیە لای ئەوان دەبێتەمایەی سەرکەوتنێکی گەورە.

(17) بەڵام کاتێك کە ستەمکار گومان لەهەندێك کەس بکا لەوەی داوبچنن دژ بەئەو،و بەفیعلی وا سەیربکا کە خەریکی پیلانێکی لەو جۆرەن، ئەوا لەناویان دەبا، ئەو دەزانێ کە هیچ شتێك بۆشار زیادناکا، دەزانێ، بێ گومان، کە فەرمانڕەوایەتی تەنیا بەسەر ژمارەیەکی کەمدا دەکا، لێرەوە ناتوانێ دڵخۆش بێت‌و هیچ فەخرێك لەکرداریدا نابینێتەوە، بەڵکو هەتا دەتوانێ لەوشتەی کە رووی داوە کەم دەکاتەوەو لەکاتێکدا ئەمە دەکا، عوزر دەهێنێتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە وەك ئەوەی کە هیچ ناعەدالەتیەکی نەنواندبێ. لێرەوە تەنانەت ئەو شتەی کردوویەتی لای خۆشی کارێکی جوامێرانە نییە. هەروەها لەکاتێکدا ئەوانەی کە ئەم لێیان دەترسا دەمرن، لەم حاڵەتەشدا ئەو ئازاتر نییە بەڵکو لەجاران زیاتر حەزەردەکا. کەواتە ستەمکار هەموو ژیانی لەشەڕێکدا خەرجدەکا کە من ئێستا بۆت باس دەکەم‌و نیشانتی دەدەم.

# (3)

(1) ئێستا وەرەو مەسەلەی هاوڕێیەتی لەبەرچاوبگرە، چۆن ستەمکاران بەشداری تێدادەکەن. جارێ باسەرنج بدەینە ئەوەی ئایا هاوڕێیەتی مەزنترین چاکەیە بۆ ئینسانەکان.

(2) دیارە مەسەلەکە لای کەسێك کە خۆشدەویسترێ لەلایەن کەسێکی دیکەوە ئەوا ئەوکەسەی خۆشی دەوێ بەئامادەبوونیو بینینی ئەو هەمیشە خۆشحاڵە، بەخۆشییەوە سوودی پێدەگەیەنێ، تاسەی دەکا گەر ئامادەنەبوو (لەوێ نەبوو)، بەخێرهاتنەوەی دەکا لەکاتی گەڕانەوەیدا، چاکەکانی لەتەکدا بەش دەکا، بەهانایەوە دەچێ گەر بینینی رووبەڕوی گیروگفت بۆتەوە.

(3) لەمەزیاتر، تەنانەت ئەوە بەسەر شارەکاندا تێنەپەڕیوە کە ئەو راستییە نەبینن کە هاوڕێیەتی مەزنترین چاکەیەو شوێنی خۆشی هەموو ئینسانەکانە. بەهەرحاڵ، زۆرێك لەشارەکان ئەو یاسایەیان داڕشتوە کەتەنیا زیناکەران بکوژدرێن بێ لێپرسینەوە، لەبەر ئەم هۆیە، لەبەر ئەوەی لەوباوەڕەدان کەزیناکەران تێکدەرانی دۆستایەتی نێوان ئافرەتانو مێردەکانیانن. چونکی هەرکاتێك ئافرەتێك بەهۆی حاڵەتێکی تایبەتەوە ملی نا بۆ پەیوەندیەکی سێکسی، مێردەکەی بەچاوێکی سووك سەیری ناکا، بەومەرجەی مێردەکەی رای وابێت کە هاوڕێیەتی ژنەکەی بەردەوام دەبێت بێ پچڕان.

(4) "من خۆم لەو باوەڕەدام کە خۆش بویسترێیت هێندە چاکەیەکی مەزنە کە کەسی خۆش ویستراو هەم لەخوداکانەوەو هەم لەئینسانەکانەوە سودو کەڵك رووی تێدەکەن. تەنانەت لەمەشدا ستەمکاران، بەجیا لەهەموو کەس، بێ بەشنو زەرەریانە.

"بەڵام، سایمۆندیس گەر حەزدەکەیت بزانی من راستیت پێدەڵێم ئەوا لەم خاڵە وورد بەرەوە. بەدڵنیاییەوە پتەو ترین دۆستایەتی ئەو دۆستایەتیەیە کە دایكو باوکان بۆ منداڵەکانیان هەیانەو ئەوەی منداڵەکان بۆ دایكو باوکیان هەیانە، برا بۆ برا، ژن بۆ مێردی، هاوڕێ بۆ هاوڕێ.

(5) گەر تۆ بتەوێ بەووردی لەمەسەلەکە ووردببیتەوە کە کەسانی تایبەت خۆش دەویسترێن لەلایەن ئەوانەوە کە ناوم بردن، لەکاتێکدا ستەمکاران منداڵەکانی خۆیان کوشتوە، لەژێر سایەی رژێمە ستەمکارەکاندا برا بۆتە جەللادی برا، هەروەها زۆرێك

لەستەمکاران سەرەو نگوم کراون لەلایەن ژنەکانیانەوە، یاخود لەلایەن هاوڕێ کانیانەوە، ئەو هاوڕێیانەی کە ئەمان لەو باوەڕەدابوون بەڕاستی هاوڕێن.

(6) چۆن ستەمکارەکان باوەڕ بهێنن بەوەی کە شوێنی خۆشەویستین، یا خۆش دەویسترێن لەلایەن هیچ کەسێکەوە، هێندەی شوێنی رك‌و کینەن بەپێی سروشت‌و بەڵام خۆش ویستنیان بەزۆری یاسا؟

# (4)

(1) دووبارە، وەرەو سەیری کێشەی بڕوا (trust)بکە، کێ دەتوانێ لەمەدا بەشداربێتو بێ بەش نەبێت لەچاکەی مەزندا؟ ئەوە چ جۆرە دۆستایەتیەکی شیرینە کە بەدوورە لەبڕواو ڕێزی وەك یەکەوە؟ چ جۆرە نزیکیەکە لەیەکەوە کەخۆشی دەبەخشێ بەژنو مێرد بێ بڕوا؟ یاخود ئەوە چ خزمەتکارێکە باشە گەر شوێنی بڕوا نەبێت؟

(2) لێرەدا هەرچی پەیوەندی بە بڕواکردنو ئیعتمادکردنەوە هەیە، ستەمکار کەمترین بەشی پێ بڕاوە، نەك هێندەی نەك تەنیا ئەوەی ژیانیان خەرج دەکەن لەبڕوانەکردن بەو خواردنو خواردنەوانەی پێشکەشیان دەکرێ، بەڵکو مومارەسەیەکە باوە کە ستەمکارەکان پێش ئەوەی قوربانی پێشکەش بەخوداکان بکەن داوا لەئامادەبوان دەکەن کەتامی قوربانییەکە بکەن بەهۆی بێ باوەڕیو نەبوونی ئیعتمادیانەوە بگرە لەوێشدا ڕەنگە شتێکی خراپ بخۆن یا بخۆنەوە.

(3) هەرچی پەیوەندی بەنیشتمانەوە هەیە، لای ئینسانەکان نیشتمانەکان زۆر بەبەهان. هاونیشتمانیان وەك پاسەوانی یەکتر مامەڵە دەکەن دژ بەکۆیلەکان، هەروەها دژ بەپیاو خراپەکان، ئەمەش بێ بەرانبەر، بۆ ئەوەی هیچ هاونیشتمانییەك ڕوبەڕوی ترۆر نەبێتەوە.

(4) بگرە تا ئەو شوێنە پێشکەوتوون لەچاودێریکردندا کە هەندێك کردویانەتە یاسا کە تەنانەت کەسی شەریکی تاوانبار هەروا بەئاسانی بۆی دەرباز نەبێت. کەواتە بەهۆی نیشتمانەوەیە هەر هاونیشتمانییە ژیانی خۆی بەسەلامەت دەژی.

(5) بگرە لەمەشدا، پێچەوانەکەی بۆ ستەمکارەکان ڕاستە. لەجیاتی ئەوەی تۆڵەیان بۆ بکەنەوە، شارەکان بەشکۆمەندییەوە ڕێز لەبکوژانی ستەمکار دەنێن، لەجیاتی ئەوەی بکوژی ستەمکار لەمەڕاسیمە پیرۆزەکاندا بێ بەش بکەن، وەك ئەوەی کە لەگەڵ بکوژانی کەسانی عادی دەیکەن، کەچی شارەکان لەمەعبەدەکاندا پەیکەر بۆ ئەو کەسانە دادەتاشن کە ستەمکار ترۆر دەکەن.

(6) "سایمۆندیس، گەر لەو باوەڕەدایت کە ستەمکار خاوەنی شتومەکی زۆرترە وەك لەکەسێکی تایبەتو هەر بۆیەشە چێژێکی زۆرتر دەبینێت لەوخاوەندارێتییە، تەنانەت ئەمەش وانییە. هەروەك چۆن وەرزشکارەکان هیچ لەزەتێك لەوەنابینن کەبیسەلمێنن لەکەسانی عادی بەهێزترن، ئاوهاش ستەمکار هیچ لەزەتێك لەوە

نابینێت کە زۆرتر شتومەکی هەیە وەك لەکەسە تایبەتیەکان، بەڵکو ئازارێکی زۆر دەچێژێ کاتێك کەمتری هەبێت لەستەمکارەکانی دیکە. چونکی ئەو واسەیری ستەمکارەکانی دیکە دەکا وەکو مونافسو دوژمنو چاو بڕ لەسامانی ئەم.

(7) "هەروەها ئەوشتەی کە ستەمکار ئارەزووی دەکا خێراتر نایەت بەدەستەوە وەك لەکەسێکی تایبەت. کەسی تایبەت یا ئارەزووی خانوویەك دەکا، یا کێڵگەیەك، یا کۆیلەیەکی ناوماڵ، بەڵام ستەمکار ئارەزووی شارەکان دەکا، داگیرکردنی وڵاتە بەرفراوانەکان، بەندەرەکان قەڵا مەزنەکان، ئەوشتانەی کە بەقورسیو مەترسیەکی زۆرەوە بەدەست دەهێنرێن، وەك لەوشتانەی کە شوێنی ئارەزووی کەسانی تایبەتن.

(8) "زیاتر لەمە، تۆ لەنێوپیاوە تایبەتەکاندا کەمتر هەژارێك دەبینی هەژارتر لەستەمکارەکان. چونکی ئەوشتەی گەورەیەو یاخود بڕێکی کافییە حوکم بەسەریدا نادرێ لەڕووی چەندێتییەوە بەڵکو لەڕێگای بەکارهێنانیەوە هەڵدەسەنگێندرێ. هەر بەم پێیە، ئەو بڕەی کەزیاد لەپێویستە گەورەیەو ئەوەش کە لەسنوری کافی بوون کەمترە بچووکە".

(9) لێرەدا بۆکەسی ستەمکار جۆری موڵكو ماڵی لەراستیدا کەمترنو نەگونجاوترن بۆ پێویستیەکانی وەك لەوەی لای کەسانی تایبەت دەیبینینەوە. کەسانی تایبەت دەتوانن مەسروفی رۆژانەیان کەم بکەنەوە بەهەر جۆرێك کە دەیانەوێت، بەڵام ستەمکارەکان ناتوانن لەبەرئەوەی زۆرترینی خەرجیەکانیانو پێویست ترینیان لەپاراستنو پاسەوانی کردنی ژیانیاندا خەرج دەکرێت. هەروەها کەمکردنەوەی ئەو خەرجیانە دەبێتە مایەی وێرانی.

(10) دواجار، بۆچی دەبێت وەك هەژار حیساب بکردرێن ئەوانەی کە دەتوانن ئەوشتانە بەدەست بهێنن کە پێویستیانە لەڕێگای هۆکاری ڕەواوە؟ کێ ئەو کەسانە بەهەژارو کلۆڵ لەقەڵەم نادات کە بەهۆی پێویستیەکانیانەوە ناچارن شتی خراپو سووك دابهێنن؟

(11) ستەمکارەکان لەزۆربەی کاتەکاندا زۆر ناعادلانە هەڵدەستن بەتاڵانکردنی مەعبەدەکانو ئینسانەکان، لەبەرئەوەی هەمیشە پێویستیان بەپارەی زیاتر هەیە بۆ مەسروفاتە زیادەکانیان. وەك ئەوەی کە جەنگێکی ئەبەدی هەبێت، ستەمکارەکان ناچارن کە پشتگیری سوپا بکەن یاخود تابچن.

# (5)

(1) "سایمۆندیس، با دەربارەی غەمێکی دیکەی ستەمکارەکان قسەت بۆ بکەم. هەرچەندە ستەمکارەکان هەروەك کەسانی تایبەت، ئاشنان بەکاسانی شەریفو ژیرو عادل، بەلاّم لەجیاتی ئەوەی ئیعجاب دەربارەیان دەربڕن لێیان دەترسن. ستەمکارەکان لەکەسانی ئازاو دلێر دەترسن لەو روەوە کە رەنگە بەکارێك هەڵبستن لەپێناو ئازادیدا، لەحەکیمەکان دەترسن لەوەی رەنگە شتێکی نوێ یا هۆکارێکی نوێ دابهێنن، هەروەها لەعادلەکان دەترسن لەبەرئەوەی رەنگە کۆمەلاّنی خەڵك حەزبکەن لەلایەن ئەوانەوە فەرمانڕەوایەتی بکردرێن".

(2) لەکاتێکدا، بەهۆی ترسیانەوە، بەنهێنی دوورەپەرێزی دەکەن لەوجۆرە کەسانە یاخۆیانیان لێ رزگاردەکەن، کێ دەمێنێتەوە جگە لەتایپی ناعادلو شەهوانی (نا مولتەزیمەکان)و کۆیلە؟ ناعادلەکان لەلایەن ستەمکارەکانەوە شوێنی باوەڕن چونکی هەروەك ستەمکارەکان دەترسن لەوەی رۆژێك شارەکان ئازادبنو ئەمان بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. شەهوانیو نامولتەزیمەکان شوێنی باوەڕی ستەمکارەکانن چونکی لەئێستادا بەئارەزووی خۆیان هەڵسو کەوت دەکەن، کۆیلەکانیش لەبەرئەوەی هێندە بەسووكو سەلیمی سەیری خۆیان دەکەن خۆیان نابینن کەشایانی ئەوەبن ئازادبن. ئەم غەمە لای من زۆر زەحمەتە، لەکاتێکدا بزانی کۆمەڵێ کەسی چاك هەن بەلاّم ناچاربیت سوود لەکەسانی دیکە وەربگریت.

(3) "زیاتر لەمە، ستەمکار ناچارە کە عاشقی شاربێت، چونکی بێ شار نەدەتوانێ خۆی بپارێزێو نەبەختەوەریش بێت. وێڕای ئەمەش ستەمکاری ستەمکارەکان ناچار دەکا کە گیرو گرفت بۆ وڵاتەکانیشیان دروست بکەن. ئەوان هیچ خۆشحاڵ نابن لەوەی کە هاوڵاتیان ئازابن یاخود پڕچەك. بەپێچەوانەوە چێژ لەوە دەبینن کە بێگانەکان زیاتر لەهاوڵاتیان پڕچەكو شوێنی سام بن، ستەمکارەکان ئەم بێگانانە وەکو پاسەوانی خۆیان بەکاردەهێنن."

(4) زیاتر لەمە، لەکاتی وەرزی بەپیتو بەرەکەتداو هەبوونی شتو مەکی چاك، تەنانەت لەوێشدا ستەمکارەکان هەست بەخۆشی ناکەن. چونکی ستەمکارەکان لەو باوەڕەدان کە تاکو ئینسانەکان لەهەژاریدا بژین زیاتر تەسلیم دەبنو بەکار هێنانیان ئاسان ترە.

# (6)

(1) "سایمۆندیس حەزدەکەم بۆت ئاشکرا بکەم کە ئەو چێژو خۆشییەی کاتی خۆی وەك کەسێکی تایبەت هەستم پێکردون، لەوەتەی بوومەتە ستەمکار من وای دەبینم کە بەتەواوی لێیان دابڕوام".

(2) ئەوکاتەی من لەتەك هاوڕێکانی هاوتەمەنی خۆمدا دەبووم، لەزەتم لێ دەبینین‌و لەزەتیان لێ دەبینیم، لەمیوانداریيەکاندا بەشداریم دەکردو زۆرجار تا ئەو رادەیەی کە هەموو شتێکی ناخۆشی نێو ژیانی ئینسانم لەیاد دەکرد، بگرە زۆرجاران تاکو ئەو پلەیە رۆحم مەست دەبوو کە لەنێو گۆرانی‌و ئاهەنگو سەمادا دەتوایەوە، و بگرە زۆرجاران ئارەزوی سێکسیشم سەری هەڵدەدا لەنێوان من‌و ئەوکەسانەی لەدەوروبەر ئامادەبوون.

(3) ئێستا من بێ بەشم لەوکەسانەی کە لەهاوڕێیەتیم لەزەت دەبەن، لەبەرئەوە، من کۆیلەم هەیە لەجیاتی هاوڕێکان. من بێ بەشم لەهەر هۆگری‌و نزیکیەك لەتەکیاندا لەبەرئەوەی لەناویاندا خواستێکی چاك نابینمەوە بەرانبەر بەخۆم. هەروەها زۆر بەتوندی دووره پەرێزی دەکەم لەخواردنەوەو خەوتن وەك ئەوەی لەکەمیندابم.

(4) لە حەشامات سڵ بکەیتەوە لەکاتێکدا لەتەنیایی رابکەیت، لەوەبترسیت کە پاسەوانت نەبێت لەهەمانکاتدا لەوکەسانەش بترسیت کەپاسەوانیت دەکەن، بەوە رازی نەبیت کە چواردەورت بەپیاوی پرچەك نەگیرابێت لەهەمان کاتیشدا حەزیش نەکەیت بەچەکەوە بیان بینیت، ئایا بەڕاستی ئەمە هەل‌و مەرجێکی شوێنی بەزەیی نییە؟

(5) زیاتر لەمە، باوەڕ بەبێگانەکان زیاتر بکەیت وەك لەهاونیشتمانیان، بەربەریەکان زیاتر لەیۆنانیەکان، ئارەزوی ئەوەبکەیت کەسانی ئازاد بکەیتە کۆیلەو ناچاربیت کۆیلەکان ئازاد بکەیت، ئایا ئەمانە هەر هەموو نیشانەی ئەو رۆحەنین کەشڵەژاوەو پەرێشان بوە لەلایەن ترسەوە؟

(6) "ترس، وەك دەزانی، لەرۆحدا تەنیا ئەوەنییە کەخۆی لەخۆیدا شوێنی ئازارە، بەڵکو دەشبێتە تێکدەری هەموو چێژەکان".

(7) سایمۆندیس گەر تۆش ئەزموونی جەنگت هەبێت‌و رەوانەی بەرەکانی پێشەوەی جەنگ کرابیت‌و رووبەڕوی دوژمن وەستا بیتەوە، بیرت دەکەوێتەوە کە چ جۆرە خواردنێکت وەرگرتوەو چۆنیش خەوت هەبوە.

(8) ئازارێك لەوكاتەدا چەشتوتە هەمان ئازارە كە ستەمكارەكان دەیچێژن، بگرە زۆر خراپ تر لەوەش. چونكی ستەمكارەكان لەو باوەڕەدان كەتەنیا دوژمنەكان لەپێشیانەوە نین بەڵكو لەهەموو لایەكدان.

(9) سایمۆندیس دوای ئەوەی گوێی لەم قسانە گرت، قسەكانی بەهیرۆ بڕیو گوتی: "لەوباوەڕەدام تۆ زۆر بەچاكی مەسەلەیەكت خستەڕوو. جەنگ شتێكی تۆقێنەرە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، هیرۆ ئێمە پاسەوان دادەنێین لەكاتی عەمەلیاتی سەربازیداو بەبڕواوە بەشی خۆمان لەخواردنو خەو وەردەگرین".

(10) لێرەدا هیرۆ گوتی: "سایمۆندیس، بەڵێ راستە بەزیۆس سوێندبێ، یاسا چاودێری پاسەوان دەكا تاكو هەم لەخۆیان بترسنو هەم لەجیاتی ئێوە سڵ بكەنەوە. بەڵام ستەمكارەكان پاسەوانەكان بەكرێ دەگرن، هەروەك دروێنەكەرەكان".

(11) هەروەها بەدڵنیاییەوە پاسەوانەكان، گەر توانای هەرشتێكیان هەبێت، دەبێت بەوەفا بن. لەگەڵ ئەمەشدا پەیداكردنی پیاوێكی بەوەفاو دڵسۆز زۆر زەحمەت ترە لەپەیداكردنی كەسانی دیكە بۆ هەر ئەركێك دەتەوێت، لەكاتێكدا ئەوانەی بەكاری پاسەوانی هەڵدەستن لەبەرخاتری پارە ئەو كارە دەكەنو لەهەرچركەساتێكدا پارەیەكی زۆرتر وەربگرن لەڕێگای كوشتنی ستەمكارەوە، زۆرتر لەوپارەیەی كەستەمكار دەیانداتێ، ئەواهیچ سڵ ناكەنەوە لەوكارە.

(12) "هەرچی پەیوەندی بەوخاڵەوە هەیە كە گوایا تۆ بەخیلی بەئێمە دەبەیت لەبەر ئەوەی ئێمە دەتوانین سود بەهاوڕێكانمان بگەیەنینو هەروەها لەبەرئەوەی دەتوانین باڵادەست بین بەسەر دوژمنە تایبەتیەكانماندا، ئەمەش بەوشێوەیە نییە كە تۆ بۆی چوویت".

(13) دەربارەی هاوڕێیان، چۆن دەتوانی باوەڕ بەوە بهێنیت كەتۆ سوودێك دەبەخشیت، لەكاتێكدا دەزانیت ئەوكەسەی زۆرترین سود لەتۆ وەردەگرێ زۆر بەخۆشییەوە خێراو بەپەلە لەبەرچاوت گوم دەبێت؟ لەبەرئەوەی هەرچیەك لەستەمكار وەربگرێ كەسێ باوەڕناكا موڵكی ئەوبێت تاكو دوور نەكەوێتەوە لەفەرمانەكانی ستەمكار.

(14) هەرچی پەیوەندی بەدوژمنە تایبەتیەكانەوە هەیە، چۆن دەڵێیت كە ستەمكارەكان دەستەڵاتیان بەسەریاندا دەشكێو كۆنترۆڵیان دەكەن لەكاتێكدا ستەمكارەكان دەزانن كە هەموو رەعیەتەكانیان دوژمنیانن، لەكاتێكدا كەشیاو نییە هەر هەموویان بكوژیت یا تەوقو زنجیریان بكەیت؟ چونكی لەوكاتەدا كێ دەمێنێتەوە كەستەمكار حوكمیان بكا؟ وێڕای زانینی ئەوەی كە ئەوانە هەرهەموو

دوژمنی ئەون (ستەمکار)، لەلایەکەوە دەبێت خۆی لێیان بپارێزێ‌و لەلایەکی دیکەشەوە ناچارەکە بەکاریان بهێنێت.

(15) "سایمۆندیس ئەوە چاك بزانە، ئەوکەسانەی کەئەمان لێیان سڵ دەکەنەوە لەنێو خەڵکیدا، زۆر زەحمەتە بۆیان (ستەمکارەکان) کەدەیانبینن زیندوون‌و دێن‌و دەچن، بەڵام کوشتنیشیان ئاسان نییە. ئەمە هەر وەك ئەوە وایە کە ئەسپێکی چاك‌و چاپووك هەبێت لەهەمانکاتیشدا ترسی ئەوەش لەئارادابێت کە رەنگە ببێتە مایەی دەردێکی چارەسەر نەکراو، لێرەدا ئینسان زەحمەتە بتوانێ بیکوژێ لەبەر چاکەکانی، لەهەمانکاتیشدا زەحمەتە هێشتنەوەی بەزیندوێتی بەهۆی ئەگەری روودانی کارەساتێکەوە لەناوەڕاستی رووبونەوەی مەترسیەکدا".

(16) هەروەها هەروەك کۆمەڵێ شتی دیکە کە ئیدارەکردنیان زەحمەتەو لەهەمان کاتیشدا بەسودن، هەر هەموو دەبنەمایەی دەردەسەری خاوەنەکانیان‌و بگرە ئەوانەش کە خۆیان لێ خەڵاس کردوە."

# (7)

(1) کاتێك سایمۆندیس ئەوشتانەی لەهیرۆ بیست، گوتی: "وادەردەکەوێت کەشەرەفو ناوو ناوبانگ شتێکی مەزن بێت، ئینسانەکان رەنجو زەحمەتێکی زۆر دەکێشنو بەرگەی هەموو مەترسییەکان دەگرن لەپێناو بەدەست هێنانیدا".

(2) تۆش بەهەمان شێوە، هەرچەندە ئەوەتا دەڵێیت کەستەمکاری کێشەی زۆرە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵی بۆ دەدەیت بەو هیوایەی بە بەرێز سەیر بکردرێیت، لەپێناو ئەوەی کە هەر هەموو ئەوانەی ئامادەن لەمەجلیسێکدا، هەر هەموو گوێ رایەڵی فەرمانەکانت بن بێ هێنانەوەی بەهانە، تا موعجیب بن پێت، لە بەرت هەڵبستن، لەسەر شەقامەکان رێگات بۆ چۆڵ بکەن،و هەمیشە بەقسەو بەکردەوە رێزت بۆ دابنێن. ئەمە ئەوشتانەن کە رەعیەت دەیکەن بۆستەمکارەنو هەرکەسێکی دی کە بەرێزەوە بینرخێنن.

(3) "هیرۆ، من خۆم وابیردەکەمەوە کەپیاوی راستەقینە لەبوونەوەرەکانی دیکە جیاوازە لەوەدا کە هەوڵی شەرەف دەدات. لەکاتێکدا هەموو ئاژەڵەکان چێژ لەخواردنو خواردنەوەو خەوو سێکس دەبینن. بەڵام تموح بەشێوەیەکی سروشتی لەئاژەڵە ناعەقڵیەکاندا سەر هەڵنادات و هەروەك چۆن مەرج نییە لەگشت ئینسانێکدا سەرهەڵبدا. ئەوکەسانەی کە عەشقی شەرەفو ستایش لەسەریاندا هەیە بەسروشت جیاوازنو ئەوانەی کە ئیدی تەنیا ئینسان نین بەڵکو پیاوی راستەقینەن".

(4) بەم پێیە، من وای بۆ دەچم کە رەنگە تۆ ئەو هەموو شتانەت لەستەمکاریدا تەحەمول کردبێت لەبەرئەوەی تۆ زۆرتر لەهەر کەسێکی دی بەرز نرخێندراویتو رێزت لێگیراوە. لەبەرئەوەی هیچ چێژێکی ئینسانی نییە هێندە نزیك بێتەوە لەوشتەی کە خوداییە جگە لەو چێژەی کە پابەندی شەرەفو رێزە.

(5) دەربارەی ئەمە هیرۆ گوتی: "بەڵام سایمۆندیس، تەنانەت شەرەفو رێزی ستەمکارەکان هەروەك چێژی سێکسە کە پێشتر بۆم رونکردیتەوەو نیشانمدا چۆن حاڵەتێکە".

(6) خزمەتیِ لەوکەسانەوە بێت کە عەشق نابەخشن، گوتمان هیچ جۆرە خزمەتێكو کارێك نییە، هەروەك چۆن سێکسێك بەزۆر بێت تەنیا لەرووکەشدا وا دەردەکەوێ کە خۆشە. بەهەمان شێوە خزمەتی کەسانێك کە دەترسن بەهیچ شێوەیەك رێز لێنانو شەرەفی تێدا نییە.

(7) ئایا دەتوانین بڵێین ئەوانەی کەناچار دەکرێن لەسەر کورسییەکانیان هەڵبستنە سەرپێ تارێز لەوانە بگرن کە ناعادلانە مامەڵەیان لەتەکدا دەکەن، یاخود ئەوانەی لەسەر شەقامەکان رێگا چۆڵ دەکەن بۆ بەهێزەکان، ئەو کەسانەی بەعەدلەوە مامەڵەیان لەتەکدا ناکەن، ئایا ئەمە رێزدانان و بەگەورەیی سەیرکردنە؟

(8) "زیاتر لەمە، کۆمەڵانی خەڵکی خەڵات دەدەنە ئەوانەی کە زۆرتر شوێنی رق لێهاتنەوەن،و بگرە بەتایبەتی لەوکاتەدا کە هەست بکەن رەنگە زەرەرو زیانێك ببینن لەئەوانەوە. بەڵام من لەو باوەڕەدام کە ئەم کارانە رەنگە شیاوتربێت وەکو کاری کۆیلایەتی سەیر بکرێن. لەکاتێکدا بەش بەحاڵی خۆم لەوباوەڕەدام رێزو شەرەف لەکرداری تەواو پێچەوانەی ئەوانەوە سەر هەڵدەدەن".

(9) "ئەوکاتەی ئینسانەکان، لەودیدەوەی کە پیاوێکی راستەقینە دەتوانێ سودمەندبێت بۆیان، لەوقەناعەتەوەی کە سود لەچاکەکانی وەردەگرن، لەبەرئەم هۆیە ناوی ئەوو ستایشی ئەو لەسەر زمانیان دەبێت، ئەوکاتەی هەر کەسە ئەو ببینێ وەك چاکەی خۆی، ئەوکاتەی بەئیرادەوە رێگای بۆبکەنەوەو لەبەری هەڵبستن لەدیدی ویستن و حەزلێکردنەوە نەك لەترس و تۆقاندنەوە، ئەوکاتەی خەڵاتی دەکەن بۆ فەزیلەتە مەدەنیەکانی و سودەکانی، خزمەتکردنی ئەوان بۆکەسی ئاوهاو بەوشێوەیە، بەڕای من رێزدانانی حەقیقییە بۆ ئەوکەسە، کەسێکی لەوجۆرەش، بەڕای من، شایەنی رێزێکی لەو جۆرەیە. کەسێکی لەوجۆرە بە بەختەوەر دەزانم کە ئاوها رێزی بۆ دابنرێ".

(10) وای دەبینم کەسێکی لەو جۆرە پیلان دژی ناچنرێ، بەڵکو قەلەقیەك بوونی دەبێت نەکا زەرەر ببینێ و بەم شێوەیە ژیانی خۆی دەژی بە بەختەوەری و بێ ترس، بێ حەسودی بردن، بەدوور لەمەترسی. بەڵام ستەمکار، سایمۆندیس، باش دەزانێ کە ژیانی شەوو رۆژی وەك کەسێك دەژی و دەباتە سەر کە لەلایەن هەموو ئینسانەکانەوە حوکمی بەسەردا دراوە کە دەبێت بمرێ لەبەر ئەو هەموو ناعەدالەتیانەی کە ئەنجامی داون.

(11) کاتێك سایمۆندیس گوێی لەو هەموو قسانە بوو گوتی: "بەڵام هیرۆ، کەواتە گەر ستەمکار بوون هێندە مایەی کلۆڵییەو تۆباش ئەمە دەزانی، هۆی چییە خۆت لەو خراپەیە رزگار ناکەیت، هەروەها بۆچی کەسێك تائێستا بەخواست و ویستی خۆی دەست بەرداری ستەمکاری نەبوە، کەسێك کەستەمکاری بەدی هێناوە"؟

(12) هیرۆ گوتی: "لەبەرئەوەی تەنانەت لەمەشدا ستەمکاری هەرمایەی بەدبەختییە، چونکی شیاونییە کەدەست بەرداری بێت. لەبەرئەوەی ستەمکار چۆن دەتوانێ ئەو هەموو پارەیەی ئەو کەسانە بداتەوە کە ئەم تالانی کردوون، یاخود

لەبەرانبەردا ئازاری زنجیرو تەوقێك بچێژێ کە ئەم لەدەستو قاچو ملی ئەوانی دیکەی کردوون، یاخود چۆن جەزای ئەو هەموو ژیانە بداتەوەو بمرێ بۆ ئەو هەموو کەسانەی کە ئەم کوشتوونی؟ راستییەکەی، سایمۆندیس، گەر خۆ خنکاندنی (واتە کەسی ستەمکار) سوود بەهەر کەسێك بگەیەنێ. ئەو هیچ بەرژەوەندیەکی گیر ناکەوێت، جا کێشەکانی بپارێزێ یاخود بیانخاتە لاوە".

## (8)

(1) ئنجا سایمۆندیس گوتی: "هیرۆ، من سەرسام نیم لەوەی کەئێستا تۆ بەدڵ لەگەڵ ستەمکاریدا نیت، چونکی تۆ لەو باوەڕەدایت کەستەمکاری ڕێگرێکە لەبەردەم بەدەست هێنانی عیشقی ئینسانەکاندا وێڕای ئەوەش، من لەوباوەڕەدام کە دەتوانم ئەوەت فێربکەم کە حوکم کردن مەرج نییە ببێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کە لەلایەن خەڵکییەوە خۆش بوویستریێت، بگرە بەرژەوەندیشی تێدایە بۆ ژیانی تایبەتی".

(2) "لەکاتێکدا تاقیکردنەوەی ئەوەی کە ئەمە خودی حاڵەتەکەیە یاخود نەء باجاریێ لەوە گەڕێین کە فەرمانڕەوا بەهۆی دەستەڵاتیەوەیەتی کە دەتوانێ خزمەتی گەورە پێشکەش بکات، بەڵکو گەر ستەمکارو کەسی تایبەت هەمان کاربکەن، ئەو خاڵە لەبەرچاو بگرە کامیان زیاتر پێزانینو سوپاس دەباتەوە لەڕێگەی خزمەتکردنێکی وەك یەکەوە. بەنمونەیەکی سادە دەست پێدەکەم".

(3) یەکەم، گریمانی ئەوە بکە کە فەرمانڕەوایەكو پیاوێکی تایبەت، کاتێك کەسێك دەبینن، هاوڕێیانە مامەڵەی لەتەکدا دەکەن. لەم حاڵەتەدا، تۆ لەو باوەڕەدایت سڵاوو پێشوازی کامیان لای کەسی بیسەر زۆرتر چێژو خۆشی بەخشە؟ دووبارە گریمانی ئەوە بکە کە هەر دووکیان هەمان کەس ستایش دەکەن، کامە ستایشیان زۆرتر چێژو خۆشی بەخشە؟

(4) "تەسەور بکە، ئەو کەسە فیداکاریەك پێشکەش دەکا، هەردووکیان دەستی ڕێزی لێ دەنێن، بەڕای تۆ کام دەستی ڕێز لێنانەیا نەکە زۆرترمایەی پێزانینە؟تەسەوربکە هەردوکیان وەك یەك سەردانی نەخۆشێك دەکەن، ئایا روونو ئاشکرانییە کە سەرنجدانو بەتەنگەوەهاتنی کەسێکی دەستەڵاتدار دەبێتە مایەی مەزنترین خۆشی؟ گریمانی ئەوە بکە کە هەردووك وەك یەك خەڵاتەکان دەبەخشن، ئایا ئاشکرانییە کە تەنانەت لەم حاڵەتەشدا خزمەتو خەڵاتی کەسێکی خاوەن دەستەڵات زۆرتر بەهادارترە لەخەڵاتو خزمەتی کەسێکی تایبەتی گەرچی لەئەسڵدا نیوەی بەهای ئەو خزمەتەی ئەویشی هەبێ".

(5) "ڕاستیت بوێ، من لەو باوەڕەدام کە ئەوکەسەی فەرمانڕەوایەو حوکم دەکات چونکی نەك تەنیا فەرمانڕەوایەتی کردن پیاوی ڕاستەقینە زیاتر نەجیب تر دەکا، بەڵکو ئێمە بە دیدێکی ترو خۆشییەکی ترەوە لەهەمان کەس دەڕوانین زۆرتر لەکاتی ئەوەدا کە فەرمانڕەوایەتی دەکا وەك ئەوەی لەکاتێکدا کە ژیانی تایبەتیانەی خۆی

دەژی. هەروەها ئێمە زۆرتر لـەزەت لـەگفتوگۆی ئەوانـە دەبینـین کـە خـاوەن جـێو مەقامن وەك لەوانە کە هاوشانی خۆمانن".

(6) "هەرچی پەیوەندی بەکوڕانەوە هەیە، کە تۆ لـەوباوەڕەدا بوویت لـەو روەوە ستەمکاری گونجاو نییە، ئەوان کەمتر هەست بەسوکایەتی دەکـەن لەگـەڵ کەسـێکی پیر کاتێك ئەو کەسە فەرمانڕەوابێت، وە کەمتریش سـەرنجی ناشـرینی مەعشـوقەکە دەدەن، چونکە بوونی ئەو وەك کەسێکی بەڕێز خۆی لەخۆیدا کۆمەك کەرە بـۆ بـەرز نرخاندنی، بەپلەیەك کە اهانەکانی مەحف دەبنەوە، وە ئەو شتەی کە نەجیبە زۆرتر خۆی نیشان دەدا".

(7) "کەواتە لەکاتێکدا کە تـۆ سوپاسـێکی زیـاتر وەردەگریـت لـەرێگای خزمـەتی یەکسانەوە، ئایا رەوا نییە بڵێین، لەکاتێکدا کە تۆ دەتوانی سودی زیـاتر ببەخشـیت لەڕێگای جێ بەجێکردنی کۆمەڵێ شتی زۆرەوەو بەخشینی خەڵاتێکی زۆر، رەوانییـە بڵێین کە دەتوانی زیاتر شوێنی خۆش ویستن بیت وەك لەکەسێکی تایبەت"؟

(8) هـیرۆ یەکسـەر وەڵامـی دایـەوە، سـایمۆندیس، نـەخێر بـەهیچ شـێوەیەك، لەبەرئـەوەی ئێمـە ناچـارین کارگـەلی ئـەوتۆ بکـەین کـە دەبنـە مایـەی چـاندنی دوژمنایەتی، زیاتر لەکەسانی تایبەت.

(9) ئێمـە دەبێـت تـالانی بکـەین بـۆ ئـەوەی پارەمـان هـەبێت بـۆ جێبـەجێکردنی پێویستیەکانمان، دەبێت خەڵکی ناچاربکەین پاسەوانی ئەو شتانە بن کە پێویستیان بەپاراستن هەیە، ئێمە دەبێت ناعادلەکان سزابدەین، سنوور بـۆ ئەوکەسـانە دابنێـین کەبێ ئیلتیزامن، لەکاتی هێرشی سەربازیشدا چ لـەدەریاوە بێـت یـا لـە وشـکانییەوە ناشێتو نابێت کارەکە بدەینە دەست تەمبەڵەکان.

(10) "زیاتر لەمە، ئـەو پیـاوەی کەسـتەمکارە پێویسـتی بـەکرێگیراوەکان هەیـە. هیـچ بـارێك گرانـتر نییـە بۆسـەر شـانی هاونیشـتمانیان جگـە لەمـە.. چونکـی هاونیشتمانیان لەوباوەڕەدان کەستەمکارەکان ئـەو بەکرێگیراوانـە رادەگـرن نـەك بـۆ ئـەوەی هاوبەشـی رێزبـن لەتـەکیاندا بـەڵکو بـۆ ئەوەیـە کـە تـاکو سـوود مـەندبن لەکۆمەکیان".

## (9)

(1) لەبەرانبەر ئەوەشدا سایمۆندیس گوتی: "هیرۆ، من ئینکاری ئەوە ناکەم کە ئەو هەموو مەسەلانە پێویستیان بەسەرنجدان هەیە. هەندێ بەتەنگەوە هاتن رەنگە ببنە مایەی رق و کینە، هەندێکی دی مایەی رازی بوون".

(2) فێرکردنی ئەوشتەی کە زۆر چاکە، ستایش کردن و رێز لێنان لەوکەسەی ئەمە بەدەست دەهێنێت لە رێگای زۆر نەجیبانەوە، خۆی مەسەلەیەکە دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی رێزی موتەبادل، لەکاتێکدا سەرزەنشتکردنی ئەو کەسەی کەمتەرخەم و بێ باکە لەئەنجامدانی کارێکدا، زۆر بۆ هێنان، سزادان و راستکردنەوە، ئەم شتانە هەر هەموو دەبنە مایەی سەرهەڵدانی دوژمنایەتی موتەبادل.

(3) بەم پێیە، من دەڵێم ئەو پیاوەی کە فەرمانڕەوایە دەبێت فەرمان بەسەر کەسانی دیکەدا بدا کە ئەوان هەڵبستن بەسزادانی ئەو کەسەی پێویستی بەزۆرە ملێ هەیە، بەڵام خۆی دەبێت خەڵاتەکان دابەش بکا. ئەوەی ئێستا روودەدا ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەمە رێکخستنێکی چاکە.

(4) چونکە هەرکات ویستمان کۆرسەکان (تیپەکان) کێ برکێ بکەن ئەوا ئەرخۆن[٣] (archon) خەلاتەکان دابەش دەکا، بەڵام کاری رێکخستنی هەر کۆرسەی بە بەرێوەبەرەکان سپاردوە، هەروەها کەسانی دی بۆ بەکارهێنانی زۆر دژ بەوانەی لەنواندندا سستی دەنوێنن. بەم پێیە، ئەوەی لەم کێ برکێیانەدا دەبێتە شوێنی رێز و پێزانین ئەوە لەخودی ئەرخۆنەوە دێت، ئەو شتەش کەمایەی بوغز و بێزهاتنەوەیە لەکەسانی دیکەوە دێت و کاری ئەوانە.

(5) ئەوە چییە رێدەگرێ لەوەی کە گشت مەسەلە سیاسییەکان ئاوها بەم شێوەیە ئیدارە بکرێن؟ هەموو شارەکان وا دابەش کراون، هەندێك بەپێی قەبیلەکان، هەندێکی دی بەپێی دابەشکردنی ناوەکی، هەندێکی دی بەپێی کۆمپانیەکان و فەرمانڕەواکانیش هەریەکە لەبەشێك لێپرسراوە.

(6) گەر کەسێك پێویست بێت خەلات بەسەر ئەو بەشانەدا دابەش بکا، وەکو کۆرسەکان، بەهۆی لەشکری چاکەوە، ئیلتزامی چاك، سوارچاکی، دلێری لەجەنگەدا، عەدالەت لەپەیوەندییە عەقدییەکاندا، ئەوا ئەم شتانە رێی تێدەچێ کە مومارەسە بکردرێن بە مەبەست و نیازەوە.

(7) "بەڵێ، بەزیۆس سوێندبێ، لەکاتی حەملەی سەربازیدا بەخێراییەکی زۆرتر بە بەرەوپیری کارەکە دەچن هەولی بەدەست هێنانی ڕێزو شەرەفی زیاتر دەدەن، زیاتر بەپارە بەشداری دەکەن، کە کاتی خۆی هات بێ دواخستن، هەروەها کشتوکاڵ کە بەنرخترینی شتەکانە بەلام کەمتر ئیدارە دەکرێ لەڕێگای کێ بڕکێوە، بگرە کشتوکاڵیش زیاتر پێش دەکەوێ گەر کەسێك خەلات دیاری بکا بۆ کێڵگەکانو گوندەکان بۆ ئەوکەسانەی کە باشتر زەوی دەکێڵنو بەرهەم دەهێنن،و کۆمەڵێ کاری چاك دەشێ بەئەنجام بگەینرێت لەلایەن ئەو کەسانەوە کە لەنێو هاونیشتمانیاندا بەچالاکییەوە روو لەئەنجامدانی ئەو کارانەوە دەکەن".

(8) "بودجە بەم شێوەیە زیاد دەکا، بەدواشیدا، لەحاڵەتی نەبوونی کاتی فەراغدا اعتدال زۆرتر بەرکەماڵ دەبێت، هەرچی پەیوەندی بەکاری خراپیشەوە هەبێت، کەمتر لەوکەسانە دەوەشێتەوە کە سەرقاڵن".

(9) "گەر ئیستراد سودی هەبێ بۆشار، ئەوکەسەی ڕێزی زیاتری لێدەگیرێ لەبەر سەرقاڵ بوونی بەم کارەوە ئەوا کەسانی وەکو خۆی خڕدەکاتەوەو هانیان دەدا. گەر وادەرکەوت کە ئەو کەسەی دەرامەتێکی بێ دەردەسەری بۆ شار دەهێنێتە ئاراوە دەبێت ڕێزی بۆ دابنرێ، تەنانەت تێڕامانێکیش لەم جۆرە بێ حیساب بۆ کردن ناهێڵدرێتەوە".

(10) "بەکورتییەکەی، سەبارەت بەهەموو مەسەلەکان ئەو کەسەی کە شتێکی بەسوودی نوێ دەخاتە روو بێ ڕێزلێنان هەروا بەئاسانی بەسەریدا باز نادرێ، گەر ئەم کارە بکرێت ئەوا ئەمیش بەدەوری خۆی کەسانی دی دەرگیر ئەوە دەکا کە بیر لەشتی چاك بکەنەوە هەر کاتێکیش هەموو سەرقاڵی ئەوشتە بوون کە بەسودە، ئەمە خۆی لەخۆیدا بەناچاری دەبێتە مایەی چاککردنو داهێنانی زیاتر".

(11) "بەلام هیرۆ گەر تۆ لەوە سڵدەکەیتەوە کە گەربێتو خەلاتێکی زۆر بەسەر خەڵکدا دابەش بکردرێت، لەبەرانبەردا ڕێژەی خەرجی بەرز دەبێتەوە، ئەوەت لەیادبێت کەهیچ شمەکێکی بازرگانی هەرزان تر نییە وەك لەوەی کە ئینسانەکان دەیکڕن بەهۆی خەلاتەکانەوە. ئەوە دەبینیت لەمسابەقەکانی ئەسپسواری وەرزشو کۆرسەکاندا کە چۆن خەلاتی بچکۆلە خەرجییەکی زۆرو رەنجێکی زۆرو بەتەنگەوە هاتنێکی زۆر بۆ ئینسانەکان دەهێنێت؟"

# (10)

(1) هیرۆ گوتی: "واهەست دەکەم تۆ لەمەڕ ئەم کێشانە چاك قسە دەکەیت، بەڵام ئایا هیچ شتێکت هەیە بیڵێیت لەمەڕ سەربازە بەکرێگیراوەکانەوە، تاکو من بەهۆیانەوە رق‌و کینەیەك ئیجاد نەکەم؟ یاخود لەو باوەڕەدایت کە کاتێك فەرمانڕەوا دۆستایەتی خەڵکی بردەوە ئیدی پێویستی بە پاسەوان نامێنێت".

(2) "سایمۆندیس گوتی: بۆ خاتری زیۆس، بەدڵنیاییەوە پێویستی پێیان دەبێت. چونکی من دەزانم کە مەسەلەیەکی سروشتییە لەهەندێ کەسدا، هەروەك چۆن لەئەسپەکاندا دەیبینین، کە بێ ئەدەب‌و بێ ئیلتزام دەبن کاتێك پێویستیەکانیان تێربکردرێت.

(3) ترسێك کە پاسەوان دەیخاتە دڵی ئەو جۆرە کەسانەوە دەیکاتە کەسێکی موعتەدیل. هەرچی پەیوەندی بەکەسانی جوامێرەوە هەیە، بەڕای من هیچ شتێك نییە تۆ لەڕێگای ئەم سەربازە بەکرێگیراوانەوە بیدەیتە ئەوان.

(4) دیارە تۆ وەکو پاسەوانانی خۆت کۆمەکیان دەکەیت، پێش ئێستە زۆر لەسەروەرەکان بەدەستی کۆیلەکانیان تیاچوون. گەر بێت‌و، ئنجا ئەمە خاڵی یەکەمە، یەکێك لەوەزیفەکانی ئەو سەربازە بەکرێگیراوانە ئەوەبێت کە، وەك ئەوەی پاسەوانی هەموو هاونیشتمانیان بن، کاتێك کەپێویستییەك لەوجۆرە خۆی سەپاند ئەوا بەهانای هەموو کەسێکەوە بچن، هەروەها فەرمانیان بەسەردا درا کە دژی هەموو پیاو خراپێك بن لەنێو شاردا، لەم حاڵەتەدا هاونیشتمانیان لەوە تێدەگەن کە ئەوا لەلایەن ئەو بەکرێگیراوانەوە کۆمەك دەکرێن.

(5) زیاتر لەمە، ئەمانە رەنگە بەچاکی بتوانن جۆرێك لەبڕواو سەلامەتی فەراهەم بکەن بۆ جوتیارەکان‌و زەوی‌و زارەکان‌و مەڕوماڵات لەگوندەکاندا، هەروەك پاراستنی موڵکی تایبەتی خۆت‌و هەموو کەسانی دی لەدەڤەرەکەدا. هەروەها دەتوانن کاتی ئازاد بۆ هاونیشتمانیان فەراهەم بکەن تاکو بەتەنگ موڵك‌وماڵیانەوە بێن لەڕێگای پاراستنی بەرژەوەندیانەوە.

(6) هەروەها هەرچی پەیوەندی بەنهێنی‌و هێرشی کت‌و پڕی دوژمنانەوە هەبێت، ئەوەکێیە زیاتر لەهەرکەس کە دەتوانێ پێش وەخت هۆشیار بێتەوە، بەئاگا بێتەوەو بزانێ چی روو دەدا یاخود کارێك بکا پێش لەڕوودانی هێرشی لەو جۆرە بگرێ جگە

لەئەوکەسانەی کە لەسوپایەکدان‌و زەبت‌و رێکخستن‌و مەشقیان بینیـوە؟ چـی هەیـە لەسەربازە بەکرێگیراوەکان بەسودتر بۆ هاونیشـتمانیان؟ سـەربازە بـەکرێگیراوەکان لەهەرکەس زیاتر دەشێ ئامادەبن بۆ زەحمەت، ریسك کـردن، لـەپێناو بـەرژەوەندی هاونیشتمانیاندا.

(7) هەرچی پەیوەندی بەشارەکانی دراوسێوە هەیە ئایا پێویستیەك لەئارادا نییە بەتایبـەت بـەهۆی بوونـی ئەوانـەوە کـە هەمیشـە چـەکدارن، بـۆ ئـارەزوو خواسـتنی ئاشتی؟ بەهۆی زەبت‌و رێکخستنیانەوە، سـەربازە بـەکرێگیراوەکان باشـتر دەتوانـن ئەوشتانە بپارێزن کـە موڵکـی هاورێکانـەو ئـەو شـتانەش خـاپوور بکـەن کـە موڵکـی دوژمنەکانە.

(8) کاتێك هاونیشتمانیان لەوە تێگەیشتن کە ئەم سەربازە بەکرێگیراوانـە بـەهیچ شێوەیەك ئەزیەتی ئەو کەسانە نـادەن کـە ناعەدالەتیـەکیان نـەکردوە، بـەڵکو تـەنیا کۆنترۆڵی ئەو کەسانە دەکەن کە کاری خراپە دەکەن، بەهانای ئەوکەسانەوە دەچـن کـە ناعەدالـەتیان بەرانبـەر کـراوە، راوێـژ وەردەگـرن یـا لـەجیاتی هاونیشـتمانیان رووبـەڕوی مەترسـی دەبنـەوە، ئـا لەحاڵـەتێکی ئاوهـادا ئایـا پێویسـت نییـە کـە هاونیشتمانیان پارەی تـەواو بۆ راگرتن‌و پاراستنی کۆمەڵێ خەڵکی لەو جـۆرە خـەرج بکەن؟ لەدواجاردا لەیادمان بێت، خەڵکی پاسـەوانی تایبـەتی رادەگـرن بـۆ ئامـانجی کەمتریش لەوەی ئاماژدەمان پێدا".

## (11)

(1) "هیرۆ، تۆ نابێت خۆت بدزیتەوە لەخەرجکردنی ماڵو سامانت بەمەبەستی چاکەی گشتی، من وای دەبینم ئەوەی کەسێك وەك ستەمکار نەخشەی بۆ دەکێشێ لەشاردا بریتییە لەخەرجکردنی زیاد لەپێویست بۆشار وەك موڵكو ماڵی خۆی. رێگەبدە ئەم خاڵانە یەك بەیەك تاقی بکەینەوە".

(2) "یەکەم کامەیان، بەڕای تۆ، شوێنی شکۆمەندییە بۆ تۆ، خانوویەکی رازاوەو قەشەنگی گرانبەها، یاخود شارێکی رازاوە بەدیوار، مەعبەدەکان، ریزی دارودرەخت، بازاڕەکان، و بەندەرەکان؟

(3) سەبارەت بەسوپاکان، کامەیان زیاتر شوێنی تۆقاندنە لای دوژمنەکانت، خۆت بەسوپایەکی مەزنەوە بگونجێنی یاخود شارەکەت سەرجەم پارێزراوبێت بەسوپایەکی چاك"؟

(4) سەیری بوجەو دەرامەت بکە، بەچ رێگایەك دەشێ زیادبکردرێت، گەرتۆ تەنیا سەرقاڵی ئەوەبیت کە موڵكو سامانی خۆت لەحاڵەتی بەرهەمهێنانو زیادبووندابن، یاخود هەوڵی ئەوەبدەیت کە ماڵو موڵکی هەموو هاونیشتمانیان لەبرەودابن؟

(5) هەروەها لەمەڕ ئەو خولیایەی کە واسەیردەکرێ وەك نەجیب ترینو قەشەنگترین شت، پەروەردەکردنی ئەسپی گالیسکە، بەڕای تۆ کام رێگەیەیان زۆرترین کەرامەتو رێز بۆتۆ دەهێنێت، ئەوەی کەخۆت باشترین تیپی ئەسپەکان لەنێوان یۆنانیەکاندا هەڵبژێریت،و رەوانەی پێشبڕکێ کانیان بکەیت، یاخود ئەوەی کە پەروەردەبووترینو بەتواناترینو ئامادەبووترین بۆکێبڕکێ لەناو خودی شارەوە هەڵبژێردرێن؟ ئنجا سەبارەت بە بردنەوە، کامەیان زۆرلای تۆ نەجیبترە، بردنەوەی ئەسپی گالیسکەکانی تۆ، یاخود بەختەوەری ئەوشارەی کە حوکمی دەکەیت؟

(6) من دەڵێم شیاونییە بۆ کەسێك کە ستەمکارە کێبڕکێ لەگەڵ کەسانی تایبەتدا بکا. چونکی گەر بیبەیتەوە، لەحاڵەتێکی ئاوهادا شوێنی ئیعجاب نابیت بەڵکو دەبیتە شوێنی حەسودی، چونکی ئەوبردنەوەیە بە بەرئەنجامی موڵكو مەسروفێکی زۆر لەقەڵەم دەدرێ، خۆگەر بێتو کێبڕکێکە بدۆڕێنی ئەوا دەبیتە شوێنی گاڵتەجاڕی".

(7) "بەڵام هیرۆ من پێت دەڵێم، تاقیکردنەوەی تۆ وا لەگەڵ ئەوکەسانەی شارەکانی دیکە حوکم دەکەن، گەر تۆکارێك بکەیت ئەوشارەی حوکمی دەکەیت لە شارەکانی دیکە بەختەوەرتربێت، ئەوە باش بزانە کە تۆ لەلایەن داوەرەوە

(حەکەمەوە) بەبراوە لەقەڵەم دەدرێیت لەتاقیکردنەوە هەرە قەشەنگەکەی نێوان ئینسانەکاندا".

(8) یەکەم، زامنی عەشقی رەعیەتەکەت دەکەیت بۆخۆت، ئەمەش ئەوشتەیە کە ئارەزوی دەکەیت. لەمەزیاتر، داوەری ئەم سەرکەوتنە یەك کەس نابێت، بەڵکو هەموو ئینسانەکان گۆرانی بۆ فەزیلەتەکانت دەچڕن.

(9) وەك بابەتی ئیعجابو سەرنجدان تۆ تەنیا لەلایەن کەسانی تایبەتەوە بەرز نانرخێندرێت، بەڵکو لەلایەن هەموو شارەکانەوە نەك بەتەنیا لەبواری تایبەتیدا بگرە لەبواری گشتیداو لەلایەن هەموانەوە بەئیعجابەوە سەیر دەکرێیت".

(10) "هەرچی پەیوەندیشی بەئاسایشی خۆشتەوە هەبێت، چاکتر بۆت دەلویٚ کە سەفەربکەیت بۆ هەرکوێیەك کە دەتەوێت بۆ بینینی دیمەنەکان، هەروەها بۆت دەلویٚ ئەمەبکەیتو لێرەش بمێنیتەوە. دەشیٚ ڤیستڤاڵی هەمیشەیی ساز بدەیت بۆ ئەوانەی حەزدەکەیت ئەو بەرهەمانە نیشان بدەن، جا چ ژیری بێت، یا جوانو قەشەنگ یا شتی چاك کە هەیانە، هەروەها بۆ ئەوانەش کە ئارەزو دەکەن خزمەتت بکەن".

(11) "هەموو ئەوانەی کە ئامادە دەبن دەبنە هاوپەیمانت، ئەوەش کە ئامادەنییە لەویٚ، ئارەزوی ئەوە دەکا کە بتبینێت. کەواتە تۆنەك دەبیتە شوێنی رەزامەندی بەڵکو لەلایەن ئینسانەکانەوە خۆش دەویسترێیت. دەربارەی جوانەکانیش، تۆ هیچ پێویست ناکا کە ئیغرائیان بکەیت، بەڵکو رازی بە بەوەی کە اغراء بکردرێیت لەلایەن ئەوانەوە، هەرچی پەیوەندی بەترسیشەوە هەبێت کە رەنگە هەندێك ئەزیەت ببینیت".

(12) تۆ ئەو پیاوانەت دەبێت کەگوێڕایەڵت دەبن گەر مەترسییەك لەئارادابێت ئەوا تۆ نەك هاوپەیمانەکانت لەدەوری خۆت دەبینیت بەڵکو پاڵەوانەکانیشو ئەوانەش کە بەتاسەوەن بۆت، هەرگیز تۆ چواردەورت خاڵی نابێت لەوکەسانەی کە جوامێرن تاکو ئەو خەڵاتانەیان لەتەکدا بەش بکەیتو ئەوکەسانەی کە لەزەت لەشتە چاکەکانت دەبینەنو ئەوانەش کە ئامادەن بجەنگن لەپێناو شتەکانی تۆدا هەروەك ئەوەی شتومەکی خۆیان بێت".

(13) دەربارەی سەروەتو سامانیش تۆ هەموو سامانی هاوڕێکانت دەبێت "بەڵام هیرۆ، هاوڕێکانت بەبڕوا دەوڵەمەندبکە، چونکی ئەمە دەبێتە دەوڵەمەندکردنی خۆت. شار دەوڵەمەند بکە، بەو شێوەیە تۆ دەستەڵاتی خۆت زیاد دەکەیت. هاوپەیمانەکان بۆشار پەیدا بکە".

(14) "سەیری نیشتمان بکە وەکو موڵکی خۆت، هاونیشتمانیان وەکو هاوڕێکانی خۆت سەیربکە، هاوڕێکان وەکو منداڵەکانی خۆت، لەکوڕەکانتا وەکو ژیانی خۆت بڕوانە، و هەوڵبدە لەهەموو ئەمانە تێپەڕێنیت بەهۆی چاکەوە".

" گەر تۆ لەنواندنی چاکەدا لەگەڵ هاوڕێکانت باڵادەست بیت، دوژمنەکانت ناتوانن دژت بوەستنەوە. گەر هەموو ئەوشتانە بکەیت، ئەوە بزانە، هەموو ئەوشتانەی بەدەستیان دەهێنیت نەجیبترین‌و پیرۆزترین لەنێوئینسانەکانداو بۆماوەیەك کامەران بوون، بزانە هیچ کات نابیتە شوێنی ئیرەیی لەبەرئەوەی بەختەوەری".

*　　*　　*

لەکاتی تەفسیرکردنی ئەم تێکستەدا، دایەلۆگی "هیرۆ یا تیرانیکۆس"، هەروەك هەموو تێکستە فەلسەفیەکانی دی دەبێت سێ توێژ، چین لەو تێکستە دیاری بکەین، بەواتایەکی دی سێ پەیامی جیاواز بۆسێ گوێگر، خوێنەر یا گروپ یا دەستە بژێری جیاواز، توێژی یەکەم لەم تێکستە، چینی سەروەی ئەم دایەلۆگە، باس لەپەیامێك دەکا بۆ خوێنەرە گشتییەکان‌و ئینسانی سادەیە، توێژی دووەم یا چینی دووەمی ئەم تێکستە باس لەپەیامێك دەکا بۆ فەرمانڕەواکان‌و سیاسەتمەدارەکان‌و ئەو کەسانەی سەرقاڵی کاروباری سیاسی‌و مەدەنین، توێژی سێیەمی ئەم تێکستە باس لەپەیامێك دەکا بۆ بیرمەندو فەیلەسوفەکان. پەیامی یەکەمی ئەم تێکستە کە بۆ ئەو کەسانەیە کە بەزاق‌و بریقی ستەمکاری هەڵخەڵەتاون‌و بەسەرسوڕمانەوە سەیری ستەمکاری دەکەن، بەسادەیی دەڵێت کە ژیانی ستەمکار چییەو رای ستەمکار لەمەڕ ژیانی خۆیەوە نیشان دەدا، لەپاڵ دەربڕینێکی سادەی حەکیمێکدا لەمەڕ ستەمکارییەوە. چ کەسێکی عەوام هەیە، وێڕای ترس‌و تۆقاندنی ستەمکاریش، وێڕای ئەو قەسابخانانەی کەستەمکاری دەیاننێتەوە، چ بەئاشکراو چ بەنهێنی، چ لەبێداریداو چ لەخەودا ئیعجابی دەرنەبڕیبێ بەرانبەر بە ستەمکاری‌و ئارەزوو خواستن بەژیانی ستەمکار یاخود ئارەز خواستنی بوون بەستەمکار، یا بەلانی کەمەوە پرسیاری ئەوەی کە ستەمکاری چییەو چی لەدنیای ستەمکاردا دەگوزەرێ.

توێژی یەکەمی، یا سەرەوەی ئەم تێکستە، کە تەنك‌و سادەیە، وەڵامگۆی غەم‌و ئارەزوو پرسیارەکانی ئینسانی عوامە لەوەدا کە لەتوێکڵدا، لەشێوەی دەرەوەدا پێمان دەڵێت ستەمکاری چییەو ستەمکار چۆن دەژی‌و ژیانی ستەمکارانە چ جۆرە ژیانێکە. هەموو تێکستێکی فەلسەفی، چینێك یا توێژێکی سەرەوەی بەرووکەش پەیامێکی بۆ ئینسانی سادە پێیە، ئینسانی سادەش ئەو ئینسانەیە کە لەبەر هەر

هۆیەك بێت بواری قوڵ بوونەوەی فەلسەفەو مەعریفەی نەبوە، فەلسەفەو فیكری نەخوێندۆتەوە،و پرسیارە هەرە قوڵەكانی كەینونە رۆحی نەكرۆشتوون و لەسەر دەستی مامۆستاكاندا نەبۆتە شاگردو مەشقی نەبینیوەو زیاتر سەرقاڵی رووكەشیی ژیانە. ئینسانی سادە، كە لێرەدا مەبەستمان حوكمی ئەخلاقی نییە، وێڕای سادەیی‌و رووكەشی پرسیارەكانیشی، خاوەنی غەمەو دەیەوێت لەكۆمەڵێ شت تێبگا، لەوانە ستەمكاری چییە ستەمكار چۆن دەژی؟ ئەم ئینسانانە لەزەینیدا وێنەیەكی بۆ ستەمكارو ژیانی ستەمكار كێشاوەو بگرە لەبەر هەر هۆیەك بێت ئیعجابی بەرانبەر بەستەمكاریش هەیەو لەمەزیاتر، ئارەزووی ژیانی ستەمكارانە دەكا وەك هۆیەك بۆ رزگاربوون لەغەمە بێ سنورەكانی ژیانی رۆژانە، لێرەوە ئەم تێكستە پەیامێكی بۆ ئەو ئینسانە پێیە دیارە ئینسانی سادە، یا خوێنەرە گشتییەكان، بەخوێندنەوەی ئەم تێكستە شۆك دەبن (رادەچڵەكێن) لەبەرئەوەی وێنە سادەكان‌و گشتییەكان لەم تێكستەدا لەمەڕ ستەمكارییەوە كورت دەهێنن لەنیشاندانی واقیعی ستەمكاری‌و ژیانی ستەمكار. وێڕای ئەم راستییەش، لەمێژووی دوورو درێژی ستەمكاری‌و سستەمی سیاسیدا ئەو وێنانە لەمەڕ ستەمكارییەوە بەردەوامی بە خۆیان دەدەن.

پەیامی دووەم كە زۆر گرنگە، بۆ ستەمكارو سیاسەتمەدارو فەرمانڕەواكانە، كە باس لەچۆنێتی فەرمانڕەوایەتی دەكا، چاككردنی سیستەمی ستەمكاری‌و چۆنێتی دەرككردن‌و مامەڵەكردن لەتەك كۆمەڵانی خەڵكدا. ئەم توێژەی ئەم دایەلۆگە، كە دواجار قسەی لێدەكەین، ئەو توێژەی ئەم تێكستەیە كە سنوری مێژوو دەبڕێ‌و لەتەك سیستەم‌و بارودۆخە جیاوازەكان‌و خوێنەران لەودیوو بارودۆخێكی مێژوویی تایبەتی‌و ناوچەگەرییەوە بەدرێژایی مێژوو قسەدەكا، هەتا رێكخستنی سیاسی بوونی هەبێت ستەمكاری ئەگەرێكە، ستەمكارەكان لەوشوێنە هەن كە دەستەڵات تەجاوزی پێدەكرێ‌و تاكو دەستەڵاتیش تەجاوزی پێبكردرێ ئینسانەكان خۆیان لەژێر سایەی ستەمكاریدا دەبیننەوە، تاكو پێویست بێت سیاسەتمەدار هەبێت، بواری مەدەنی، دەستەڵات، كە دیارە تا رێكخستن هەبێت سیاسەت‌و دەستەڵاتیش هەن، كەواتە پرسیاری چۆنێتی رێكخستنی سیاسیانەی كۆمەڵگا (بەمانای مۆدرێن)و كاروباری شار (وڵات) بەمانای كلاسیك پێویستییەكی نكۆڵی لێنەكراوە. پەیامی دووهەمی ئەم تێكستە قسە لەمەڕ چۆنێتی بەڕێوەبردنی كاروباری سیاسی دەكا، گەر چی لەژێر پەردەی چاككردنی ستەمكاریشدابێت. هەر ئەمەشە پڕ مەترسیترین پەیامی ئەم تێكستە، (ئایا مەبەستی زینۆفۆن بوە لەگەیاندنی ئەم پەیامە یاخود نەء ئەمە مەسەلەیەكی دیكەیە). مەترسی سەرەكی ئەو توێژەی ئەم تێكستە لەوەدا

نییه کەباس لەوە دەکا کە پێویستە ستەمکار لەبیری خەڵکیو بەختەوەری خەڵکیدا بێت، بەڵکو مەترسییەکە لەخودی فیکرەی ریفۆرمی (چاککردنی) ئەوسیستەمەدایە، سیستەمێك کە ئەگەری ریفۆرمی زۆر کەمە، لەبیرۆکەی هونەری ستەمکاریدایە، واتە هونەرێك کە باس لەچاککردنی سیستەمێك دەکا لەرێگای کۆمەڵێ پرنسیپو هەنگاوەوە، سیستەمێك کە رەوایەتی نییە. مەترسی ئەم پەیامە رەنگە لەوەدابێت کە دەشێ ستەمکارەکانو سیاسەتمەدارەکان گوێ لەم پایامە بگرنو لەرێگای پەیرەوکردن لەهەندێ ئامۆژگاریو هەندێ گۆرانکارییەوە ئیدی دەتوانن هەموو سیستەمێکی ستەمکاریمان پێ بفرۆشن وەك سیستەمێکی چاك یاخود سیستەمێك کەژیانی ژیانەو مافی بوونی هەیە، ئەوە ئەگەر زیادەرۆیی نەکەنو سیستەمێکی ستەمکارمان لەژێر ناوی سیستەمێکی عادلو عەقلانیو لەم رۆژانەشدا دیموکراسی پێ نەفرۆشن. پەیامی سێیەم لەم تێکستەدا بۆ فەیلەسوفەکانە کە باس لەوەدەکا چۆن ئەمان دەتوانن لەتەك ستەمکاریدا مامەڵە بکەن. با لەوە گەرێین کە ئایا سایمۆندیس حەکیمە یا نەء، بەلام لەیادمان بێت کە ئەم تێکستە لەلایەن فەیلەسوفێكو سیاسەتمەدارێكو مێژوو نوسێکەوە، نوسراوە، کە بێ گومان یەکێك لەپەیامە سەرەکیەکانی ئەم تێکستە رووبەروی ئەو چەند کەسە کەمە بۆتەوە کە بەحەکیمو فەیلەسوف ناویان دەرکردوە. قوڵترین چینی ئەم تێکستە ئەوچینەیە کەباس لەفەلسەفەو ستەمکاری دەکا، ستەمکارو فەیلەسوف، سیاسەتو فەلسەفە، حەقیقەتو کاروباری سیاسی دەکا.

دایەلۆگی "هیرۆ یاتیرانیکۆس" لە دووبەش پێکهاتوە، لەبەشی یەکەمدا کە بریتییە لە حەوت بەند، هیرۆ هەوڵ دەدات کە بۆسایمۆندیسی شاعیر بسەلمێنێ کە ژیانی ستەمکار لەبەراوردا بەژیانی کەسی تایبەت ژیانێکی پڕ لەکلۆڵییەو بەدوور لەبەختەوەری. بەشی دووەم، لەبەندی هەشتەمەوە تاکو بەندی یازدەهەم، سایمۆندیس هەوڵ دەدا کە هیرۆ رازی بکا کە دەشێ ژیانی ستەمکار چاك بکردرێتو ستەمکار دەتوانێ ژیانێکی بەختەوەرانە بژیو کارێکیش بکا کە خەڵکی هەم بەختەوەربنو هەم ستەمکاری دوای چاککردنی قبوڵ بکەنو ستەمکاریان خۆش بوێ. لەبەشی دووەمدا کە تێیدا سایمۆندیس فیکرەی چاککردنی ستەمکاری وەکو سیستەمێك دەخاتە روو بەرمەبنای کۆمەڵێ پرنسیپ یاخود کۆمەڵێ پێشنیاری چاکسازی. لەم بەشەدا ژیانی ستەمکاری "رۆشنگەر" وا وێنا دەکرێت کە ژیانێکی بالادەستترە لەژیانی کەسانی تایبەت. کەسانی تایبەت مەبەست لەوکەسانەیە کە هیچ جێو مەقامێکیان لەبواری گشتیو مەدەنیو سیاسیدا نییە. هەرچی پەیوەندی پەیامی سەرەکی دایەلۆگەکەوە هەیە دەبێت ئەوە بزانین کە ئەم دایەلۆگە رووی

لەدەمی کێیە، لەستەمکارەکان یاخود پیاوانی خاوەن کردار؟ یاخود هەرکەسێك کە بیر لەبەشداریکردن لەبەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی شار (Polis) دەکاتەوە؟ ناتوانین ئالۆزی ئەم دایەلۆگە سادەبکەینەوە بۆ پەیامێك، بەڵکو ئەوەی نزیکترە لەراستییەوە ئەوەیە کەبڵێین ئەم دایەلۆگە فرەپەیامەو فرە نیازەو رووی دەمیشی لەکۆمەڵێك لایەنە، هەر لەستەمکارەکانەوە تاکو ئەوانەی دەیانەوێت لەبواری مەدەنیدا کاربکەن، تاکو ئەوکەسانەی گەرەکیانە لەستەمکاری وەکو سیستەمێك بگەنو بزانن کێشەکانی چییە.

زینۆفۆن لەم دایەلۆگەدا لەڕێو رەسمی "دایەلۆگە سوکراتیەکان"ی خۆی دەردەچێت، ئەو دایەلۆگانەی کە سوکرات تێیدا قسەکەرەو دەتوانین لەپەیامە سەرەکیەکەی دایەلۆگە لەرێگای ئەوەوە بگەین، وەکو دایەلۆگی "عوزرخوایی سوکرات"و دایەلۆگی "ئیکۆنۆ میکۆس"، لەدایەلۆگی" "هیرۆ یا تیرانیکۆس"دا سایمۆندیس کە هیرۆ پێماندەناسێنێ وەکو پیاوێکی حەکیم، سایمۆندیس کەسەکەیە کە ستەمکار دەجولێنێ قسەبکا، هەرئەوە سەردانی هیرۆی ستەمکاری کردوەو لەسەر سفرەی ستەمکارەکە پرسیار دەکا. هەر لەرێگەی سایمۆندیسیشەوەیە کە فیکرەی هونەری ستەمکاری دەخرێتە روو، ئەمەش خۆرزگارکردنە لە "دایەلۆگە سوکراتیەکان"و بگرە خستنە رووی فیکرەیەکە تەواو پێچەوانەی بۆچوونی سوکرات، هەر ئەمەشە کە وای لەزینۆفۆن کردوە لەجیاتی سوکرات سایمۆندیس هەڵبژێرێ وەکو هاو دایەلۆگی ستەمکارو ئەو کەسەی کە لەبەر هەرهۆیەك بێت، جا چ هۆی خودپەرستی بێت، خۆ بردنە پێشەوە بێت لەستەمکار یاخود بەڕاستی باوەڕی تەواوی بەڕاو بۆچوونی خۆی هەیە، ئەوکەسەی کە فیکرەی هونەری ستەمکاری دەخاتە روو. سوکرات بەشێوەیەکی موتڵەق ستەمکاری رەتدەکاتەوەو لێرەوە ناشێ ئەو قسەکەرە بێت لەدایەلۆگێکدا کە فیکرەی چاککردنی ستەمکاری لەسەر زمانی ئەوەوە بخرێتە روو. بەڵام ئایا سایمۆندیس حەکیمە؟ دواجار بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەگەرێینەوە. خاڵێك کە جەوهەرییە ئەوەیە کە پەیامی ئەم دایەلۆگە ئالۆزەو ناتوانین کورتی بکەینەوە بۆیەك رەهەندو لەوە بەولاتریشەوە ئێمە ناتوانین بڵێین مەبەستو نیازی خودی زینۆفۆن لەم دایەلۆگەدا ئا ئەمەیە، بۆ نمونە، ناتوانین بڵێین زینۆفۆن دژی ستەمکاری نەبوە، یاخود بڵێین سایمۆندیس زمانحاڵی زینۆفۆنە لەم دایەلۆگەدا، ناتوانین بڵێین فیکرەی هونەری ستەمکاری فیکرەی خودی زینۆفۆنە، لەلایەکی دیکەشەوە ناتوانین ئەم ئەگەرە بەتەواوی لەیادبکەینو تووڕی هەڵبدەینە ئەولاوە. هەر لەبەر ئەم ئالۆزیو سەنگینی فیکرەی هونەری ستەمکارییە کە زینۆفۆن ناوی خۆی ناهێنێت. لە دایەلۆگەکانی تریدا، زینۆفۆن یا بەناوی خۆیەوە

قسەدەكات وەكو لەدايەلۆگی "ڕێگاكانو هۆكارەكان Ways and Means" دا دەبينين، ياخود ناوی خۆی دەهێنێت، جگە لەدايەلۆگی ئيكۆنۆميكوس كە سەبارەت بە چۆنێتی بەڕێوەبردنی كاروباری ناوماڵە، واتە ئابوری. ئێمە وای دەبينين هۆی ناو نەهێنانی خۆی، بەئيحتمالی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ خستنەڕووی. فيكرەی "هونەری ستەمكاری"، واتە سەيكردنی چاككردنی ئەو سيستەمە وەكو هونەرێك لەپاڵ هونەرەكانی ديكەدا وەكو هونەری فەرمانڕەوايەتی كردن كە دايەلۆگی "پەروەردەی كوروش" لەو هونەرە دەدوێ. هۆی ناونەهێنانی نوسەر لەم دايەلۆگەدا وەكو گوتمان لەسەنگينی خودی فيكرەی چاككردنی ستەمكاری دايە وەكو فيكرەيەكی نا ـ سوگراتی. هەر لێرەشەوەيە دەتوانين كليلی ئەو نهێنييەمان دەست بكەوێ كە بۆچی لەجياتی سوكرات زينۆفۆن سايمۆنديسی شاعير هەڵدەبژێرێ وەكو كاراكتەرێكی ئەم دايەلۆگە، سوكراتی فەيلەسوف وانەی هونەری فەرمانڕەوايەتی كردن، هونەری سياسەت دەڵێتەوەو سايمۆنديسی شاعيريش ئەو هونەرە پێشنيار دەكا كە لەڕووی پلەوپايەوە هونەرێكی نزمترە لەهونەری سياسەت كە بريتييە لەهونەری ستەمكاری، واتە هونەرِی چاككردنی سيستەمێك بێ گۆڕانی جەوهەری، قبوڵكردنی سيستەمێك دوای هەندێ ئاڵو گۆڕو گۆڕان. سوكرات لەدايەلۆگی "Oeconomicus"دا كە دايەلۆگێكە لەنێوان سوكراتو ئەسينايييەكی تردا لەمەڕ كاروباری ئابورييەوە، قسە لەهونەرێك دەكا بەناوی هونەری شاهەنشاهی (Royal art) ئەويش هونەری بەڕێوەبردنی ناوماڵ (ئابوری)و هونەری بەڕێوەبردنی كاروباری شارە. لێرەدا سوكرات قسە لەديسپلينكردنی ئارەزووەكان دەكاو لەگوتنەوەی ئەم هونەردا سوكرات هيچ نيازێكی شەخسی نييەو تەنيا چاوی لەبەرژەوەندی گشتیو مەدەنی بڕيوە. بەڵام سايمۆنديسی شاعير قسە لەهونەرێكی ديكە دەكا كە لەڕووی ئەخلاقييەوە بەپلە دوو دێتو قسەيەكيش لەديسپلينكردنی ئارەزووەكان لەئارادا نييە. تۆ بڵێی هەر ئەمە جياوازی فەيلەسوفو شاعير، فەلسەفەو شيعر نەبێت، يەكێكيان باس لەديسپلينكردنی ئارەزووەكان لەلايەن عەقڵەوەو جلەو خۆشكردن تەنيا بۆ عەقڵو ئەوی ديكەيان ڕەهاكردنی ئارەزووەكان؟

دايەلۆگی "هيرۆ يا تيرانيكۆس" بەم شێوەيە دەست پێدەكا "سايمۆنديسی شاعير جارێك لەجاران هات بۆلای هيرۆی ستەمكار. دوای ئەوەی هەردوكيان حەوانەوە.." سايمۆنديسی شاعير لەبارەگای هيرۆی ستەمكاردايەو لەسەر سفرەی ستەمكار. عيبارەتی "دوای ئەوەی حەوانەوە" دەمانتوانی بەم شێوەيەش تەرجومەی بكەين "دوای ئەوەی كەيفو خۆشيانكردو خواردیانو خوارديانەوە.."

ئەوەی گرنگە سەرنجی بدەین ئەوەیە کە شاعیر لەسەر سفرەی ستەمکارەو نانی ستەمکار دەخواو هەر لەوێدایە کە دەحەوێتەوە، بوونی ئەو لەمەجلیسی ستەمکاردا کۆمەڵێك دەلالەتی خۆی هەیەو لەهەمان کاتیشدا سنور بۆ ئەو شتانە دادەنێت کە دەیانلێت یاخود ئەوشتانەی دەیانلێت بەهۆی بوونییەوە لەسەر سفرەی ستەمکار مەجرایەکی دیکە بەخۆوە دەبینن. گەر ئەم گفتوگۆیە، بۆ نمونە، لەئاگۆرادا، واتە بازاڕ یا فەزای گشتیدا ئەنجام بدرایە مەجرای قسەکان شێوەی دیکەیان بەخۆوە دەگرت گفتوگۆکە ئازادانەتر دەبوو، بەڵام لەسەر سفرەی ستەمکار ئەمە خۆی مانایەکی دیکەو دەلالەتێکی دیکەی هەیە. دوای خوێندنەوەی دایەلۆگەکە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوە سایمۆندیسە ئامۆژگاری ستەمکار دەکاو پێشنیاری چاککردنی رژێمەکەی دەکا، بەواتایەکی دی هیرۆی ستەمکار راوێژی بەسایمۆندیسی ژیرنەکردوە، هیرۆ رۆژێك بەخەیاڵیدا نەهاتوە کە ستەمکاری پێویستی بەچاککردنەو لێرەوە پێویستە ئەو راوێژ بە کەسێکی ژیری وەکو سایمۆندیسی شاعیر بکا، ئەوە سایمۆندیسی شاعیرە هاتوە بۆلای هیرۆو خۆبەخشانە لەهونەری ستەمکاری دەدوێ. گرنگی ئەم خاڵە لەوەدایە کە هیرۆ دواجار بۆ چوونی هەرچییەك بێت بەرانبەر بەستەمکاری ئەوە ئاشکرایە کە وێڵی رێگایەك یا شێوازێك نییە تاکو سیستەمەکەی چاك بکاو هەر بۆیەشە ئەو نەیناردوە بەدوای حەکیمێکدا یا نەچۆتە لای حەکیمێك تا راوێژی پێ بکا، بەڵکو ئەوە شاعیرە وا لەبارەگای ستەمکارداو هەر شاعیریشە، بەزمانی سەربازی قسان بکەین، سەرقاڵی دارشتنی ستراتیژیەتێکە بۆ نەك خەفەکردنی ستەمکاری بەڵکو چاککردنی ئەو سیستەمە. وێڕای ئەوەش کە ئەو لەبارەگای ستەمکاردایە، لەکۆمەڵێ شوێنی ئەم تێکستەدا هەست بەوە دەکەین کە هیرۆی ستەمکار گومان لەهەڵوێستی سایمۆندیس دەکا، تۆ بڵێی سایمۆندیس ئەجێندایەکی تری نەبێت لەودیو راوێژەکانیەوە؟ یاخود ئەمە سەرەتای دارشتنی تەقلیدێکە، تەقلیدی هەبوونی راوێژکار لەلایەن فەرمانڕەواوە، دارشتنی پەیوەندیەکە لەنێوان فەرمانڕەواو دارێژەرانی ستراتیژیەت، دیسکۆرس (گوتار) هەر لەسۆفستائیەکانی یۆنانی کۆنەوە تاکو "رۆشنبیران"ی ئەمرۆ لەژێر پەردەی شارەزایاندا؟

سایمۆندیس گفتوگۆکە بەپرسیارێك دەکاتەوەو بابەتی شوێنی گفتوگۆ سەرەتا بەراوردکردنی ژیانی ستەمکارو ژیانی کەسێکی تایبەتە واتە کەسێك لەدەرەوەی سیاسەتو کاروباری مەدەنی،و پرسیارەکەش ئەمەیە کە کامەیان، ژیانی ستەمکارانە یا ژیانی تایبەتی، زیاتر شوێنی ئاواتخواستنە؟ بەڵام بابزانین سروشتی ئەم پرسیارە چییە؟ پرسیارەکە سەبارەت بەدوو جۆر شێوازی ژیانەو بەرمەبنای

داوپێنگێکی ئیستاتیکی (جوانناسی)یە لەوەدا کە قسە لە "چێژ"و "ئازار"دەکا، دیارە چێژو ئازاری ژیانی ستەمکاری یاخود ژیانی کەسی تایبەت. سایمۆندیس ناپرسێ کە کامە ژیان راسترە، لەحەقیقەتەوە نزیکترە، چاکترە بۆ جڤات، بۆ شار، کامەیان سیاسیانەترە، مەدەنیانەترە، بگرە جڤات لەدەروەی لەبەرچاوگرتنەکانە، پرسیار لەچێژو ئازاری شێوازێکی تایبەتی ژیانە، کامەیان لەو دووجۆر شێوازە ژیانە چێژبەخشترە یا ئازاری زۆرترە ژیانێکی ستەمکارانەی کە ستەمکاردەژی یا ژیانی کەسێکی تایبەت. هیرۆی ستەمکار لەپرسیارەکەی سایمۆندیس سەری سوڕ دەمێنێ، هۆکەی ئەوەیە کەسایمۆندیس لێرەدا بەحەکیم ناوی هاتوە، ئایا هۆی چییە کە نازانێ ژیانی ستەمکار ژیانێکی کلۆڵانەیە، هەر ئەمەشە وادەکا لەناواخنی ئەم تێکستەداو لەهەڵوێستی هیرۆوە ئێمە لەوە بگەین کە هیرۆ بەگومانە لەهەڵوێستی سایمۆندیس، ئاخر چۆن بەگومان نەبێت کە لەلایەکەوە ئەو راستییە نابینێت کە ستەمکار بەختەوەر نییەو لەلایەکی دیکەوە لەکێشەی ستەمکاریدا لەژیانی ستەمکارو چۆنێتی ئەو ژیانەوە دەست پێدەکات، کەواتە یاسایمۆندیس ژیر نییە یاخود مەرامێکی هەیە کە بەلانی کەمەوە لەدایەلۆگەکەدا مەرامەکانی دیکەی سایمۆندیس شاراوەبن ئەو مەرامە ئاشکرایە کە سایمۆندیس گەرەکیەتی وانەیەك بە هیرۆی ستەمکار بڵێتەوە لەمەڕ هونەری ستەمکارییەوە. رەنگە وەك شاعیرێك بیەوێ وەڵامی چاکەیەکی هیرۆ بداتەوە بەگوتنەوەی وانەیەك لەمەڕ چاککردنی ستەمکارییەوە، لەمەڕ چۆنێتی حوکمکردنەوە وەك ستەمکارێك بەڵام ئەمجارە وەك ستەمکارێکی خۆشویستراو. بەڵام سایمۆندیس واگفتوگۆکە دەست پێدەکا وەکو ئەوەی کە ئەوکەسەی دەبێت فێربێت خودی سایمۆندیسە نەك هیرۆ واتە سایمۆندیس دەیەوێت لەهیرۆوە فێربێت، هەرئەمەشە ئایرۆ نییە کە (موفارەقەکە)، واتە حەکیمێك کە مەبەستیەتی وانەیەك بەستەمکارێك بڵێتەوە داوا لەستەمکار دەکا تاکو جیاوازی نێوان دوو جۆر ژیانی بۆ دیاری بکا، بەواتایەکی دی مەبەستیەتی لێوەی فێربێت.

سایمۆندیس لەسەرەتادا لەو بۆچوونەوە دەست پێدەکا کە پێی وایە ژیانی ستەمکاری بالاترو چێژ بەخشترە، ئەمەش بۆچوونی زۆربەی خەڵکییە، بەڵام دیارە بۆچونێکی حەکیمانە نییەو بەدوورە لەحیکمەتەوە، جا ئەمە تاکتیکە یاخود بەڕاستی سایمۆندیس رای وایە ئەمە پرسیارێکی دیکەیە. گەر بڵێین سایمۆندیس رای وایە کە ژیانی ستەمکاری چێژبەخشترە ئەوا ئەو لەحەکیم بوون دەکەوێ، پێدەچێ شێوازێك بێت تا لەرێگەوەی هیرۆ هانبدا قسان بکاو دواجار مەرامە سەرەکیەکەی کە گوتنەوەی وانەی هونەری ستەمکارییە بەیان بکا. لەهەموو حاڵەتەکاندا

سایمۆندیس کارێك دەکا کە هیرۆ قسان بکاو ئەو بۆچوونەی زۆر بە (کۆمەڵانی خەڵك) رەت بکاتەوە، سایمۆندیس هیرۆ ناچار دەکا هەموو کەموکورپییەکانی ستەمکاریو ژیانی ستەمکار بخاتە روو. بەلانی کەمەوە لێرەدا ژیرێتی سایمۆندیس بەدیار دەکەویٚ. وەکو گوتمان هەقمانە بەگومان بین لەحەکیم بوونی سایمۆندیس، بەڵام بەمانایەکی دیکەی ژیرێتی، واتە زۆرزان، سایمۆندیس ژیرە. سایمۆندیس لەپێستی جاهیلێکدا خۆی دەشارێتەوەو لەرێگای خستنەرووی ئەو بۆ چوونەی عەوامەوە کە دەڵێت ژیانی ستەمکار باڵادەستترە هیرۆ ناچاردەکا سروشتی ستەمکاری یەکالابکاتەوە.

هیرۆ لەکاتی خستنەرووی راستی ژیانی ستەمکاردا هەر لەسەرەتاوە پیٚ بزانیٚ یا نەء کێشەیەکی فەلسەفیمان بۆ یەکلایی دەکاتەوە ئەویش رۆڵی هەستەکان لەکەشفکردنی حەقیقەتدا. کاتێك کە سایمۆندیس باس لەهەستەکان دەکا وەکو بینین، بیستن، بۆ نکردنو هتد، و دەڵێت "چێژ لای ستەمکار چەندین جار رێژەی زیاد دەبێت لەرێگای هەریەك لەو هۆکارانەوەی کە ئاماژدەمان پێدان، هەروەها ستەمکار خاوەنی ئەوشتانەیە کە کەمتر ئازار بەخشن"، سایمۆندیس لەرووکەشدا باس لەهەستەکان دەکا وەکو هۆکارێك کەلای ستەمکار مایەی هێنانی بەختەوەرین، بەڵام لەجەوهەردا کێشەیەکی دیکەی فەلسەفی فرە رەهەند دەخرێتەروو ئەویش پەیوەندی هەستەکانو بەختەوەری، رۆڵی هەستەکان لەکەشفکردنی حەقیقەتداو..هتد. هیرۆ دوو رەهەندی ئەو کێشەیەمان بۆ یەکلایی دەکاتەوە، یەکەم ئەوەی کە هەستەکان وەکو هۆکارێك لەژیانی ستەمکاردا مایەی هێنانی بەختەوەری زیاترنین ئەمەش لەبەرئەو کۆمەڵە هۆیانەی کەباسیان دەکاو هەرهەموو پەیوەندیان بەسیستەمی ستەمکاریو جیٚو مەقامی ستەمکارەوە هەیە، و دووهەم نیشاندانی ئەو راستییەی کە هەستەکان ناشێت پشتیان پیٚ ببەستین بۆ زانینی جەوهەری ستەمکاری، حەقیقەتی ستەمکاری شتێکەو هەستەکانیش وێنەیەکی دیکەمان دەربارەی ستەمکاری لادروست دەکەن کە شتێکی تەواو جیاوازە. ئەمەش ئەو کێشە ئیبستیمۆلۆژییەیە کە فەلسەفە لەمێژووی خۆیدا دەستو پەنجەی لەتەکدا نەرم کردوە. هیرۆ نەك ئەرگومێنتەکەی، وێنەکەی سایمۆندیس یا زۆربە هەڵدەوەشێنێتەوە لەپەیوەندیدا بەرۆڵی هەستەکانو ژیانی ستەمکارەوە، بەڵکو بەپەنهانی بەسایمۆندیسیش دەڵیٚ کە ئەو وێنە رووکەشەی هەستەکان لەمەڕ ستەمکارییەوە دەیکێشن وێنەیەکی دروست نییەو بەدوورە لەحەقیقەتی ستەمکارییەوە. (دواجار دەگەڕێینەوە سەرکێشەی هەستەکان).

هیرۆ لەکاتی خستنەرووی راستی ژیانی ستەمکاردا باس لەترسی ستەمکار دەکا لەپیاوی دلێرو عادلو ژیر (بەشی پێنجەم، ١و٢). ستەمکار لەپیاوی دلێر دەترسیٚ

چونکی پیاوی دلێرو جوامێر ریسك بەژیانییەوە دەکا لەپێناو ئازادیداو کۆیلایەتی قبول ناکاو ئنجا کۆنترۆڵیش ناکردرێت. ستەمکار لەپیاوی عادل دەترسێ چونکی وەکو هیرۆ دەڵێ رەنگە خەڵکی یا زۆربە هۆشیار ببنەوەو بیر لەوەبکەنەوە کە چاکترە لەلایەن کەسی عادلەوە فەرمانڕەوایەتی بکردرێن، واتە لەهەردوو حاڵەتەکەدا ستەمکار لەکاراکتەرو خاسیەتەکانی ئەو دوو تایپە دەترسێ، تایپی دلێرو تایپی عادل، دلێریو عەدالەت، کە ئەم قسەیەی هیرۆ جەوهەری ستەمکاری دەردەخا کە رژێمێکە دژ بەئازادیو دژ بەعەدالەتو رژێمێکە ئەوکەسە بەدوژمنی خۆی دەزانێ کەباس لەئازادیو عەدالەت بکاو رژێمێکیشە لەدواجاردا لەسەر دەستی عەدالەتخوازو ئازادیخوازەکاندا کۆتایی پێ دێت، گەر کۆتایی پێبێت، رژێمێکە نەك ترس تێیدا فەرمانڕەوایە بەڵکو ترسنۆك بەرهەمدەهێنێ. لێرەوە ترسی هیرۆ لەکەسانی دلێرو عادل ترسی ستەمکارێك نییە بەڵکو ترسی ستەمکارییە لەعەدلو ئازادیخوازی. بەڵام ئەی ترس لەحەکیم یا حیکمەت (Wisdom) لەم رەوتەدا چ مانایەکی هەیە؟ بێ ئەوەی بچینە پێچ پێچەکانی ئەم کێشەیەوە دەتوانین بڵێین کە ترسی گەورەی هیرۆ لەحیکمەت ئەوەیە کە حیکمەت خۆی دەستەڵاتێکە سنور بۆ دەستەڵاتی ستەمکار دادەنێ. حیکمەت، هەرچی پەیوەندی بەفەرمانڕەوایەتی کردنەوە هەبێت، کۆمەڵێ پرنسیپە (Principles) کە لەناواخنیدا هەم دلێری لەخۆدەگریو هەم دژایەتیکردنی کۆیلایەتیو هەم عەدالەت لەخۆدەگرێ، بگرە عەدالەت جەوهەری حیکمەتە، لێرەوە حیکمەت هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ سەر ستەمکاری. ئێمە لێرەدا لەگەڵ تەفسیری پرۆفیسۆر شتراوسدا یەك ناگرینەوە کە لەلێدوانیدا لەسەر ئەم دایەلۆگە عەدالەتو دلێری لێك جیادەکاتەوە، بەڕای ئێمە حیکمەتێك بوونی نییە بێ دلێریو بێ هەستی عەدالەت، هەر ئەمەشە بۆچوونی ئەرستۆ لەکتێبی "ئەخلاقی نیکۆماخی"دا. بەدگومانی بەرانبەر بەحەکیمو حیکمەت چ لەلایەن ستەمکارانەوەبێت یا خەڵکی عەوام لەڕاستیدا قسە لەخاڵێکی گرنگ دەکا ئەویش ئەوەی کەحیکمەت خۆی جۆرێکە لەدەستەڵات، مەبەستو نیازی مەعریفەیە، مەقامێکە، حاڵەتێکە کە بۆ هەموو کەس نییەو گەیشتن پێی ئاسان نییە،و نیازو مەراهیش لەحیکمەت خودی حەقیقەتەو هەر لێرەشەوە چ حیکمەتو چ حەکیم دەبنە شوێنی گومان لەلایەن ستەمکارانو بازاڕییەکانەوە شایانی لێتێگەیشتنە کە دەبینین ترسی گەورەی هیرۆ لەئینسانی حەکیمە، نەك لەبەرئەوەی کە حەکیم بیەوێ جێی ستەمکار بگرێتەوە، نەك لەبەرئەوەی وەك کەسی دلێر ریسك بەژیانییەوە بکا لەپێناو ئازادیدا، بەڵکو بوونی حەکیمو حیکمەت خۆی دانانی پرسیارە لەبەردەم ستەمکاریدا، داوپێنگەکانی ئینسانی حەکیم جیاوازنو بەهیچ شێوەیەك شوێنێك بۆ سازش لەگەڵ ستەمکاری

ناهێڵنەوە. لای ستەمکار نیازو مەرامی کەسی دلێرو کەسی عادل ئاشکرایە بەڵام نیازو مەرامی کەسی حەکیم ئاشکرا نییە ئەوەندە نەبێت کەستەمکاری لەلایەن حیکمەتەوە شایانی قبوڵکردن نییە. لێرەدا شوێنی خۆیەتی جارێکی دی گومان بکەین لەوەی کە سایمۆندیس بەڕاستی حەکیمە، چونکی هەر لەسەرەتاوە وا دەدوێ وەك ئەوەی ئەو بۆچونەی قبولْ بێت کە ژیانی ستەمکاری شوێنی ئاواتخواستنە. لێرەدا هیرۆ هەقیقەتی گومان لەسایمۆندیس بکاو ئێمەش هەقمانە بپرسین ئەمە چ جۆرە حیکمەتێکە؟ شتراوس لەم ڕەوتەدا باس لەدووجۆر حیکمەت دەکاو ناونانی حیکمەتی سایمۆندیسیش جێدەهێڵێ بۆ ئێمە، حیکمەتی سۆفستائیو حیکمەتی ناسۆفستائی کە دەشێ ناوی بنێین حیکمەتی سوکراتی[٤] . ئینسانی حەکیم، بەقەولی شتراوس، "جەنتلْمانەو سۆفستائیش کۆیلەیەو بازاڕی". ئێمە وای دەبینین کە ئینسانی حەکیم ئینسانێکی جەنتلْمانە نەك مل نانێت بۆ ستەمکاری بەڵکو تاکە سامو هەیبەتێکە کە ستەمکاری لەبەردەمیدا بسلْەمێتەوە، سۆفستائیش ئەو کەسە بازاڕییە کە نەك بەتەنیا مل بۆ ستەمکاری دەنێ بەڵکو بەهانە بۆ ستەمکاری دەهێنێتەوەو لەتەك هەموو ڕژێمەکاندا هەڵدەکا. جەنتلْمان خاوەنی پرنسیپە، سۆفستائی نەك پرەنسیپی نییە بەڵکو بانگەشە بۆ کەیاس (ئاژاوە)و بەزمانی مۆدێرن "فەوزەویەت" دەکاو مشەخۆرێکە لەسەر کەیاس دەژیو هەمووشت لای ئەو دەڕوا جگە لە حەقیقەت.

ترسی هیرۆی ستەمکار لەحیکمەت لەراستیدا لەوێدایە کە ئەو لەحیکمەت تێناگا، حیکمەت لای ئەو موعەمایە، ئەو لەدلێریو ئینسانی دلێر تێدەگا، ئەو لەنیازی ئینسانی عادلو لەعەدالەت تێدەگا، تێدەگا کە عەدالەت پێچەوانەی ستەمکارییە، بەڵام چونکی ئەزموونی حیکمەتی نییە لەحیکمەت تێناگاو هەرلێرەشەوە حیکمەت مەترسییە گەورەکەیە بۆ سەرخۆی وەك ستەمکارێكو بۆ سەر ڕژێمەکەی کە ستەمکارییە. هەموو شتێکی نادیار شوێنی مەترسییە، بەڵام حیکمەت تەنیا شتێکی نادیار نییە کە ڕەنگە ڕۆژێك بەدیار بکەوێ، بۆ هەمیشە حیکمەت بۆ بازاڕییەکانو شاعیرەکانو ستەمکارەکان ئەو موعەمایەیە کەشوێنی مەترسییە، چونکی لەگەلْ دەرکەوتنی یەکەم پریشکی حیکمەتدا بازاڕییەکانو شاعیرەکانو ستەمکارەکان بەشەوارە دەکەون. ڕەنگە بشێ ڕای جیاوازمان هەبێت بەرانبەر بەژیرێتی سایمۆندیس، بەڵام دەشێت هەموو لەسەر ئەو خاڵە کۆك بین کە سایمۆندیس بەژیرێتی خۆی هیرۆ ناچار دەکا کە کەمو کوڕییەکانی ستەمکاری بدرکێنێو تاڵترین ڕاستی دەرك پێ بکا ئەویش ئەوەی "شارەکان بەڕێزەوە لەبکوژانی ستەمکارەکان دەڕوانن".

لەبەشی یەکەمدا سایمۆندیس ئاماژدە بەهەشت جۆر لەچێژو ئازاردەکا کە ڕەنگە وابکەن ستەمکاری شوێنی ئاواتخواستن بێت، لەوانە بینین، دەنگەکان، سێکس‌و هتد.. هیرۆش یەك بەیەکی ئەو ئەرگومێنتانە پووچەڵ دەکاتەوەو هەرچی پەیوەندیشی بەسێکسەوە هەبێت (لێرەدا قسە لەسەر پرنسیپی چێژە) ئەو رای وایە کە ستەمکارەکان لەم روەشەوە لەمەوقعێکی خراپدا خۆیان دەبیننەوە چونکی ستەمکارەکان بێ بەشن لەعەشق. تائێرە دایەلۆگەکە لەدەوری دوو بۆچوون دەسوڕێتەوە، یەکێکیان کە سایمۆندیس دەریدەبڕێ‌و بۆ چوونێکی بازاڕییەو وا لەستەمکاری‌و هۆکانی ستەمکاری دەڕوانێ کە چێژە بەدەنییەکان، لەوانە سێکس، ئەو هۆیانەن لەپشت، ستەمکارییەوە، دووەمیان بۆچوونی هیرۆیە کە بەپێی ئەرگومێنت خاڵ بەخاڵی بۆچوونی یەکەم بەتاڵ دەکاتەوەو بۆچوونێکە دەڵێ: ستەمکار دابڕاوە لەهەموشتی چاك‌و بەچێژ، چێژی جەنگ، مانای قوڵی هاوڕێیەتی، بڕوا، وڵات، هامشۆکردنی پیاو چاکان، نەبوونی عەشق، لەجیاتی ئەوە لەترسێکی هەمیشەییدا دەژی، ناچارە تاوان لەسەر تاوان ئەنجام بدا تاکو دەستەڵاتی بپارێزێ‌و گەر کوژراش خەڵکی ڕێزێکی زۆر بۆ بکوژەکەی دادەنێن، گرنگ ئەوەیە کە ئەمە ستەمکارەو لەجەوهەری ستەمکارانەی رژێمەکەی دەدوێ تائێرە تاکتیکی سایمۆندیس بەچاکی ئیشی کردوە، بەمانایەکی دی، ئەو خاڵەی کە سایمۆندیس چاوی لێبڕیوە ئەوەیە کە ژیانی ستەمکاری دەبێتە مایەی بەدەست هێنانی دەستەڵات‌و سامان، بەڵام لەچێژە بەدەنیەکانەوە دەست پێدەکا تاکو هیرۆ ناچار بکا ئەو بەڕەتکردنەوەی ئەو بۆچوونە هەڵبستێ‌و ئیدی ئەوەی دەمێنێتەوە بیستنی هۆ سەرەکییەکانن یا پاڵنەرە سەرەکیەکانی کە لەپشت ستەمکارییەوە بونیان هەیە. ئەگەر چێژە بەدەنیەکان پالنەر نەبن لەودیو کەلکەڵەی ستەمکاریەوە، ئەی پاڵنەری سەرەکی چییە؟ سایمۆندیس دوای بێدەنگییەك کە خۆی لەم تێکستەدا بێدەنگییەکە زۆرتر لەهەر رستەیەك یاگوزارەیەکی دیکە دەدوێ، ئایدیایەکی دیکە دەخاتە روو بۆ تاقیکردنەوە ئەویش ئایدیای (honor)ە، شەرەف‌و ڕێزو ناوو ناوبانگ، واتە ئەو چێژەی کە ڕێز بۆ دانان‌و ناو و ناوبانگ‌و شەرەف دەیبەخشێ وەکو پاڵنەرێك بۆ بوون بەستەمکار. سایمۆندیس پێی وایە کە هیچ چێژێك نییە بالاتر لەچێژی بەدەستهێنانی ڕێزو شەرەف‌و جێ‌و مەقام‌و ناوبانگ. تەنیا ئەم چێژە ئینسانییە کە دەتوانێت نزیك بێتەوە لە خودایەتیەوە (Divinty)، ستەمکارەکان شوێنی شکۆو ڕێزدانانن لەهەر کەسێکی دیکە زیاتر. لەمەزیاتر، ئەو دەڵێت ئینسان بەهۆی بوونی هەستکردن، چێژ وەرگرتن لەشەرەف‌و ڕێزو ناوو ناوبانگ لەئاژەڵ جیا دەکرێتەوە. با لەسەر ئەم خاڵە کەمێك بوەستین.

کۆژیف لەوتارەکەیدا (ستەمکاریو حیکمەت) لەسەر کتێبەکەی شتراوس کە دواجار لەدوو توێی کتێبێکدا چاپ دەبنەوە، ئایدیای شەرەفو ناوو ناوبانگ لەم دایەلۆگەدا دەبەستێتەوە بەهاوکێشەی سەروەرو کۆیلەوە لای هیگڵ، کە بەڕای ئێمە هەوڵێکی مانادارەو لەشوێنی خۆیدایە بەڵام ئەوەی کە ووتارەکەی (کۆژیف)ی لاواز کردوە لەلایەکەوە پێ داگرتنی کۆژیڤە لەسەر کۆتایی هاتنی مێژوو سەرهەڵدانی "دەوڵەتێکی موتەجانسسی گەردوونی" و لەلایەکی دیکەوە سادەکردنەوەی خودی فەلسەفەی هیگڵ (قسەکردن لەسەر کۆژیف کێشەیەکی دیکەیەو لێرەدا بواری درێژەدان بەم خاڵە نییە).

گەر لەدیدی هیگڵەوە بڕوانینە کێشەی شەرەفو ناوو ناوبانگ ئەوا دەبێت بڵێین ئەمە خاسیەتی هەموو ئینسانێك نییە بەڵکو خاسیەتی سەروەرەکانە (Masters)، واتە ئەوە تەنیا سەروەرە کە لەبیری شەرەفو سومعەدایەو لەپێناویدا ئامادەیە بمرێ. گەر خوێندنەوەیەکی هیگڵی بۆ گوزارەکەی سایمۆندیس بکەین ئەوا دەبێت لەفیکرەی ئارەزووەوە دەست پێ بکەینو سومعەو شەرەف وەکو ئارەزووی ئارەزوەکان سەیربکەین[٥] . بەپێی خوێندنەوەیەکی هیگڵی دەتوانین بڵێین کە ئارەزو ئەو شتەیە کە بوون دەگۆڕێ، لەحاڵەتێکی سروشتییەوە بۆ حاڵەتێکی باڵاتر، خۆی بۆ خۆی بەیاندەکا لەمەعریفەدا، واتە وەك بابەت خۆی بۆ زاتێك بەیاندەکا. لێرەوە مرۆڤ لەرێگەی ئارەزووەوە دروست دەبێت (لەبیرمان بێت ئەمە بەپێی خوێندنەوەی هیگڵی) خۆی بەیان دەکا بۆ خۆیو ئەوانی دیکە وەك "من". "من" بریتییە لەمنی ئارەزوو. ئارەزوو مرۆڤ پاڵ پێوەدەنێ بۆ کردار (Action)، کرداریش خودبەخود فیکرەی (نەفیکردنەوە) یاخود وێرانکردن لەخۆ دەگرێ. تێرکردنی ئارەزوو پێویستی بەکردارەو کرداریش وێرانکردنو بیناکردنەوەیەو هەر ئەمەشە واقیعی خودێتی (subjectivity). بۆ ئەوەی خود (زات) هۆشیاری هەبێت بەناچاری دەبێت ئارەزوو چاو لەشتێکی ناسروشتی ببڕێت ئەمەش هیچ نییە جگە لە خودی ئارەزوو، واتە ئارەزوو ئاراستەی ئارەزوویەکی دیکە دەکرێتو ئەمەش لەڕێگای نەفیکردنو توانەوەی کردارەوە کە دەبێتە مایەی تێرکردنی ئەو ئارەزووە، لێرەوە منێکی دی دروست دەبێت. بەڵام مادامێك ئارەزوو لەڕێگای کردارەوە دێتە دی، کەواتە خودی "من" هیچ نییە جگە لەکردار. ئارەزووی مرۆڤ ئاراستەی ئارەزوویەکی دیکە دەکرێ، کەواتە لێرەدا قسە لەفرەیی ئارەزووەکان دەکەین، مەبەستیش لەئینسانەکانە، لێرەوە ئارەزوو ئاراستەی بەدەستهێنانی ئارەزووی ئەوانی دیکە دەکرێت، واتە بەدەستهێنانی ئارەزووی ئەوی دیکە بۆ خۆ. لەم هاوکێشەیەدا ئارەزوو کە چاو لەئارەزووی ئەوی دیکە دەبڕێت ئەمەش واتە دەست

بەسەراگرتنی ئارەزوی ئەوی دیکە، واتە بەدەستهێنانی ددان پێدانان (Recognition) یاخود بوون بەشوێنی عەشق، خۆش ویستن لەلایەن ئەوی دیکـەوە (to be desired) یاخود بەدەستهێنانی سومعەو شەرەف کە ئارەزووی ئارەزووەکانە. تەنانـەت شـتو مەکی مـادی کە لـەخۆیدا مانایـەکی نییـە کـە ئـارەزوو دەکرێ بۆ ئەوەیە چونکـی ماتـەریالّی ئارەزووەکـانی دیکەیـە. ئـارەزووی ئینسـانی بۆ ئـەوەی ببێتـە ئینسـانی دەبێت ئـارەزووە ئاژەڵییـەکان بـەجێ بـهێڵێو لـەودیو ئـەو ئارەزووانـەوە ئـارەزووی ئینسان بکاو ئەمەش ریسك ئامێزە بەڵام هەر ئەم ریسکەشە بەپێی هیگڵ کە ئینسان دەکـا بەئینسـانو واقیعـی ئینسـانی لیٚ دروسـت دەکرێت. ئینسـان دەبێتـە ئینسـان لەرێگای ریسککردنیەوە بەژیانییەوە بۆ بەدەست هێنانی ئـارەزووی ئینسـانی، واتـە ئارەزووی ئاراستەی ئارەزوویـەکی دیکـە دەکرێت، ئەمـەش واتـە جێگۆڕکـێ کردنـی ئارەزوویەك (ماتەریالیەکان) بەئارەزوویەکی دیکە کە ئارەزووی ئەوی دیکەیە. "من" ئارەزوودەکەم کە "ئـەو"ی دیکـە ددان بـە بـەهاکانی مندابنـێ، یـاخود مـن ئـارەزوو دەکەم، بێگومان ریسك بەژیانمەوە دەکەم، تا ئەوی دی لەمندا "سەرچاوەی شـکۆو دەستەڵات ببینێتەوە". لێرەوە هەموو ریسکی ئینسـانی، لـەم دیـدەوە، بریتییـە لـە بەدەست هێنانی ئەو ددان پێدانانەو قسەکردنیش لەخود هۆشیارییە، واتە قسەکردن لەسـەر ئـەو شـەڕەیە لەسـەر ددان پێدانـان، شــەڕێك لــەپێناو هەیبــەتو ســومعەو شەرەفدا، کە بەڕای هیگڵ بیٚ ئەم شەڕە تامردن لـەپێناو سومعەدا شتێك نـەدەبوو بـەناوی واقیعــی ئینســانییەوە. ئینســان لــەو ئــارەزووە دروســت بــوە کــە چــاو لەبەدەسـتهێنانی ئـارەزووی ئـەوی دیکـە دەبڕێ. لـەم جەنگـە خوێناویـەدا یـەکێك ئامادەیی ریسك کردنی هەیەو ئارەزووی سومعەو شەرەفـو ددان پێدانـانی دەکـا لـە ئەوی دیکەو یەکێکی دی دەترســێو ریسـك ناکـاو لـەدواجاردا مـل کـەچ دەکـاو ددان بـەجێو مـەقامو دەسـتەڵاتو هەیبـەتی ئـەوی دیکــەدا دەنێـتو دەسـت بـەرداری ئارەزووی بەدەست هێنـانی ئـارەزووی ئـەوی دیکـە دەبێـت، واتـە دەسـت بـەرداری "ددان پێدانان" دەبێتو ددان بەئەوی دیکە دادەنێتو بیٚ ئەوەی ددانی پێـدا بـنرێ (without being recognized) ددانـنـان بەئــەوی دیکــەدا واتــە ســەیرکردنی وەکــو سەروەرو کردنی خۆ بەکۆیلـە. یـەکێکیان هۆشـیارییەکی سـەربەخۆیە، واتـە واقیعـی جەوهەری لای ئەو بوونە بۆ خۆی، ئەوی دیکە هۆشـیارییەکی نـا سـەربەخۆیە (واتـە سەر بەکەسێکی دی هۆشیارییەکی دیکەیە) واتە واقیع لای ئـەو بریتییـە لـەبوون بـۆ کەسێکی دیکە کەسی یەکەم سەروەرە،و ئەمەی دوایی کۆیلەیە.

هیرۆ ئەوە بۆ سایمۆندیس روون دەکاتەوە کـە سـومعەو شـەرەفێك کـە سـتەمکار بەدەستی دەهێنێ سومعەو شەرەفێکی رەسەن نییـە چونکـی سـەرچاوەکەی ترسـە

"خزمەتێك كە بەرئەنجامی ترس بێت ناشێ بەرێزو شەرەف لەقەڵەم بدرێت" بەڵكو جۆرێكە لە كۆیلایەتی. كەواتە كرداری كۆیلە ناتوانێ سەروەر رازی بكاو لەم حاڵەتەدا ستەمكار، گەر هیگڵیانە لەمەسەلەكە بڕوانین دەڵێین، هەر ئەمەشە تراژیدیای سەروەر، هەر ئەمەشە چارەنوسی جەنگی بەدەست هێنانی سومعەو دەستەڵاتو ئارەزووی ددان پێدانان كە لەدواجاردا سەروەر خۆی لەبەردەمدا دەبینێتەوە. بۆ ئەم حاڵەتە تراژیدییە؟

لەجەنگی سەروەرو كۆیلە بۆ بەدەست هێنانی ددان پێدانانو سومعەدا، سەروەر تەنیا كەسێك نییە كە خۆی بەسەرەوەر بزانێ بەڵكو كۆیلەش واسەیری دەكاو كۆیلەش خۆی بەكۆیلە دەزانێ (چونكی شەهامەتی ریسك كردنی بەژیانەوە نییە،و ئنجا لەچاوی سەروەریشەوە بەكۆیلە سەیر دەكری). راستە سەروەر ددان بەكەرامەتی ئینسانیدا دەنرێ بەڵام ئەم ددان پێدانانە لەلایەن كەسێكەوەیە كە ئەم، واتە سەروەر، ددان بە ئەودانانیو لەلایەن كەسێكەوەیە كە شایانی ئەوە نییە، لەمەوقیعی ئەوەدا نییە كە ددان بەكەسدا بنێو بگرە چونكی ئازاد نییە، سەروەرنییە، شەهامەتی سەروەرانەی نییە، ددان پێدانانەكەی مانایەكی نییە، هەر ئەمەشە تراژیدیای سەروەر، واتە لەدواجاردا لەلایەن كەسێكەوە بەبەرێزو خاوەن شكۆ لەقەڵەم دەدرێ كە كۆیلەیە، هەر ئەمەشە مەغزای قسەكەی هیرۆ، هەرئەمەشە كە هیرۆ دەیەوێت بەئازارێكی زۆرەوە تەعبیری لێبكا وەك ئەوەی بڵێ "من چی بكەم لەناوو ناوبانگێك كە لەلایەن كۆیلەكانەوە بەدەستی دەهێنم". هیرۆ چاك دەزانێ كە ئەوەی خەڵكی یا رەعیەتەكەی لێی دەترسن، ئەوەی كە ستەمكاری لەسەر ترس بەندە، كرۆكی تراژیدیای ستەمكارو ستەمكارییە. ئەو چاو لەوكاتە دەبڕێ كە خەڵكی بەسەرچاوەی ئەتۆرەتی (دەستەڵات)ی بزانن، بەڵام ئەم سەیركردنە سەرچاوەكەی ترس نەبێت، ددان پێدانان بەدەست بهێنێ بەڵام ئەم ددان پێدانانە سەرچاوەكەی ترس نەبێت، لەكەسانێكەوە نەیەت كە ترسنۆكنو لەترسی ژیانیان ئامادەن هەموو جۆرە درۆیەك بكەنو ددان پێدانانێك لەئەمانەوە مانایەكی نییە، ئەوكەسەی شەهامەتی نەبێتو بەرێزەوە سەیری خۆی نەكاو سومعەی نەبێت ناشتوانێ بەكەسی دیكەی ببەخشێ (مەسەلە عەرەبییەكەی دەڵێ "فاقد الشیئ لایعطیه") (ئەو كەسەی شتێكی نەبێت ناتوانێ بیدا). هیرۆ ددان بەو راستییەدا دەنێ كە فەشەلی هێناوە چونكی تەنیا لەرێگەی هێزو ترسەوە، كە جەوهەری ستەمكارییە، توانیویەتی كارێك بكا خەڵكی قبووڵی بكەنو هەرچیەكیش دەیبیستێ لەستایشو پێدا هەڵدان مانایەكی نییە چونكی لەرەعیەتێكی تۆقیوو ترساو بێ شەهامەتەوە دێتەدەرێ. بەڵام ئەوەی كەهیرۆ لەیادی دەكا ئەو خاڵە جەوهەرییە كە ئەوەی ئەو باسی دەكا

کرۆکی ستەمکارییە، ستەمکاری چییە گەر کەسێك، دەستەیەك، خۆی یا خۆیانو دیدو بۆچوونیانو کردارەکانیان بەسەر زۆربەدا نەسەپێننو بۆ سەرگرتنی ئەم هەوڵەش ترسو تۆقاندن وەك چەك بەکار نەهێنن بێ ئەوەی حیسابێك بۆ دیدو ئارەزووی زۆربە بکەن؟ ستەمکاری بریتییە لەفەرمانڕەوایەتیکردنێك بەسەر کەسانێکدا کە هیچ دەستەڵاتێکیان نییە لە هەڵبژاردنی ئەو سیستەمەدا،و جۆرە فەرمانڕەوایەتیکردنێکە بێ یاسا، یا لەدەرەوەی یاساو عەدالەتو تەنیا ئیرادەی ستەمکارە کە بریتییە لەکۆی یاساو دەستەڵات. کەواتە حوکم کردنێکە بەسەر رەعیەتێکدا کە لەمرۆڤ بوون کەوتوونو ئامادەی هەموو فەرمانێکن. مەبەستی سایمۆندیس لەفیکرەی "هونەری ستەمکاری" گۆڕینی ئەم حاڵەتەیە لەقبوڵنەکردنی ستەمکارییەوە لەلایەن خەڵکییەوە بۆ قبوڵکردنی دوای هێنانەدی چەند گۆڕانکارییەك. ستەمکاری حوکم کردنێکە لەدەرەوەی یاساو بزربوونی یاساش واتە نەبوونی ئازادی، ئازادی بوونی نییە لەغیابی یاسادا.

گەر شەرەفو ناوو ناوبانگ خاڵێکی جەوهەری بێت لای سایمۆندیسی شاعیر ئەوا عەشق خاڵێکی جەوهەرییە لای هیرۆی ستەمکار. هیرۆ دەیەوێت خۆش بویستریێو دادو بێدادیەتی لەوەی کەبێبەریە لەعەشق، لەخۆشەویستی لەلایەن کەسانی دیکەوە. لێرەدا زینۆفۆن خاڵێکی جەوهەری ستەمکاریمان بۆ بەیان دەکا ئەویش ئەوەی کە ستەمکارەکان تەنیا بەداگیرکردنی دەستەڵات ناوەستنەوە، بگرە داوای ئەوە دەکەن کە خۆش بویسترێن لەلایەن هەموانەوە، بەواتایەکی دی لەپشت ستەمکارییەوە ئیرۆسێك (Eros) لەکاردایە. لێرەدا زینۆفۆنو ئەفلاتوون یەك دەگرنەوە لەسەر ئەو خاڵەی کە ئیرۆس پاڵنەری سەرەکی ستەمکارییە. لەلایەکی دیکەشەوە جیاوازی فەیلەسوفو ستەمکار لێرەدا دەردەکەوێ، هەردووك لەلایەن ئیرۆسەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرێن، یەکێکیان لەلایەن ئیرۆس یاعەشقی حیکمەتو مەعریفەوە، ئەمەش کەس نییە جگە لە فەیلەسوف، ئەوی دیکە ئیرۆسێکی سیاسی واتە بەدەستهێنانی عەشقی کۆمەڵانی خەڵکی.

هیرۆ نەك لەدەستی بێ عەشقی گلەیی دەکا بەڵکو لەبێ هاوڕێیەتیش، هاوڕێیەتی راستەقینە، دادو فوغان دەکا. هاوڕێیەتی بریتییە لەخۆش ویستنو تەقدیرکردنو بڕوا پێهێنان لەلایەن دۆستێك یاچەند دۆستێکەوەو ئەمەش سەرچاوەی چێژێکی بێ سنورە. هاوڕێیەتی نەك چێژ بەخشە بەڵکو سەرچاوەی چاکیشە، دەبینین هیرۆ حەسودی بەوانە دەبا کە هاوڕێیان هەیە. هیرۆ تەنیا ئاماژدە بەو راستییە دەکا کە ستەمکار بێ هاوڕێیە چونکی لەرێگای ترسو ترۆرەوە حوکم دەکاو بوارێکی بۆ هاوڕێیەتی راستەقینە نەهێشتۆتەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی هاوڕێیەتی نییە

لەدەرەوەی، یەکەم، بڕوا (trust)، دووەم، عەشق، سێیەم، ئازادی، واتـە هاوڕێیـەتی تەنیا لەنێوان کەسە ئازادەکاندا دێتە ئاراوە، ئەوکاتەی کەسێك بەئاگرو ئاسن حوکـم بکا مانایەك بۆ دۆستایەتیو بڕواو ئازادیو متمانە نامێنێتەوە، دوای زینۆفـۆن بـەدوو هەزار ساڵ مۆنتسیکیۆ جارێکی دی جەغد لەسەر ئەم راسـتییە دەکاتـەوە کە لـەژێر سایەی ستەمکاریدا. هاوڕێیەتی بوونی نییە.

*    *    *

با لەسەرەتایەکی تازەوە دەست پێ بکەین بۆ خوێندنەوەی ئەم تێکستە گرنگـەو ئەمجارە چەمکی ئازادی خاڵی دەست پێکردن بێت، واتە بێ بەری بوونی ستەمکاری لەئازادیو بگرە ئازاد نەبوونی خودی ستەمکار کە هیرۆ جەغدی لەسەر دەکات. هیرۆ لەبـەراوردکردنی سـتەمکار بەکەسـی تایبـەتدا بە پلـەی یـەك دەڵێـت کەسـتەمکار کەسێکی ئـازاد نییـە، ئـازاد نییـە لـەوەی کـە سـەفەربکا بـۆ هـەر کوێیـەك کـە دڵـی دەخوازێ، ناتوانێ گەشتو گوزاربکاو دیدەنی شوێنی جیاوازبکا بۆ بینینـی دیمەنـە سەر سوڕهێنەرەکانو نـاتوانێ لەفیستڤاڵەکاندا بەشداری بکـا لەبەرئـەوەی شـوێنی ئاسایشو ئەمان نییە بـۆ سـتەمکار کـە "بچن بـۆ ئـەو شـوێنانەی کـە ئـەمان تێیـدا بەهێزنین..". هەروەها ستەمکار ئـازاد نییـە لـەوەی کـە خۆشـی ببینێـت لەبیستنی ستایشکردنی خۆی چونکی دەزانێ ئەوستایشانە پڕن لەنیفاقو هەروەها ئەوانەی کە هیچی خراپ ناڵێن دەربارەی ئەم خۆی لەراسـتیدا لـەدڵی خۆیـاندا هـەزاران ئایدیـای خراپیان لەسەر ئەم کەڵەکە کردوە. هەروەها ستەمکار ئەوە دەزانێ کە ئەوکەسانەی ستایشی دەکەن بەئیحتمالی زۆر یاموجامەلەی دەکـەنو تەمـەلوقی بۆدەکـەن یاخود مەبەستێکی خود پەرستانە لەودیو ئەو ستایشەوە خۆی مەڵاس داوە. دووبارە لەمەڕ خواردنو خواردنەوەشەوە ئازاد نییە، بەڵکو بەڕای هیرۆ سـتەمکار هیـچ ئازادییـەکی نییــە لــە لــەزەت کــردن لــەخواردنو خواردنــەوەداو لەبــەر کۆمــەڵێك هــۆ (بڕوانە1.25-1.23). ئەو ئازاد نییە لەوەی کە جڵەوی ئارەزووەکانی بگرێتەوە ئەمەش واتە بێ ڕێزی، چۆن؟ لەبیرمان بێت کەسایمۆندیس کاتێك بـەراوردی سـتەمکار دەکا لەگەڵ تایپــەکانی دی، بـەراوردی سـتەمکار ناکـا لەگـەڵ کەسـی بازاڕی، عـەوام، یا سـادە، بـەڵکو تـایپێکی دیکـە لەبـەردەمیدا قـووت دەکاتـەوە کـە تـایپی پیـاوی راستەقینەیە (Real man). پیـاوی راسـتەقینە ئـەو پیاوەیە کە ئـازادە، ئـازادیش لەوەدانییـە کـە هـەرچیت بوێـت بیکـەیت، بـەڵکو ئـازادی پیـاوی راسـتەقینە وا لەزەبتکردنی نەفسو دەروونو خۆدا، واتە هـەبوونی ژیـانێکی موعتـەدیلو هـەبوونی توانای زەبتکردن، دیسپلینکردنی زات. سـتەمکار ئـازاد نییـە چونکـی خـاوەنی ئـەم ئیرادەیە نییە، بەڵکو توانای زەبتکردنی خۆی نییە لەهەموو روەکانەوە، ئەمـە جگـە

لەوەی کە ئازاد نییە بەهۆی بێ بڕوایی‌و بێ هاوڕێیەتی‌و بەهۆی بڵاوکردنەوەی ئەو هەموو دوژمنایەتی‌و ترس‌و لەرزەوە لەنێو شاردا. هەروەها وەك گوتمان ستەمکار ئازاد نییە لەچێژوەرگرتن لەعەشق چونکی عەشق ئەوکاتە مانای هەیە کە لەنێوان دووکەسی ئازاددا روودەداو هەر دوولا وەك یەك عەشق بەیەکتری دەبەخشن لەبەرهیچ نا، نەدەستەڵات‌و نەسامان‌و نەجێ‌و مەقام، بەڵکو لەبەر خودی عەشق، ئەمەش مەیسەر نابێت مەگەر لەگەڵ تایپی خۆنەبێت، لەم روەوە ستەمکار زەرەریەتی. هەروەها لەیادمان بێت کەستەمکار ئەزمونی ئەو عەشقە ناکات کە لەنێوان دلدارەکان‌و دۆستەکاندا هەیە چونکی رەهەندێکی سەرەکی عەشق بڕواو باوەڕهێنانە بەیەکدی‌و ستەمکاریش لەم روەوە ژیانی ئەو، ئەزموونەکانی، مەوقیعی سیاسی ئەو کورتی دەهێنێت‌و بگرە ژیانێك دەژی بەدوور لەعەشق، بۆ؟ ژیانێك دەژی بەدوور لەعەشق چونکی ئەو هەمیشە لەدڵەڕاوکێ‌و ترس‌و بێ بڕوایدا دەژی‌و ناتوانێت باوەڕ بەکەسێك بکا جا چ دەگابەوەی کە کەسێکی دی خۆش بوێت، خۆش ویستن واتە بڕوا کردن بەمەعشوق، بڕوا لەوەدا کە مەعشوق نەك نابێتە سەرچاوەی خراپی بۆ عاشق، بەڵکو سەرچاوەی هەموو دڵنیاییە کە ستەمکار لەم دڵنیاییە بێ بەشە، بەمانایەکی دی لەئەزمونی عەشق بێ بەشە. لەعەشقدا ترس لە گیانی خۆو سەلامەتی بەدەنی خۆ بوونی نییە، بەڵکو عەشق خۆ بەدەستەوەدانی مەعشوقە، بەلام لەبیرمان بێت کە ستەمکار لەترسێکی ئەبەدیدا دەژی هەرچی پەیوەندی بەئەوانی دیکەوە هەبێت. ئەو دەزانێ کەشیاو نییە بۆ ستەمکار کە بڕوابەکەس بهێنێ کە ئەو خۆشی دەوێ، هەر ئەمەشە دۆزەخی ستەمکار، ئاخربڕوا نەهێنان بەدوژمن نەك سادەیە بەڵکو پێویستە، بڕوانەهێنان بەهەموو کەس حیکمەتە، بەلام بڕوانەهێنان بەهیچ کەس ئائەمە دۆزەخە، جا ئەو کەسە بگرە دۆست‌و مەعشوقت بێت. کورت هێنانی ستەمکاری لەبواری عەشقدا گرنگیەکی تایبەتی هەیە چونکی پەیوەندییەکی تەنگاتەنگ هەیە لەنێوان ستەمکاری‌و عەشقدا. ستەمکاری ئەو سیستەمەیە کە لەدوورەوە ئەو خولیایە دروست دەکا لەخەڵکیدا بەرانبەر رژێمی ستەمکاری وەك ئەوەی مەیدانێك بێت بۆ بەدەست هێنانی عەشق، دەست گەیشتنی بەهەر مەعشوقێ کە دڵت بخوازێ بەهەر عیشقێ کە خولیای بێت، لەودیدەوە کە ستەمکار سەروەری مەیدانی عەشقە، ئەمە دیارە بێ ئاگا لەوەی کە ستەمکار ئەو بیابانە بەرە هووتەیە خاڵی لەعەشق. وێڕای حەقیقەتی ستەمکاری، لەناو خەڵکیدا ئەو حەماسەتە، بەلام بەهەڵە، دروست دەبێت بۆ ستەمکاری وەکو ئەوەی ئەو سەرزەمینەبێت کە تێیدا ئارەزووە عیشقیەکان تێردەبن.

سایمۆندیس بەسادەیی مەسەلەکە روون دەکاتەوەو پێی وایە کەستەمکاری ئەوهەل‌و مەرجە بۆ ستەمکار دەڕەخسێنێ بۆ ئەوەی کە لەتەك جوانترین کەسدا پەیوەندی عیشقی بکا، هیرۆ لەتەك ئەم جۆرە بیرکرنەوەیەدا نییەو بەتایبەت لەتەك ئەم بەهانە هێنانەوەیەدا گیروگرفتی هەیە، هیرۆ ئەوە روون دەکاتەوە کە چۆن رەوانییە، شیاو نییە لەتەك ئافرەتێکی خۆمالّیدا زەماوەند سازبدا، بۆیە دەبێت تەنیا ئەم کێشەیە لەڕێگای زەماوەندێکەوە چارەسەر بکردرێت لەتەك ئافرەتێکی هەندەرانیدا کە خودی ستەمکارپێشتر نەیبینیوەو دەستی بەردەستی نەکەوتوە، بەواتایەکی دی هەرگیز شوێنی ئارەزووی ستەمکارنەبوە، واتە بزربوونی عەشق‌و ئارەزوو،و ئامادەبوونی هۆو بەهانەی دیکە لەوانە سیاسی‌و ئابووری‌و.. هتد، هەلّبژاردنی ئافرەتێکی هەندەرانی هەلّبژاردنێکە بەرمەبنای هەندێ حیساباتو لەبەرچاوگرتنی سیاسی‌و کۆمەلاّیەتی بەدوور لەعەشق، لەوانە بۆ نمونە دەولّەمەندبوونی ئافرەتی هەلّبژێردراو، واتا حیساب بۆکردنی سامان نەك هەستو عەشقی ساتەوەختی یەکتر بینینی عاشقانە، خواستنی شتێك لەدەرەوەی عەشق، خواستنی دەستەلاّتو پلەوپایەی کەسی خوازراو نەك کەسی شوێن ئارەزوو و تاسە. چ کارەساتێك گەورەترە لەکارەساتی زەماوەند کردن لەتەك کەسێکدا کە نەشوێنی رەحم‌و نەشوێنی عیشقی ئێمەبێت؟ بەلّێ ئائەمەیە کلۆلّی ستەمکار. بەڕای سایمۆندیس، هیرۆ دەتوانێ دەستی بەشتە خۆشەکان بگاو دەتوانێ لەگەلّ جوانترین کەسدا بخەوێ، بەلاّم لەبەرئەوەی هیرۆ لەرێگای ترس‌و تۆقاندنەوە حوکم دەکا ناتوانێ ئومێدی ئەوەی هەبێت کە عیشقی وەلاّم بدرێتەوە یاخود باوەڕی هەبێت بەهەر وەلاّمێك کە ئەوە لەعەشقەوە سەرچاوەی گرتوە. ترس هەموو متمانەیەك دەکوژێ‌و نەبوونی متمانەش لەخۆیدا دەبێتەوە هۆی پەخش بوونەوەی ترس، بەلاّم ئەمجارە ترسی ستەمکار لەدەوروبەرو بەرئەنجامەکەشی مەحف بوونەوەی عەشق. دەبێت لەیادمان بێت کە ئێمە لێرەدا لە ئیرۆسێکی تایبەتی قسەدەکەین بەمانای ئارەزووی مرۆڤەکان بۆیەکتر، دەنا ستەمکاری‌و ستەمکار بێ بەش نین لەئیرۆس، ئەوەی لەستەمکاردا چالاکە جۆرە ئیرۆسێکی سیاسییە بەلاّم بەهۆی لەدەست چوونی یا کەم بوونەوەی دەستەلاّتی عەقلّەوە ئیرۆسێکە دێوانەو بێ هیچ سنورێك. ئیرۆسی سیاسی کە دواجار لای ئەفلاتون دەیبینینەوە گەر رێنومایی بکردرێت لەلایەن عەقلّەوە بەرهەم‌و کرداری نەجیبانەی لێدەکەوێتەوە. شێوازی ژیانی ستەمکار بریتییە لەهەوەس‌و ئارەزوو بۆ هەیمەنە پەیداکردن بەسەرئەوانی دیکەدا کە لەبواری گشتی‌و مەدەنیدا بەستەمکاری دەشکێتەوە، لەسەر ئاستی تاکە کەسیانەی ستەمکاریش ئەو بۆشاییە رۆحییە دروستدەکا کە عەشقی تێدانییەو ژیانی

ستەمکار دەبێتــە گێژاوێکـی دووبـارە بـوەوە لـەچاندنی تـرس‌و بڕوانـە بـوون‌و ئنجـا دەست درێژی بۆسەر دونیـای هـەموان. هـیرۆ خـۆی دەدان بـەو ڕاسـتییەدا دەنـێ کـە "بـەزۆر شـت سـەندن لـەدوژمن" چێژێکـی زۆری پێـدەداو بـاجی ئـەم چێـژەش ئـەو شێوازی ژیانەیـە کـە ئـەو دەژی‌و خاڵییـە لەمتمانـەو ئنجـا دۆسـتایەتی. دۆسـتایەتی رەسەن تەنیا ئەو کاتە مەیسەر دەبێت کە ئینسانەکان ئازادن، بەزمانی یۆنانی کـۆن قسان بکەین، تەنیا ئینسانە ئازادەکان، نەك کۆیلەکان، دەتوانن ببنە دۆسـت، بـەڵام بەهۆی حوکم کردنییەوە لـەرێگای تـرس‌و زەبـرو زۆرەوە، سـتەمکار لەلایەکـەوە بـێ دۆست ترین کەسەو متمانەی بەکەس نییـەو کەسـیش متمانـەی پـێ ناکـا، لەلایـەکی دیکەشەوە خۆی کەسێکی ئازاد نییە. ستەمکار کۆیلەی ئیرۆسە سـەر لێشـێواوەکەی خۆیـەتی، کۆیلـەی هەوەسـی دەسـتەڵات‌و ئـارەزووی خسـتنەژێر رکێفـی ئـیرادەی کەسانی دیکەوە بۆخۆی‌و تەنیا لەبەرخاتری دەستەڵات‌و تـێرکردنی ئـەو هەوەسـەی کە تێربوونی بۆنییەو سنورێك ناناسێت. هیرۆ بـەهۆی ئـەوەی کـە دۆسـتایەتی لـەناو بردوە لەنێو رەعیەتەکەیدا، خۆشی توورِ هەڵداوەتە نێو گێژاوی نـەبوونی متمانـەوەو ئازادییەوە.

سایمۆندیس لەدوای بەشـی هەشتەمەوە هـەوڵی ئـەوە لەگـەڵ هـیرۆدا دەدات کـە رێگای نیشـان بـدا چـۆن شـێوازی حوکـم کردنـی کـە سـتەمکارییە بگـۆڕێ، هـەندێك گۆڕانکـاری بـەدی بـهێنێت تـاکو لەلایـەن شـارەوە رێـزی بـۆ دابـنرێ (بڕوانـە بەشـی 8-9-10). ئـەو گۆڕانکاریانـە لـەبوغزو کینـە دژ بەسـتەمکار کـەم دەکەنـەوەو لـەرێژەی تـرس کـەم دەکەنـەوە، بەرئەنجامەکەشـی چـاککردنی ئـەو سیستەمە دەبێت.

ئەوەی شوێنی سەرنجە ئـەو خاڵەیـە کـە کۆمـەڵێك لـەئامۆژگاری‌و پێشـنیارەکانی سایمۆندیس لای هەندێ بیریاری سیاسی قۆنـاغی مۆدێـرن دووبـارە دەبنـەوە لەوانـە ماکیـاڤیللی‌و رۆسـۆ، و لەسـەردەمی مۆدێرنـدا ئـەو پێشـنیارانە دەبنـە بەرنامـەی دەوڵەتی نەتەوە بۆنمونە کاتێك کەسایمۆدیس دەڵێ پێویستە ستەمکار چەندین جۆر لەخـەڵات دابـەش بکـا لـەبوارەکانی کشتوکاڵ‌و پیشەسـازی‌و بازرگـانی بەمەبەسـتی تەشویق کردنی خـەڵکی‌و دەسـت گرتنـی بـەهرە جیاوازەکـان، ئەمـە ئەوشـتەیە کـە دەوڵەتی نەتەوە پێی هەڵدەستێ چ ماکیاڤیللی‌و چ رۆسۆش ئامـاژدە بـەو پێشـنیارە دەدەن، هـەروەها کـە دەڵـێ لـەجیاتی بـەکرێ گرتنـی کۆمـەڵێ چـەکدار سـتەمکار پێویستە سوپایەکی رێك‌و پێـك‌و خـاوەن دیسپلین (زەبـت) بهێنێتـە ئـاراوە، یـاخود پۆلیسی دەوڵەت وەك هێزێکی هەمیشەیی بۆ پاراستنی ئیـدارە (کـە دەشـێ بڵێـین

دەوڵەت) ئەمەش ئەو شتەیە کە دەوڵەتی مۆدێرن ئەنجامی داوە، واتە دەوڵەت بەخۆیو لەشکرو سوپاو دەستگای پۆلیسەوە.

سایمۆندیس دەڵێ لەجیاتی کۆمەڵێ چەکداری بەکرێگیراو پێویستە ستەمکار بیر لەوەبکاتەوە کە دانیشتوان سەربازی بکەن وەك ئەرکێکی ئیجباری، ئەم پێشنیارانە لەدنیای مۆدێرندا بەووردی جێ بەجێ کراون، لێرەدا بپرسین ئایا دەوڵەتی مۆدێرن دەوڵەتێکی ستەمکاری چاك کراو نییە؟

سایمۆندیس پەنجە دەخاتە سەر خاڵێکی جەوهەری کە پەیوەندی بەعەشقی جەماوەرەوە هەیە، ئەویش بۆ ئەوەی فەرمانڕەوا شوێنی رێزو مەحەبەتی خەڵکی بێت دەبێت ستەمکار کاریان بۆ بکا (بەشی 1و 8)، ستایشیان بکا (8.3-3-8-4)، بەمانایەکی دی دەبێت خەڵکی هەست بکەن کە کەرامەتیان پارێزراوە، کە بەرئەنجامەکەی بۆ فەرمانڕەوا بریتی دەبێت لەگەڕانەوەی دەستی رێز بۆ خودی ئەوو ئەمجارە خەڵکی دەستی رێز لە ئەودەنێنو لەئەنجامیشدا شار کەشو هەوایەکی دیکە تێیدا بالادەست دەبێت. سایمۆندیس لەبەشی (11-13-11-14)دا قسە لەسوودەکانی ئامۆژگاریەکانی خۆی دەکا بۆ ستەمکار. هەموو ئەم ئامۆژگاریانە دواجار ماکیافیللی پێشنیاریان دەکا بۆ میر. نزیکییەکی تەواو هەیە لەنێوان ئەم دایەلۆگەی زینۆفۆنو کتێبی "میر"ی ماکیاڤیللیدا.

ماکیاڤیللی لەنێو نووسەرو بیریارە کلاسیکەکاندا زۆرتر ئاماژدە بەزینۆفۆن دەداو بەتایبەتی دایەلۆگی "هیرۆ" ئەمەش زیاتر لەکتێبەکەیدا "گووتارەکان"[٦] لە "گووتارەکان"دا ماکیاڤیللی ئاماژدە بەهیرۆ دەدا وەك ستەمکارێكو وەك نموونەی ستەمکار دەیهێنێتەوە کە هەروەك چۆن زینۆفۆن مەبەستیەتی لەو دایەلۆگەدا بیڵێ، ماکیاڤیللی پێ لەسەر ئەو خاڵەدادەگرێ کەستەمکارەکان لەخزمەتی شارو وڵاتەکانیان دانینو هیچ کات لەبیری دەوڵەمەندکردنو هێنانە کایەوەی ئاسایش دانین بۆ شار، ئەوشارەی کە ستەمکار حوکمی بکا دەستەڵاتی لەنێو شارەکاندا زیاتر نابێت. ماکیاڤیللی هەروەك زینۆفۆن لەوباوەڕەدایە کەستەمکار بۆ ئەوەی حوکم بکا بەناچاری دەبێت شار، یاخود وڵات بەزمانی ئەمڕۆ، دابەش بکاو جیاوازیو تەفرەقە بخاتە نێو چڤاتەوەو لێرەوە بەرژەوەندی خود پەرستانە دەست بەسەر بەرژەوەندی مەدەنیو گشتیدا دەگرێت.

خاڵێکی دیکەی گرنگ کە هاوبەشە لەنێوان دایەلۆگی "هیرۆ.."و بۆ چوونەکانی ماکیاڤیللیدا بریتییە لەفیکرەی چاککردنی ستەمکاری، بەشێوەیەك کە پێشنیارەکانی سایمۆندیس بەشێوەی جۆراوجۆر لای ماکیاڤیللی دووبارە دەبنەوە. دووبارە کردنەوەی کۆمەڵێ ئایدیای ناو دایەلۆگی "هیرۆ" لەلایەن ماکیاڤیللییەوە

نابێت ئەوخاڵەمان لەبیربەرێتەوە کە ماکیاڤیللی بەزمانێکی نوێو لەسەردەمێکی نوێدا هەندێ خاڵی پێشنیارکراو دووبارە دەکاتەوە، لەسەرەتای سەردەمێکی نوێداو دارشتنی جیهان بینییەکی نوێ کە تێیدا جیاوازی هەیە لەنێوان ئەخلاقو سیاسەتدا، لەم دیدگا نوێیەدا سیاسەت لەحیکمەت جودا دەبێتەوە. وێرای ئەم جیاوازییە گەورەیەش، شتراوس رای وایە کە دایەلۆگی "هیرۆ" نیشانەی خاڵێکی پەیوەندی نزیکە لەنێوان زانستی سیاسی پێش مۆدێرنو زانستی سیاسی مۆدێرندا.

هیرۆ لەبەردەم پێشنیارەکانی سایمۆندیسدا بێدەنگی هەڵدەبژێرێو ئەو شپرزەییە لای ئێمە دروست دەکا کە ئێمەنەزانین خوی ستەمکار چۆن وەك پیاوێکی خاوەن کردار (Man of action) چۆن سەیری ئەو پێشنیارانە دەکا؟ بەلام بێدەنگی هیرۆ خۆی زۆرتر لەوە دەدوێ گەر بهاتایەو قسەی کردبا. لەیادمان بێت کە هیرۆ ستەمکارێکی هۆشیارە، ستەمکارێك نییە نەزانێ ستەمکاری چییەو ئاگادار نەبێت لەرەهەندە ترسناکەکانی ئەو سیستەمە. لێرەوە لایەنێکی بێ دەنگی هیرۆ تارادەیەك لەگومانێك دەدوێ لەبەرانبەر پێشنیارەکانی سایمۆندیس بۆ چاککردنی ستەمکاری. یاخود بەلانی کەمەوە هیرۆ دەزانێ کە ئەو پێشنیارانە ستەمکاری ناگوێزنەوە بۆ سیستەمێکی تەواو جیاواز، واتە لەجەوهەردا ستەمکاری چاك ناکرێت، ناتوانی بیگۆڕی تەنیا بەوەی کارێك بکەیت خەڵکی بەختەوەربن، ئەمەی دواییان دیموکراسیەتی مۆدێرنە، سەردەمی کۆمەلانی خەڵکدا (Masses) ، دیموکراسیەتی مۆدێرن ستەمکارییەکە کە ئامۆژگارییەکانی سایمۆندیسی پەیرەو کردوە خاڵ بەخاڵ.

لەلایەکی دیکەوە بێدەنگی هیرۆ لەوخاڵە جەوهەرییە دەدوێ کە پێشنیارەکانی سایمۆندیس مامەڵە لەتەك ئەو گۆڕانکارییە دەرەکیانە دەکەن کە پەیوەندیان بە خودی هیرۆوە نییە، وەك ئەوەی هیرۆ بیەوێت بڵێت دوای ئەو هەموو گۆڕانکاریانەش من وەکو زاتێکی کلۆڵ دەمێنمەوە. بێدەنگی هیرۆ لەو سەرسوڕمانە دەدوێ کەستەمکارێك هەیەتی بەرانبەر بەشاعیرێك کە ناتوانێ ستەمکاری وەکو نەخۆشییەك ببینێ بەپلەی یەك لەخودی رۆحی ستەمکاردا، بەواتایەکی دی وەکو گوتمان سایمۆندیس بەراستی سوکراتی نییە چونکی سوکرات ستەمکاری وەك نەخۆشی رۆحی دەبینێت، بەلام نەخۆشییەك کە چارەسەری نییە مەگەر بەبڕینی هەموو ئەو خانانەی کە بیمار بوون، موبتەلا بوون بەو نەخۆشییە. لای سوکرات هەر هەوڵێك بۆ چاککردنی ستەمکاری هەوڵێکی بێهودەیە. لای سوکرات هۆی سەرەکی ستەمکاری زاڵ بوونی ئارەزووە ناپێویستەکانەو کزبوونی رۆڵی عەقڵە لەحوکم کردندا. بەپێی ئەم بۆچوونە ستەمکاری بریتییە لە "بێ یاسایی"و عەدالەتیش هاوشێوەیە لەتەك

یاساو عەقڵدا. ئایا بۆ عەدالەت ئەوە پرسیارێکی سەرەکی نیە کە یاساکان خراپ بن یا چاك؟ ئایا سەرچاوەی یاساکانو سروشتیان جەوهەرو سروشتی رێکخستنی سیاسی، عادل بوون یا ناعادل بوونی سیستەمی سیاسی دەرناخەن؟ لەم دایەلۆگەدا مەسەلەکە تەمو مژاوییە. ئەوەی ئاشکرایە کە سایمۆندیس چاو لەچاککردنی ستەمکاری دەبڕیّو کردنی ستەمکار بە"ستەمکارێکی بەسوود". وەك ئاماژدەشمان پێدا لێرەدا ئەم دایەلۆگە لەدایەلۆگە سوکراتیەکانی زینۆفۆن جیادەبێتەوە، چونکی سوکراتی زینۆفۆنی لەو دایەلۆگانەدا جەغد لەسەر هونەری فەرمانڕەوایەتی کردنو مافی فەرمانڕەوایەتی کردن دەکا، یاخود بوونی یەك پێودانگ (Criterion) ئەویش مەعریفەی حوکم کردنە نەك ترسو فرووفێڵو ناعەدالەتی، واتە فەرمانڕەوا دەبێت لەلایەن مەعریفەوە رێنومایی بکردرێتو هەر ئەمەشە فەرمانڕەوا لەستەمکار جیادەکاتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە هەر ئەم خاڵە پەیوەندی حیکمەتو فەرمانڕەوایەتی کردن دیاری دەکا. لەدواجاردا سایمۆندیس ئامۆژگاری هیرۆ ناکا تاکو لەنێوان فەزیلەت (Virtue)و چێژدا یەکێکیان هەڵبژێریّ، یاخود ببێتە فەرمانڕەوایەکی خاوەن فەزیلەت، بەڵکو ئامۆژگاری دەکا کە چێژەکانی بگونجێنیّ، تەشویقی هەندێك فەزیلەت بکاو بڕوا بەرەعیەت پەیدا بکاو کۆمەڵیّ کاربکا کە بوار بۆ چێژی شەخسی خۆی بمێنێتەوە. بەلاّم ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کەستەمکار دەبێتە خاوەن فەزیلەت. ستەمکار لەهەموو ئەو فەزیلەتانە بیّ بەشە کەئەفلاّتوون لە "کۆمار"دا ئاماژدەیان پیّ دەدا، وەکو اعتدال، عەدالەت، حیکمەت، بەزەیی، دیسپلینی خۆ (زەبت کردنی نەفس)، راستگۆیی...

## زاراوەی ستەمکاری:

لەیۆنانی کۆندا Tyrannos کە ووشەی Tyrantی ئینگلیزی لەوەوە سەرچاوەی گرتوە، ئەم وشەیە ئاماژدەکردن بوو بۆ کەسیٚ کە ئەمڕۆ ئێمە ووشەی ستەمکار یا "دیکتاتۆر"ی بۆ بەکاردەهێنین. Tyrannos

واتە ستەمکارێك کە دەستەڵاتی تەواوی کاروباری سیاسی شاری بەدەستەوە گرتوەو دەستی بەسەر دەستەڵاتدا گرتوە بیٚ لەبەرچاوگرتنی هیچ دەستورێك، واتە وەك تەحەدایەکی یاساو دەستووری شار، بەمانایەکی دی فەرمانڕەوایەکی ناڕەوا. کاتێك مێژوونوسان قسە لەسەر "سەردەمی ستەمکارەکان" دەکەن لەیۆنانی کۆندا مەبەستیان لەو قۆناغەیە لەنێوان 650 بۆ 510ی پێش زایینی، قۆناغێك کەتێیدا شارەکانی یۆنان کەوتنە ژێر رکێفی ستەمکاریو ستەمکارانەوە، ئەم ستەمکار کۆدێتای دەکرد بەسەر ئەو ستەمکاری ترداو بەم شێوەیە ئەم قۆناغە قۆناغی ژێر پیٚ خستنی دەستورو یاساو قۆناغی ناڕەوایەتی بوو. لەرووی تیورییەوە ئەم قۆناغە، وێڕای لایەنە خراپیەکانی لەرووی سیاسیو کلتورییەوە، زەخیرەیەکی مێژوویی دروستکرد بۆ فەیلەسوفو بیریارو درامانووسو کۆمیدی نووسو یاسادانەرانی نەوەکانی دوایی تر تاکو لەو زەخیرەیەوە لەدیاردەی ستەمکاری بگەنو بیخەنە بەر رووناکی بیرکردنەوەو،و شەنو کەوکردنی هۆ گشتییەکانی ئەم دیاردەیە، لەوانە هۆکارە ناوخۆییەکانی سیستەمی ئەرستۆکراسی، واتە ناڕێکی ئەوسیستەمەو نالایقی ئۆرستۆکراسەکان کە لەسەدەی حەوتەمدا دەستەڵاتیان گرتەدەست. لێرەوە قۆناغی "ستەمکارەکان" وەرچەرخاندنێك بوو لەگەشەکردنی سیاسیانەی یۆناندا، چرکەساتێك کەتێیدا رێکخستنێکی کۆن هەڵدەوەشێتو رێکخستنێکی نویٚ لەسەر کەلاوەی ئەو رێکخستنە کۆنەوە دادەمەزرێندریٚ.

فەیلەسوفەکانی سەدەی چوارەم ووشەی "شا" یان وابەکاردەهێنا وەك ئاماژدەکردنێك بۆ جۆرێکی چاکی فەرمانڕەواو وشەی Tyrant (ستەمکار)یش وەك ئاماژدەکردنێك بۆ جۆرێکی خراپی فەرمانڕەوا، لەگەڵ ئەمەشدا نووسەرەکانی پێشوو بەشێوەیەك مامەڵەیان لەتەك ئەم دوو ووشەیە دەکرد وەك ئەوەی هاومانابن (synonyms). کۆنترین بەکارهێنانی ووشەی Tyrannos کە مابێتەوەو بەدەستمان گەیشتبێت بەکارهێنانەکەی ئەرخیلیۆسە کە لەچەند دێڕێکدا هاتوەو ئەمەش لەناوەڕاستی سەدەی حەوتەمدا نووسراوە،و ئنجا نووسینێکی هیپیاس Hippias کە لەسەدەی چوارهەمدا نووسراوە. لەنوسینەکەی ئەرخیلیۆسدا قسەکەرەکە دەڵیٚ:

**"من هیچ بەتەنگ سامانی گیگیسەوە Gyges نایەم، هیچ بەخیلیەك لەمندانییە، من حەسودی بەكارەكانی خوداوەندەكان نابەم، هەروەها ئارەزووی ستەمكاریەكی مەزنیش ناكەم"**

دەبێت بگوترێت كە گیگیاس شای Lydia بوو لەنێوان 685 و 657ی پێش زاینیدا. لێرەوە رەنگە ووشەی تیرانۆس لە Lydiaوە هاتبێتە ناو یۆنان و لەوێشەوە بۆ زمانە ئەوروپیەكان.

ئەوەی زۆرگرنگە سەرنجی بدەین ئەو مانا ئەسڵیەیە كە وشەی تیرانۆس لە هەناویدا هەڵی گرتبوو. لەبنەڕەتدا ووشەی تیرانۆس ئاماژدەكردن بوو بۆ كەسێ كە اغتصاب دەكا. كەواتە تیرانۆس (ستەمكار) ئەو كەسەیە كە اغتصابی یاسا دەكا، كەسێ كە دەستەڵاتی لەرێگای هۆكارە دەستووریەكانەوە بەدەست نەهێناوە بەڵكو اغتصابی دەستووری كردوە، لەمە زیاتریش ستەمكار ئەو كەسەیە كە اغتصابی خەڵكیو بواری مەدەنی دەكا. ئەسخیلیۆسو سۆفۆكلیس لەسەدەی پێنج هەمدا هەردوو وشەی تیرانۆسو شا (مۆناركۆس Monarchos) یان بەیەك مانا بەكاردەهێنا وەك ئاماژدەكردن بۆ "تاكە فەرمانڕەوا". بەڵام هەرچی پەیوەندی بەمێژوو نووسی یۆنانی هیرۆدتسەوە هەیە لێرەدا دەتوانین یەك دوو سەرنج دەربڕین. لەكتێبەكەیدا "مێژووەكان" ئەو قسە لەشاكانی قوبرسو مەكدۆنو وڵاتی فارسو میسر دەكا. ئەوەی شوێنی سەرنجە ئەوەیە كە جیاوازی ئەوتۆ ناخاتە نێوان ئەو زاراوانەی كە بەكاریاندەهێنێ بۆشاكانی خۆرهەڵات زۆرجار "شا"و هەندێك جاری دیكە ستەمكار (Tyrannos) بەكاردەهێنێ. ئەو ستەمكارانەی كە لەكتێبەكەی هیرۆدتسدا ناویان هاتوە دەچنە ریزی سێ گروپەوە:

١ـ ئەوانەی كە بەفعلی كەسایەتیەك بوون لەجەنگەكانی فارسەكاندا، جەنگەكانی نێوان یۆنانو فارسەكاندا.

٢ـ ئەوانەی كە چالاكیەكانیان پێشینەیەكی نكۆڵی لێنەكراو دروستدەكا بۆ وەزعی هەنووكەیی. شارەكانی یۆنان لەبەشی دوایی سەدەی شەشەمدا.

٣ـ ئەوانەی كە بەڵگەكان دەخەنە روو سەبارەت بەهەر بابەتێك كە شوێنی مشتومڕ بێت.

لێرەوە ستەمكارەكان، لەهەرسێ گروپەكە، تایپێكی كەسایەتی دروست دەكەن، كەسانێك كە كاراكتەرێكی بەهێزیان هەیە، ئەوانەی كە داستانی عەجیبو غەریب دەربارەیان ئاڵو گۆڕی پێدەكرێ. دەبێت بگوترێت كە ژمارەیەكی زۆری ئەو ستەمكارانەی كە ئاماژدەیان پێكراوە لەكتێبەكەی هیرۆدتسدا ئەو فەرمانڕەوایانەی

شارەکانی یۆنانن لەئاسیای بچووك بوون کە لەلایەن فارسەکانەوە پشتگیری دەکران. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین پێناسەیەك گەڵاڵە بکەین لەکتێبەکەی هیرۆدتسدا دەربارەی ستەمکاری، لەدیدی ئەوەوە دەسەڵاتی تاکە کەسێك بەسەر جڤاتدا بریتییە لەستەمکاری.

مێژوو نوسێکی تری یۆنان کە لەسەر ستەمکاری‌و ستەمکاران دواوە بریتییە لەسیۆسیدیس Thucydides لەکتێبە گرنگەکەیدا "مێژوی جەنگی پیلوپینزیان". لەکاتی قسەکردن لەسەر مێژووی کۆنی یۆناندا سیوسیدیس ئاماژەیەك بۆ ستەمکارەکان دەکاو دەڵێ کە لەپێش ئەو ستەمکارانەوە، شاو تەختی پادشایەتی میراتی بوون کە ئیمتیازو دەسەڵاتیان دیاریکراو بوو. ستەمکارەکان، کەواتە، ئەوانەن کە دەسەڵاتیان بەمیرات بۆ نەماوەتەوە بەڵکو دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرتوەو هیچ سنورێکیش بۆ ئیمتیازو دەسەڵاتیان بوونی نیە. (١)

ستەمکار ووشەیەکی گونجاوە بۆ وەسفکردنی ئەو پیاوەی کە بەرێگای ناڕەوا دەسەڵات دەگرێتە دەست. تەنیا لەسەدەی چواردەهەمدایە کە ووشەکانی تیرانی‌و تیرانوس مانا مۆدێرنەکەی ئەمڕۆ دەگەیەنن، حکومەتێکی بێ یاساو توندوتیژ کە تێیدا فەرمانڕەوا فەرمانڕەوایەتی ناکا بۆ چاکەی گشتی‌و هیچ حیسابێك بۆ بواری مەدەنی ناکا. دەتوانین چەند تایبەتمەندیەکی رژێمە ستەمکارییەکانی یۆنان دیاری بکەین کە دواجار دەبنە مایەی گفتوگۆو بابەتی فەلسەفی فەیلەسوفەکانی یۆنان لەوانە ئەفلاتوون‌و ئەرستۆ. تەنیا بۆ نمونە ئاماژە بەچەند خاڵێك بدەین.

١- رژێمی ستەمکاری یۆنان خۆی زادەی کێشمەکێش‌و ململانێی میلیشیایی بوو هەندێ جاریش کۆتایی بەوکێشمەکێشە میلیشیاییە دەهێناو رێکخستنێکی بۆشار دەهێناو جارێکی دی یەکگرتنێکی بۆ شار فەراهەم دەکردەوە. وەك رافایل سیلی دەڵێ "ستەمکاری بوە مایەی زیادکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت، هەر ئەم خاڵەشە کاریگەریە درێژخایەنیەکەی ستەمکاری" (٢).

٢- بوونی رێکخستن‌و کۆنترۆڵکردنی ئاشوب‌و ناکۆکی نێوان دەستەوتاقمەکان زۆر جاران بۆتە مایەی گەشەکردنی بازرگانی‌و ئابوری.

٣- خاڵی سێیەم پەیوەندی بەرۆڵی ئاینەوە هەیە. ئەم خاڵە زۆرگرنگە کەسەرنجی بدەین چونکە دواجار سیستەمە ستەمکارییەکانی دوایی هەر هەموو پەیڕەو لەم سیاسەتە دەکەن. ستەمکارەکانی یۆنان تەشویقی گەشەکردنێکی سیستماتیکی دام‌و دەستگا ئاینیەکانیان دەکردو پشتیان پێدەبەستن بەنیازی کۆنترۆڵکردن‌و دامرکاندنەوەی رۆحی نەیاری دانیشتوان.

٤- ستەمكارەكان هەميشە لەرێگای ترس‌و تۆقاندنەوە حوكميان كردوە لەجياتی ياسا. ئەوان لەرێگای هێزە سەربازی‌و ميليشياتەكانەوە حوكميان كردوە، ئەم خاڵە، واتە حوكم كردن لەرێگای ترسەوە، دەبێتە خاسيەتێكی ستەمكاری‌و پرنسيپێ كە لەرێگەوەی دەتوانين ستەمكاری بناسينەوە، بەتايبەت لای مۆنتسيكيو.

٥- ئەندرۆس لەكتێبەكەيدا "ستەمكارانی يۆنان"(٣) سەرنجمان بۆخاڵێكی گرنگ رادەكێشێ ئەويش ئەوەی كە هەندێ ستەمكارەكان وا خۆيان دەبينی وەك ئەوەی كە لاسايی ستەمكاری فارسی دەكەنەوە لەوەدا كە بەفەخرەوە دەستەڵات نيشان دەدەن‌و سەرگەرمی چێژە هەستييەكان (جەستەييەكان)دەبن. ئەم خاڵە دووشتمان پێدەڵێ:

يەكەم: ستەمكاری فارسی بارگاوی بوە بەچێژو هەست‌و تێركردنی ئارەزووەكانی ستەمكار، سيستەمێك رازاوە بەسروتی حسی‌و چێژپەرستن، ديارە بۆ ستەمكارو لەلايەن ستەمكارەوە. دواجار لای مۆنتسيكيو ئەم خاڵە جەغدی لەسەر دەكرێتەوە.

دووەم: تێگەيشتنێكی تايبەتی دەستەڵات لێرەدا خۆی بەيان دەكا ئەويش ئامانجی دەستەڵات فەراهەمكردنی حاڵەتێكە كە تێيدا چێژە حسييەكان دەبنە ئامانجی موتڵەق.

كەواتە لێرەوە دەڵێين تۆمارەكانی سەدەی حەوتەم‌و شەشەمی يۆنان ئەوەمان نيشان دەدەن كە ستەمكارەكان لەو سەردەمەدا بەدەست بەسەراگرتنی دەستەڵاتداو كۆنترۆڵی سياسی دەستەڵات بۆ خۆيان ئەم كارە بوە مايەی لاوازبووی ئۆرستۆكراسی تەقليدی يۆنان. لێرەوە ووشەی Tyranny دێتە ناو زمانی يۆنانييەوەو لەوێشەوە بۆزمانە ئەوروپييەكان‌و بۆ نێو قاموسی سياسی بەهەموو ئەومانايانەی كە ئەم ووشەيە لەخۆ دەگرێ، بەد، بێ رەحمی، بەدترين جۆری حكومەت، مەرگی بواری مەدەنی، بێ ياسايی، حكومكردنی هەرەمەكی، باڵادەست بوونی ترس‌و تۆقاندن.

هەڵەيەكی مەنهەجی‌و فيكری‌و ئنجا نيشانەی تێنەگەيشتنە لەئەفلاتوون گەر بەشێوەی گشتی‌و گشتگيری لەسەر رای ئەفلاتوون قسەبكەين، بۆ نمونە وەك ئەوەی كە بڵێين رای ئەفلاتوون لەسەر ستەمكاری ئەمەيە. چونكی بەباوەڕی ئێمەو ئنجا بەباوەڕی شتراوس‌و ئالان بلۆم‌و پرۆفيسۆر نوولێش دايەلۆگەكانی ئەفلاتوون دۆكترينێك (عەقيدەيەك)و دۆگمايەك پێشكەش ناكەن بەڵكو وەك ئالان بلوم دەڵێ دايەلۆگەكان رێگا خۆش دەكەن بۆ فەلسەفاندن philosophyizing . لەبنەڕەتدا هەر دايەلۆگە وەزيفەی مامۆستايەك دەبينێ كەكارێك دەكا قوتابيەكانی بيربكەنەوە. لێرەوە تێگەيشتن لەئەفلاتوون تەنيا لەرێگەی خودی فەلسەفاندنەوە دەبێت. ئەمە

بەومانایە نایەت کە وانەیەکی ئەفلاتوونی بوونی نییە، بەڵام ئەو وانەیە یەك، گشتی نییە، دوو، ئەو وانەیە پەیوەندی بەهەموو دەنگەکانی هەر دایەلۆگەوە هەیە. هەر دایەلۆگە لەچەند دەنگێك پێکهاتوە، ئەو وانەیە لەیەکێ لەدەنگەکاندا نییە بەتەنیا بەڵکو لەهەموو دەنگەکاندایە ئنجا کە دێینە سەر هەر دایەلۆگە نابێت دایەلۆگەکان تێکەڵ بکەین. بۆ نمونە گەر قسە لەسەر رای ئەفلاتوون بکەین لەسەر ستەمکاری دەبێت بزانین لەکامە دایەلۆگ قسەدەکەین، ئێمە لێرەدا باس لەرای ئەفلاتوون دەکەین لەسەر ستەمکاری تەنیا لەدایەلۆگی کۆماردا.

ئەفلاتوون لەدایەلۆگی "کۆمار: دەربارەی "عەدالەت"دا تایپۆلۆجی Typology شێوە سیاسیەکانمان بۆ دەخاتە روو و پۆلێنیان دەکا بەرمەبنای ئەو تاکە کەسانەی کە دەتوانن بەشداریان بکەن، واتە بەشداری لە فەرمانڕەوایەتیکردنی رژێمی سیاسیدا. لەنێو ئەم رژێمانەدا، ئەفلاتوون ستەمکاری بەنەخۆشیەکی سیاسی، سیستمێکی سیاسی کە شوێنی بێزلێهاتنەوەیە دەزانێ، نەك لەبەرئەوەی کە فەرمانڕەوایەتی یەك تاکە کەسە، بەڵکو لەبەرئەوەی نوێنەرایەتی ئەو حاڵەتە دەکا کە شار کۆنترۆڵ دەکرێ‌و فەرمانڕەوایەتی دەکرێ لەلایەن نزمترین‌و سووکترین ئارەزووەکانەوە. پێچەوانەی ستەمکاری، دیموکراسی نییە بەڵکو شاهەنشاهی عەقڵە، بەواتایەکی دی فەرمانڕەوایەتی عەقڵ، حوکمکردنی شار لەلایەن فەیلەسوف ـ شاوە کە لەهەموکەس زیاتر بەتواناترەو شایانی حوکمکردنەو هیچ گرنگیەك بەدەستەڵاتی سیاسی نادا تەنیا لەبەرخاتری دەستەڵات خۆی، لەرێگەیەوە ئەوە عەقڵە کە حوکم دەکاو حوکمی عەقڵیش حوکمێکی عادلانەیە.

ئەفلاتوون واسەیری ستەمکاری دەکا وەك دژە عەدالەت‌و عەدالەتیش لەبیری ئەفلاتوندا ئەو رێکخستنە هارمۆنیەی ئەوبەشانەی شارەکە لەکێشمەکێشدان، ئنجا رێکخستنێکی هارمۆنیانەی بەشەکانی رۆح(٤) لێرەوە زۆربەی ئەو کردارانەی کە بەشێوەیەکی گشتی بەناعەدالەت ناو ریزیان دەکەین لای ئەفلاتوون نیشانەن بۆ نەخۆشیەکی قوڵتر.

هارمۆنی هەڵو مەرجە، هۆیەو ئنجا ئاکامی عەدالەت. لەشارێکی عادلدا هەریەك لەسێ چینەکەی شار، فەیلەسوف ـ شاکان، جەنگاوەرەکان‌و چینی بەرهەمهێنەران، هەریەکە وەزیفەی خۆی جێبەجێ دەکاو بەم شێوەیە رێکخستنێکی هارمۆنی دێتە دی. لەتاکەکەسی عادلیشدا هەریەك لەسێ بەشەکەی رۆح، بەشی بیرکردنەوە یا عەقڵ، بەشی سومۆس یا Spirited جەنگاوەر،و بەشی ئارەزوو خواستن The deseiring part، هەریەکە وەزیفەی گونجاوی تایبەت بەخۆی بەئەنجام دەگەیەنێت لەژێر رێنومایی بەدیقەی عەقڵدا.(٥) تاکە کەسی عادل:

**"ڕێگە نادا کە هیچ بەشێکی ڕۆحی دەست وەربداتە کاروباری خەڵکی دیکەوە یاخود سێ بەشەکەی ڕۆحی دەست وەربدەنە کاروباری یەکترەوە، بەڵکو ماڵی خۆی باش ڕێك دەخاو خۆی حوکمی خۆی دەکا. خۆی ڕێك دەخا، دەبێتە هاوڕێی خۆیو لەبەشەکانی ڕۆحی خۆیدا هارمۆنیەك دروستدەکا، هەروەك نۆتتی هارمۆنیا، نزمترین و بەرزترین و ناوەندیترین سکیل".(٦)**

میتافۆری (ئیستعارەی) تەندروستی ناوەندیترین میتافۆرە لەقسەکردنی ئەفلاتووندا لەسەر عەدالەت. لە "کۆمار"دا فەلسەفە واپێناسە دەکرێ وەك "هونەری پزیشکی ڕۆح". لەدایەلۆگی "گۆرگیاس"دا ئەفلاتوون عەدالەتو تەندروستی پێکەوە گرێ دەدا.(٧)

ئەفلاتوون لەکۆماردا پێشنیاری ئەوە دەکا کە ئینسانەکان پێویستیەکی جەوهەریان هەیە بەعەدالەت، پێشنیاری ئەوە دەکا کە شار لەسەر پێویستیەکانی ئینسانەوە دروست دەکرێت، لەوانە عەدالەت دەردەکەوێ کەپێویستیەکی جەوهەری ئێمەی ئینسانە. هەبوونی عەدالەت واتە "بەتەواوی کامڵ بوون"، واتە بەدەستهێنانی هەلومەرجی ڕاست بۆ ڕۆحی ئینسانە، واتە "هارمۆنیەکی ڕۆحانی کە بەرئەنجامی خۆ ـ کۆنترۆڵکردنە".

لەبەرامبەر ئەو وێنەیەی سەرەوەدا، ئەم وێنەیەشمان هەیە دەربارەی ستەمکاری. ستەمکاری لەیەککاتدا بریتییە لەنا ـ هارمۆنی، ناڕێکیو پەتا، هەردووك چ ستەمکارو چ شارێك کە لەلایەن ستەمکارەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرێ بەدەست ناڕێکیو نەگونجاویو پەتاوە دەناڵێنن، چ لەبەشەکانی ڕۆحداو چ لەبەشەکان یا چینەکانی شاردا؛ لێرەوە ستەمکاری بریتییە لە "نەخۆشیەکی کوشندەی شار"، ئەوەی گرنگە سەرنجی بدەین ئەو خاڵەیە کەلای ئەفلاتوون جیاوازییەکی جەوهەری نییە لەنێوان ستەمکارو ڕەعیەتدا The subjects کەسانێك کە لەلایەن ستەمکارەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرێن، لەبەرئەوەی ئەوە کەلکەڵەو خواستی پیاوو ژنانە کە ڕێکخستنی سیاسیانە دێنێتە بەرهەمو لەهەمان کاتیشدا ئەو ڕێکخستنە سیاسییە ڕەنگدانەوەی ئەو کەلکەڵانەی ئەوانە. لە "کۆمار"دا سوکرات کە باس لە ڕژێمەکان دەکا لەپەیوەندیاندا بەکاراکتەری مرۆڤەکانەوە دەڵێت:

**"تۆ دەزانی، من گوتم، کە پێویستە هێندەی جۆرەکانی رژێمە سیاسییەکان جۆری کاراکتەر بوونیان هەبێت؟ یاخود تۆ لەو باوەڕەدایت کە رژێمەکان" لەداربەڕوو و بەردەکانەوە سەرهەڵدەدەن" نەك لەخواست وکەڵکەڵەی ئینسانەکانەوە لەشارەکاندا .. ..(٨)**

لێرەوە دەتوانین بەو بەرئەنجامە بگەین کە هیچ تاکە کەسێکی تەندروست ناتوانێ گەشەبکاو سەر دەربهێنێ لەخاکی ستەمکارییەوە.

ئەو هەموو ناهەمواریو پەشێوییە سیاسییەی نێو سیستەمی ستەمکاری خۆی نیشانەی ناڕێکیو نەخۆشییەکی قوڵترە کە وا لەناو رۆحدا، نەك رۆحی ستەمکار بەتەنیا بەڵکو رۆحی رەعیەتو حەشاماتی ستەمکاریش. لەکاتێکدا کەسی عادل "دەبێتە هاوڕێی خۆی"، کەسی ناعادل رۆحێکی هەیە کە لەجەنگدایە لەگەڵ خۆی، رۆحێك کە بەشەکانی یەك دژی ئەوی دیکەیە، کەسی ناعادل بۆ هەمیشە دەرگیری کێشمەکێشێکی رۆحی مەدەنییە. تائێرە چەند تێبینیەکی گشتیمان خستەروو، ئێستا با سەیرێکی کتێبی ٨،٩ی کۆمار بکەین بەشێوەیەکی سیستماتیکی تر.

لەکتێبی هەشتەمی "کۆمار.."دا ئەفلاتوون ئەوەمان نیشاندەدا کە چۆنو بۆچی شاری ئایدیاڵ پیر دەبێتو سەرەو لێژدەبێتەوە،و چۆن ئەم سەرەو لێژبوونەوەیە بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێ تا دەگاتە پەتای ستەمکاری کە بریتییە لەهەڵوەشاندنەوەیەکی تەواوی شاری ئایدیاڵ. قۆناغەکانی سەرەولێژبوونەوە شایانی ناسینەوەن، شاری ئایدیاڵ سەرەتا هەنگاوێ دادەبەزێ بەرەو تیموکراسی Timocracy ، مەست بوو بەعیشقی شەرەف honour ، ئنجا هەنگاوێکی دی دادەبەزێ بەرەو ئۆلیگارشی، سەرمەست بوو بەعیشقی سامان، ئنجا بەرەو دیموکراسی حاڵ لێهاتوو بەعیشقی ئازادی، لێرەشەوە هەنگاوێکی سەرەو لێژتر بەرەو غەرق بوون لەنێو ستەمکاریدا کە هیچ نییە جگە لەحاڵەتێکی ئارەزووکردنی بێسنور.

پێش ئەوەی کەشاری بەستەمکاری کراوو ستەمکارو رۆحی ستەمکارانە تاقی بکەینەوە پێویستە سێکێچێکی شاری دیموکراتو پیاوی دیموکرات بکێشین. ئەم کارە پێویستە چونکی لەدوا شیکردنەوەدا ستەمکار هیچ نییە جگەلە بەرجەستەبوونی هەموو ئارەزوو ئاواتە دیموکراسیەکان، دیموکراسیش هیچ نییە جگە لەدایکی ستەمکاری.

دیموکراسی(٩) یاخود شاری دیموکرات ئەوکاتە سەرهەڵدەدا کە شاری ئۆلیگارشی بەهۆی تەماعی لەرادەبەدەرەوە داغان دەبێت، ئەوکاتەی لەژێر سایەی ئۆلیگارشیدا نە ئارەزووی سامان‌و نە سامان خۆی هیچ سنورێك ناناسنەوە. ئەم نا ـ اعتدالی یەی فەرمانڕەوایەتی شار دەبێتە مایەی نا ـ اعتدالی فەرمانڕەوایەتی بەسەردا کراوەکان واتە رەعیەت. ئەوان لەلایەن یاساوە سنورێکیان بۆ دانانرێ تا موڵك‌و ماڵیان بەهەدەر نەدەن لەبەرئەوەی هەژار دەبن،و ئنجا حاڵەتێك دێتە پێش کەتێیدا هەژار رقی لەدەوڵەمەند دەبێتەوەو دەکەوێتە پیلان دانان‌و دژی سەروەندمەند. بەم شێوەیە شار دەکەوێتە ناو ململانێی ناوخۆوەو ئەوکاتەش کە هەژارەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا دیموکراسی سەرهەڵدەدا.

دیموکراسی لەسەر دوو پرنسیپی ناگونجاو بەندە یەکسانی‌و ئازادی. یەکسانی دابەشکردنی هاونیشتمانێتی Citizenshiph و پلەوپایەو وەزیفەکان دیاریدەکا.(١٠)و ئازادیش ئەوە رادەگەیەنێ کە هەر کەسە چی دڵی بخوازێ دەتوانێ بیکا. پرنسیپی دووەم تەنیا بەناوە Nominl ، چونکی هەلومەرجەکانی ئەگەری راستەقینە پشت گوێ دەخا.

لەبەشی(9-5 558d)ی کۆماردا، سوکرات لەجیاوازی نێوان ئارەزووە پێویستیەکان‌و ئارەزووە لاوەکیەکان دەدوێ. سوکرات مانای پێویست فراوان دەکا تاکو هەر ئارەزوویەك بگرێتەوە کە تێرکردنی دەبێتە مایەی چاکە بۆ ئێمە (هەمووان)و ئەو ئارەزووانەش ناو دەنێ لاوەکی یا پێویست نەبوو کە یا ئەوەتا تێرکردنیان نابنە چاکە بۆ ئێمە یاخود ئەوانەی کە لەراستیدا دەبنەمایەی ئازار بۆئێمە، هەروەها ئەوانەش کە کەسێك دەتوانێ دەست بەرداریان بێت گەر بێت‌و لەلاوێتیەوە کار بکا لەسەر وازهێنان لێیان. لێرەوە ئینسانی دیموکرات لێوانلێوە لەکێشمەکێشی نێوان ئارەزووە پێویستەکان‌و ئارەزووە پێویست نەبووەکان، ئینسانی دیموکرات بەنەبوونی پلان‌و رێکخستن لەژیانیدا دەناسرێتەوە. لەشاری دیموکراتیدا زۆر دیاردەو گروپ دەبینینەوە، هاوپەیمانێتی سەربازی، میلیشیاو میلیشیای دژ، مەنفی‌و کەسی گەڕاوە لەمەنفا.. .. هتد. گەنجەکان گوێ لەهەموو ئەوکەسایەتیانەو ئەو گوتارانە دەگرن کە لەوفەزایەدا دادەرێژرێن. گوتارەکان تەشویقی بێ شەرمی دەکەن بەناوی پیاوەتیەوە، بێ ئەدەبی بەناوی پەروەردەوە، ئانارکی لەبەرگی ئازادیدا، توڕەهات وەك مەزنێتی. ئەم گوتارانە بەناوی ئازادییەوە. داو پێنگو اعتدال‌و شەرم تووڕهەڵدەدەن. لەئەنجامدا، سوکرات (لەبەشەکانی 564b 562)دا دەڵێت. هەروەك ئۆلیگارشی، دیموکراسیش خاپوور دەبێت لەلایەن زیادە رۆیی کردن لەوشتەدا کە وەك چاکە لەقەڵەمی دەدا ئەویش

ئازادییە. لەدیموکراسیدا ئازادی تا سەر سنووری ئانارکی هەڵدەگیرێت بەو شێوەیەی کە هەرهەموو وەك یەك مامەڵەیان لەتەك دەکرێ‌و وەك یەك هەڵس‌و کەوت دەکەن، لەبەرئەوەی هەر هەموو هەولدەدەن دوورەپەرێزی بکەن لەوەی وا دەربکەون کە کۆنترۆڵ دەکرێن ئەم زیادە رۆییە لەئازادیدا رژێم بەرەو ستەمکاری دەبا، لەم حاڵەتەدا ئازادی زۆر کۆیلایەتیەکی زۆر بەرهەمدەهێنێ.

لەبەشی 562دا سوکرات دەستدەکاتە قسەکردن لەسەر ریشەکانی ستەمکاری، ئەوەی گرنگە ئەو جیاوازییەیە کە ئەو دەیکات لەنێوان کازیوەی ستەمکاری‌و ستەمکار لەلایەك‌و خاسیەتەکانی ستەمکاری‌و خاسیەتە ستەمکاریەکان لەلایەکی دیکەوە. لەبەشی 565dدا سوکرات پرسیارێك دەربارەی گواستنەوە لەسەرکردەی خەڵکییەوە بۆ ستەمکار دەخاتە بەردەم هاو دایەلۆگەکان‌و هەر خۆشی لەرێگای وێناکردنی سەرکردەیەکەوە کە بەزۆرە ملێ خۆی بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنێ وەلامدەداتەوە. لەو وێناکردنەی سوکراتدا ستەمکار لەترسی دوژمنەکانی کۆمەڵێ پاسەوان بەکرێ دەگرێ. ستەمکار پەیمان بەخەڵکی دەدا بەکردنی کاری سەر سوڕهێنەر، دیارە زۆربەی ئەو کارانە بەجێ ناگەیەنێ. لەجیاتی ئەوە لەرێگای جەنگەوە مەشغوڵیان دەکاو ئاراستەی نەزەریان بەشوێنێکی تردا دەباو ئنجا لەرێگای داواکردن لێیانەوە کە دەبێت بەشداریان هەبێت سەرگەرمیان دەکا لەنێو ژیانی رۆژانەدا. هەنگاو بەهەنگاو هەموو کەسێکی چاك‌و خاوەن ویژدان (566ds) لەناو دەبا، بگرە یارو هاورێکانی خۆشی، ئەوانەی کە بوێرن رەخنەی لێبگرن. لەئەنجامدا ئەو دەبێتە شوێنی رق‌و بوغزی خەڵکی‌و ترسیش لەژیانی خۆی رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت. لێرەوە شارێك کە رۆژێك ئازادبوو ئێستا نائازادو هەژاری هەژارو پڕ لەترس‌و کێشمەکێش. سوکرات دەڵێ ستەمکار دەبێت بەچاوێکی تیژبینیانەوە چاو ببڕێتە کەسی دلێر، کەسی خاوەن عەقڵی گەورە، خاوەن زانین‌و دەولەمەند. بۆ ئەمانە روو دەدەن؟ سوکرات ئەم تەفسیرە دەخاتە روو، واتە ئەو تەفسیرەی کە دەڵێ شاعیرانی درامانووسی، شاعیرانی تراژیدی نووس‌و بەتایبەت یورپیدیس لێپرسراون لەستەمکاری لە (568ab – b6). شاعرانی تراژیدیا مەدحی ژیانی ستەمکار دەکەن‌و خۆشیان وەك حەکیم‌و هاورێی ستەمکار سەیردەکەن، شانۆنامەکانیان لەشارەکاندا بلاودەبنەوە، خەڵکی بەلای ستەمکاریدا رادەکێشن. ئەوان ئیعجابی خۆیان لەمەڕ دەستەلاتی ستەمکارەوە نیشان دەدەن هەستکردن بەسەر سوڕمانی لەبەردەم دەسەلاتی ستەمکاردا،و بەم شێوەیەش رەوایەتی بەستەمکاری دەبەخشن‌و کارێك دەکەن کە ستەمکاری شایانی قبولکردن بێت. لەمە گرنگترو ترسناکتر ئەو دیدەیە کە شاعیرەکان لێوەی لەشتەکان دەڕوانن کە دیدێکە دەتوانین

ناوی بنێین "دیدی مانای تراژیدی ژیان" یا "دیدی تراژیدیانەی ژیان" کە ئەم دیدە لەریشەدا دیدێکی ستەمکارانەیە. زمانی تراژیدیو دیدی تراژیدیانە ناڕەوا (ستەمکاری) بەڕەوا دەکا، ئەوەی کە ناشێ کارێك دەکا شیاوبێت یا شایانی قبوڵکردن، مانای پاڵەوانانە، پاڵەوانی تراژیدیو وێنەی شای خۆرهەڵاتی بەستەمکار دەبەخشێ. ئەمە لەکاتێکدا کە ستەمکاری تەنیا یەك مەغزا لەخۆدەگرێ ئەویش ئەوەی کە ستەمکاری جۆرە هەلومەرجێکە. کە تێیدا کەس ئازاد نییەو هەرهەموو دەبێت لەبەردەم ستەمکاردا بەچۆکدابێن هەروەك چۆن لەبەردەم خوادا بەچۆکدادێن. بینەرانو گوێگرانی تراژیدیا تەشویق دەکرێن کە غەم بۆ لەدەستدانی بەربەریانەی یا ئازاری ئەم ستەمکارە لەخودا چوە بخۆن، ئنجا دەگەیەنرێنە ئەو قەناعەتەی کە لەزەینی خۆیاندا وێنای بێ ئەخلاقی وەك مەسەلەیەکی ئاسایی وێنابکەن، وەك ئەوەی کە جوانی لەعەدالەت جیابکرێتەوە.

سوکرات دیموکراسی دەبەستێتەوە بەستەمکارییەوە، پەیوەندی ئاشکرای نێوان ئەم دوو رژێمە لەسەرەتای کتێبی دووەمی کۆماردا لەلایەن گلاوکۆنەوە پێشنیار دەکرێ. زۆربە (the Multitude) هیچ عەشقێکی نییە بۆ عەدالەت، بەپێچەوانەوە تاسەی ژیانی ستەمکار دەکا. هەموو ئینسانێك ستەمکارە، یاخود فەنتازیای دیموکرات وانیشاندەدا. ئامانجی سوکرات لەم وێناکردنەدا ئەوەیە کە نیشانی بدا ئەم ژیانە، ژیانی دیموکراسی، چێژی ناعەدالەتی هەیەو کاریگەری عەمەلی ئەم ژیانەش بریتیە لەلاوازکردنی بەرگریکردن لەستەمکاری. لەگەڵ ئەمەدا بازنە یا سووڕی عەدالەت کە لەکتێبی یەکەمدا دەست پێدەکا تەواو دەبێت. عەدالەت لەستەمکاریدا هیچ نییە جگە لەوەی کە سراسیما خۆس هەر لەسەرەتاوە رای وابوو کە هەیە ئەویش: عەدالەت بریتییە لەبەرژەوەندیو ئیرادەی کەسی بەهێز. لێرەدا ستەمکار دوای لاوازکردنی خەڵکی ئەو کەسە بەهێزەیە. لەکاتێکدا کە عەدالەت کورتکرایەوە بۆ دەستەڵات، خەڵکی لاوازو بێ هێز ئیدی هیچ ئیختیارێکیان نییە جگە لەتەسلیم بوون، ئیدی دەبنە کۆیلەی کەسی کۆیلە. ئێستا پرسیاری سوکراتو ئەدەمەنتیوس ئەمەیە:

**"ئەوەی دەمێنێتەوە، بۆشوێنی سەرنجدان خودی کەسی ستەمکارە، چۆن ئەو لەکەسی دیموکراتەوە گۆڕاو ئنجا کاتێك هاتە بوون، چ جۆرە ئینسانێکەو چۆن دەژی حەقیرانە یا نەجیبانە"(١١).**

ئێمە پێویستە لەسەردوو ئاست سەیری کێشەکە بکەین، ئاستی سیاسیو ئاستی تاکەکەس. لەسەر ئاستیسیاسی، هۆی گۆڕانی سیاسی دەگوترێت بریتییە لەدابەش بوونو ناکۆکی ناو شار خۆی. کێشمەکێشی هەرسێ بەشەکەی دیموکراسی ڕێگادەداو کۆمەك دەکا تا ستەمکاری سەرهەڵبدا، مەبەستی لەسێ بەشەکە، چینی فەرمانڕەوا، پارەدروستکەران، کۆمەڵانی خەڵك. بەم شێوەیە جەنگو جەدال ئەوکاتە دەستپێدەکا کە سەرکردەکانی خەڵك هەوڵدەدەن تا دەستیان بەسامان رابگا بۆ خۆیانو بۆ خەڵکیو دەوڵەمەندەکان تاوانبار دەکەن کە دژی خەڵکینو خەریکی پیلانن. لێرەدا خەڵکی جێو مەقامی پیاوێك بەرزدەکەنەوەو وەکو سەرکردەو رابەری خۆیان حیسابی بۆ دەکەن، ئا لەم حاڵەتەوە ستەمکاری سەرهەڵدەدا. سوکرات دەڵێ:

**"ئایا خەڵکی هەمیشە خوویان نەگرتوە بەوەی کە پیاوێك وەك سەرکردەیەکی تایبەتی خۆیان دابنێنو پەروەردەی بکەنو کارێك بکەن تا بێ دەستەڵاتی زیاتر بێ؟" ، " بەڵێ ئەوان خوویان بەجۆرەکارێکی لەوشێوەیە گرتووە. کەواتە ئاشکرایە، من گووتم، کەستەمکار بەسروشتی گەشە دەکا، ستەمکار لەریشەی سەرکردایەتیەوە گەشەدەکا، نەك لەهیچ شوێنێکی ترەوە".(١٢)**

پیاوێك لەوجۆرە دەستەڵات بەسەر خەڵکیدا پەیدا دەکاو روو لەهەر جۆرە تاوانێك دەکا تا دەستەڵاتی زیاتر بەدەستبهێنێ، ستەمکار بەشێوەیەکی گشتی هەوڵدەدا شەڕ بەشارەکانی دراوسێ بفرۆشێ تا ئاوو هەوایەك بخولقێنێ کە خەڵکی پێویستیان بەسەرکردەبێتو سەرقاڵی ئەوبنو بیر لەپرسیاری گرنگو کاروباری شارنەکەنەوە. لێرەوە ستەمکار بریتییە لەبەرجەستەبوونی هەموو ئارەزوو و ئومێدە دیموکراتەکان، ئەوشتە دەکا کە ئارەزوودەکا، ئەو بابەتی هەموو ئارەزووە دیموکراتیەکانە، ئەو خۆی ئیرۆسە.

لەسەر ئاستی تاکەکەسیش، لە کەسی ستەمکاردا ئەوە ئارەزووە پێویست نەبوەکانە کە بەهێزنو باڵادەست. ئەو ئارەزووانەکامانەن، ئەدەمانتیوس پرسیاردەکا، لەوەڵامدا سوکرات باس لەجیهانی خەون دەکا.

بەڕای سوکرات کەسایەتی ستەمکارانە لەناو هەریەکێك لەئێمەدا خەوتوە یاخۆی مەڵاس داوەو تەنیا لەخەوبینینەکاندا خۆی نیشان دەداو کارێك دەکا بناسرێتەوە، ئەوکاتەی کە کەس سڵناکاتەوە لەوەی هەوڵبدا پەیوەندی سێکسی هەبێت لەگەڵ

دایکی خۆی، لەگەڵ هەرئینسانێکی دی، لەگەڵ خودا، هەمووشت قەسابی بکا، ئارەزووی هەموو جۆرە خواردنێك دەکا. سوکرات ئەم ئارەزووانە ناو دەبات بەو ئارەزوانەی کە یاسا ژێر پێدەخەن، بەڵام ناویان نابات بەئارەزووە ناسروشتیەکان. ئەم ئارەزووانە لەئەگەری واقیعی جیابوونەتەوە. ئەم ئارەزووانە پێویست نین بۆ مانەوەو چاك بوونی تاکە کەس. ئارەزووە ئاژەڵییەکان و کێوییەکان ئەو کاتە بەخەبەر دێنەوە کە بەشەحەکیمەکانی رۆح دەخەون. ستەمکارو شارێك کە لەلایەن ستەمکارەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرێت دووچاری پەتایەك دەبن کەتێیدا رێنومایی عەقڵ و مەستی بەشەرەف تووڕ هەڵدەدرێن لەپێناو ئارەزوە بێ سنورەکاندا. ستەمکاری رێکخستنێکی سیاسییە کەتێیدا چ ستەمکارو چ رەعیەت لەگێژەڵووکەی ئارەزوو و خۆڕازیکردندا گیریان خواردووە، کلتورێکی سیاسی کە دەشێت بەچێژ پەرستی Hedonism ناوڕیزی بکەین. لێرەوە دەتوانین ئەوە ببینین کە دەستەڵاتی ئابووری و سیاسی هەردووك هەم رەنگدانەوەو هەم هۆی کلتووری ستەمکارین. ستەمکاری پشت بەکلتورێ دەبەستێت کە فێرمان دەکا چۆن هەڵسوکەوت بکەین، چۆن بیربکەینەوەو چۆنیش هەست بکەین.

ستەمکار ئەو کەسەیە کەلەلایەن ئارەزووەوە لێدەخوڕدرێ. لەدیالۆگی گۆرگیاسدا پۆلیوس دەڵێت گەر ئەو ستەمکار بوایە، ئەو هەرچی دڵی خواستبا دەیکرد.

**"پۆلیوس: کەواتە تۆ دەتەوێ یاحەزدەکەی ئازار**
**بەدەست ناعەدالەتیەوە بچێژی وەك لەوەی خۆت**
**ناعەدالەتی بکەیت.**
**سوکرات: بەش بەحاڵی خۆم هیچیانم ناوێ،**
**بەڵام گەر بێت و بڕیاربێت یەکێك لەوانە بیت، ئەوامن**
**بێ دوودڵی ئازار بەدەست ناعەدالەتیەوە**
**هەڵدەبژێرم وەك لەوەی خۆم ناعەدالەتی بکەم.**
**پۆلیوس: کەواتە حەزناکەی ببیتە ستەمکار؟**
**سوکرات: نەء، گەر مەبەستت لەبوونە ستەمکار**
**ئەوەبێت کە من چی دەکەم.**
**پۆلیوس: مەبەستم لەوەیە کە تۆزێ پێش ئێستا**
**گوتم، لەمەوقعێکدا بیت کە هەرشتێك بکەیت کە**
**بزانی دەگونجێ بۆ شار، جاکوشتنی خەڵك بێت، یا**
**رەوانە کردنیان بۆ مەنفا، یاخود کردنی هەر شتێك و**
**هەمووشتێك کە تۆ وابیبینی کە گونجاوە".(١٣)**

ستەمكار ئەو كەسەیە كە بەرۆژی رووناك سەرقاڵی تێركردنی ئەو ئارەزووانەیە كە ئێمە تەنیا لەشەوداو لەخەودا خەویان پێوە دەبینین.
لای سوكرات ئیرۆس سەرۆكی یاخی هەموو ئارەزووە نا یاساییەكانە، هەروەك چۆن ستەمكار سەرۆكی یاخی بەشە فاسدەكەی شارە. گەر كەسێ بەم وەسفە ناڕازی بێتو مەبەستی لەئیرۆسی سوكراتی بێت یا ئیرۆسی دایۆتیما بێت لەدایەلۆگی سیمپۆزیەمدا، ئەوا ئەم ناڕازی بوونە شوێنی قبوڵە، بەلام ئەم ئیرۆسەی كە لێرە قسەی لەسەردەكەین ئەو ئیرۆسەیە كە لەلایەن شاعیرەكانەوە بەمەزنی سەیردەكرێو ناوی ستەمكاری لێ دەنرێ. ئیرۆسی شاعیرەكان تەنیا ئارەزوو نییە بەڵكو بایەتی هەموو ئارەزوەكانە كە لەرێوەی عاشق مەعشوقەكەی دەكاتە بكەری عیشقو لێپرسراو لەعیشقی. لێرەوە ئیرۆس وەك مەعشووق لێوانلێوەو وەك عاشقیش خاڵی خاڵیی، ئەو هەردوو بەش لێك دەدا، رەتكردنەوەی تەواوی عاشق لەگەڵ كۆنترۆڵكردنی تەواوی مەعشوق.
رەعیەتی ستەمكاری بەحەماسەوە وێڵی شتەبچووكە بێ جەوهەرەكانن. ئاشكرایە كە ئەفلاتوون قێزی لەرەعیەتی ستەمكاری دەبووەوە زیاتر وەك لەكەسی ستەمكار چونكی بەلانی كەمەوە كەسی ستەمكار كاری گەورەی لێدەوەشێتەوەو كەسی ستەمكار هەڵگری ئەگەری فەیلەسوف بوونە بەلام حیكمەتی لەدەستداوە. ئەگەری ستەمكاربوون ئەگەری فەیلەسوف بوونیشە لەبەرئەوەی ئەو رۆحانەی كە دەتوانن ناعەدالەتی باوەرپێنەكراو ئەنجام بدەن ئەوەندە بەتوانان كە بتوانن عەدالەتیش بناسنەوە. لەفەیلەسوفدا ئەوە ئیرۆسێكی بەدەستەلاتە كە دەست بەسەر رۆحی فەیلەسوفدا دەكێشێ، ئیرۆسی مەعریفی، ئیرۆسێ یا دێوانەییەكی نێردراوی ئاسمان"، فەیلەسوف لەم حاڵەتەدا ئارەزووی ئەو شتەدەكا كە سەرمەدییە، حەقیقەتو زانینی چاكە. لەكەسی ستەمكاردا ئیرۆس دەبێتە سەركردەی هەموو ئارەزووە پێویست نەبووەكان. ئیرۆس، ستەمكارەكەی ناو رۆح، دێوانەیی دەكاتە پاسەوانی خۆی، بەم شێوەیە هەموو ئیعتدالێك تێكدەچێو دێوانەییەكی غەریب رۆح داگیردەكا:

**- "ئایا هەر لەبەرئەم هۆیەیە کە عیشق هەر لەدێرزەمانەوە ناو نراوە بە " ستەمکار"؟**
**+ پێدەچێ.**
**- هەروەها هاورێم، من گوتم، ئایا پیاوی سەرخۆش لەعەقڵیدا وەرچەرخاندنێکی ستەمکارانە هەیە؟**
**+ راستە.**
**- لەمەزیاتر، ئەو پیاوەی دێوانەیە وا تەسەور دەکا کە بتوانێ نەك حوکمی ئینسانەکان بەڵکو هی خوداکانیش بکا. کەسێ دەبێتە ستەمکار یا بەسروشتی یا بەپراکتیك یا بەهەردووك، ئەو مەست دەبێت، دەبێتە ئیرۆتیکی، میلانکۆلیك (ماخۆلانی)."(١٤)**

لەنێو ئارەزوە جیاجیاکانی بەشە نزمەکەی رۆحدا، ئیرۆس لەلایەن سوکراتەوە واسەیردەکرێ وەك ئەوەی سروشتێکی تایبەتی هەبێت کە وادەکا ببێتە سەرکردەی ئارەزووەکانی دیو دواجاریش ببێتە ستەمکار. لەپیاوی ستەمکاردا ئیرۆس رێنومایی هەموو کردارەکان دەکا ئەمەش دەبیات بەرەو هەموو جۆرە تاوانێكو هەڵسو کەوتی بێ شەرمانە. ئەو لەراستیدا دەبێتە ئەو کەسەی نێو خەونەکان، ئەو خەونانەی کە ئارەزووەکانی تێیاندا خۆیان بەیان دەکەن، لەبەرئەوەی ئەو ناعادلە بەمانای ووشەی ناعادل بوون. ئەو کاتەی ئیرۆس زاڵ دەبێت، ئەو بەشەی رۆح فەرمانڕەوایەتی دەکا کە هەرگیز نەگونجاوە بۆ ئەو کارە، لەجیاتی عەقڵ کە بەسروشت گونجاوترە بۆ ئەرکی. فەرمانڕەوایەتی کردن. فەرمانڕەوایەتی ئیرۆس بێ بەشە لەرێنومایی تاکو تێرکردنی ئارەزووە پێویستەکان، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی کە کۆنترۆڵ بکرێ لەلایەن ئیرۆسەوە، بەم شێوەیە ئەو ناتوانێ جەغد بخاتە سەر سادەترین ئەرك لەنێو شاردا. ستەمکار سێبەرەکانی ئەشکەوتە لەرووناکیدا. ستەمکار بەرجەستەبوونی ئیرۆسە. لەمەزیاتر، ستەمکار بەیانکردنی بەسیاسیکردنی تەواوی ئارەزووە، لێرەدا مەترسیو عەشق دەبنە یەك.

دەتوانین تا ئێرە بە چ بەرئەنجامێك بگەین لەقسەکانی سوکراتەوە؟ ئەوخاڵە دەبێت شوێنی جەغدکردن بێت ئەوەیە کە ئیرۆس رۆح دەکاتە ستەمکار، کەسی ستەمکار ماخۆلانییەو تەنیا نایەوێت حوکمی ئینسانەکان بکا بەڵکو دەشیەوێ حوکمی خوداکانیش بکا. لەهەریەك لەئێمەدا ستەمکارێکی بوون بەهێز خەوتووە، دواجار ستەمکاری لەروودانیدا رەنگە نائاسایی بێت بەڵام ئەگەری ستەمکاری

حەقیقییەو لەویٚ بوونێکی هەمیشەیی هەیە. سوکرات پێش ئەوەی قسە لەسەر بەکۆیلەکردنو ناعەدالەتی بکا، هەنگاوێکی دیکە دەنێت بۆ جەغدکردنە سەر ئەو جیاوازیەی نێوان ستەمکارو ستەمکارانە (Tyrannical). ئەم بابەتە پرسیاری عەدالەتمان بیردەخاتەوە لەکتێبی دووهەمدا (کۆمار). میتۆدی بنەڕەتی بۆگەڕان بەدوای عەدالەتدا لەکتێبی دوهەمدا بریتی بوو لە بەراوردکردنی شارو رۆح. هەر رژێمە ئینسانێکی هەیە کە رۆحی یەکسانە پێی. لەئەنجامدا رۆحی ستەمکارانە هەیەو شاری ستەمکارانە، لێرەوە دەتوانین لەپیاوی ستەمکارانە بڕوانین وەکو حاڵەتێکی شەخسی Private و حاڵەتێکی مەدەنی (گشتی) publc . لەبیرمان بێت کە لەکتێبی دووهەمدا سوکرات ژیانی کەسی عادلو کەسی ناعادل بەراورد دەکاو لەو باوەڕەدایە کە کەسی عادل چاکترە لەکەسی ناعادل. لەکتێبی نۆهەمدا یەکەم ئەرگومێنتی خۆی دەخاتە روو کە بۆچی پێی وایە کەسی عادل لەکەسی ناعادل چاکترە. سوکرات ئەوە بۆ گلاوکۆن دەستنیشان دەکا کە ئەو سەبارەت بەهەردوو کەسی تایبەت (ستەمکارانە) کەبەختی نەیهێناوە بێتە ستەمکارو ئنجا ئەوکەسەش کە بەڕاستی بۆتە ستەمکار دەدویٚ (578c3). ئەم پیاوە ستەمکارانە، کەسانی شەخسی یا تایبەت بەئاسانیو یەکسەر ناناسرێنەوە. لەبەشی (1 577c5)دا سوکرات ئەوە بۆ گلاوکۆن دەست نیشان دەکا کە ئەو سەبارەت بەهەردووکەسی تایبەت (ستەمکارانە) کە بەختی نەیهێناوە بێتە ستەمکارو ئنجا ئەو کەسەش کە بەڕاستی بۆتە ستەمکار دەدویٚ. ئەو پیاوە ستەمکارانە، کەسانی تایبەتی، بەئاسانیو یەکسەر ناناسرێنەوە. چونکی ترسو پەشیمانیان، ئازارو هاواریان، هەرگیز لەبواری مەدەنی یا گشتیدا خۆیان دەرناخەن. بەلام دووبارە پرسیارەکە ئەوەیە چۆن کەسی ستەمکارانە دەبێتە ستەمکار بەفعلیو چ هەلومەرجێك پێویستە بۆ ئەم گواستنەوەیە؟ لەبەشی ( 578 579 )دا سوکرات وێنای پیاوێك، سەرۆك خێزانێکمان بۆ دەکێشێ، وەك نمونەیەك بۆ روونکردنەوەی مەبەستەکەی نەك مەبەستی بێت بلێت "ستەمکار" ئاوها سەرهەلدەدا، لەو وێناکردنەی سوکراتدا داوامان لێکراوە سەرۆك خێزانێك ببینین کە لەبەر هەر هۆیەك بێت بەخۆیو مالو مندالو کۆیلەو خزمەتکارەکانیەوە لەدەرەوەی شار، لەشوێنێکدا، لەچۆلەوانیەکدا نیشتە جێبن، لەوشوێنەی کە دەستی بەهیچ یارمەتییەکدا ناگا. لەترسی ژیانیو مالو مندالی رەنگە هەندیٚ لەکۆیلەکانی ئازاد بکاو پەیمانیان پێبداو زیاتر سەرقالی تەمەلوق بێت بۆ خزمەتکارەکانی. گەر چەند خێزانێکی دیکە لەو دەوروبەرە نیشتەجیٚ بن ترسو نائارامی ئەوپیاوە زیاتر دەبێتو لێرەوە ئەم وەك دوژمن سەیریان دەکاو هەست بەوەدەکا کە چوار دەوری بەدوژمن گیراوە بوونی

کەسایەتیەکی ستەمکارانە لەناخداو هەبوونی ترس‌و نەبوونی بڕوا بەئەوانی دیکەو هەبونی حەزکردن یا ئارەزووی کۆنترۆڵکردنی ئەوانی دیکە، ئەمانە ئەوخاڵانەن کە سوکرات لەو وێناکردنەدا دەیەوێت سەرنجمان بۆی رابکێشێ. "ئەو پیاوەی کە لەناخیدا رژێمێکی خراپ هەیە، پیاوی ستەمکارانە، ئەوەی کە ژیانی تایبەتیانەی خۆی ناژی‌و بەڵکو بەهۆی شانسێکەوە دەبێتە ستەمکار، کۆنترۆڵی خۆی بۆناکردرێ کەچی هەوڵدەدا حوکمی ئەوانی دیکە بکا، هەروەك ئەوەی کە کەسێك بەجەستەیەکی بیمارەوە لەجیاتی ئەوەی لەشوێنێکی تایپەتیدا ژیان بەسەربەرێ ناچاربکردرێ لەزۆران‌و جەنگ‌و ململانێییەکدا دژ بەجەستەکانی دی بەشداری بکا..
.. ئایا بەراستی ئەمە هەلومەرجێکی ئەستەم نییە؟ ئایا ژیانی ئەو پیاوەی کە ستەمکارە ژیانێکی سەخت تر نییە؟.. ..(١٥)" بەپێی بەشی (80- 578) ستەمکاری بەدبەخت ترین شارە چونکی چ شار وەکو گشت‌و چ هاونیشتمانیان لەنێویدا هەر هەموو کۆیلەن‌و کەمترین شت دەتوانن بەئەنجام بگەیەنن. بەهەمان شێوە ستەمکار بەدبەخترین بوونەوەرە لەبەرئەوەی ستەمکار ئەزمونی ئەشکەوت دەکا، مەبەستیش لەئەشکەوت وێنا یا لێك چواندن یا ئەنالۆژی ئەشکەوتە لەکتێبی "کۆمار"دا، مەبەستیش وێناکردنی واقیعی ئینسانییە. ستەمکار دیلی نێو ئەشکەوتەو تەنیا وەهمەکانی ئەشکەوت دەخوازێ. لێرەوە کەسی زۆر ناعادل بەناچاری ستەمکارێکە کە ستەمکارانە چ خۆی‌و چ شار بەرێوەدەبا.

لەدایەلۆگی "گۆرگیاس"دا، سوکرات سیاسەت پێناسەدەکا وەك "هونەرێك کە ئیشی ئەوەیە بەتەنگ رۆحەوە بێت".و فەرمانڕەواش وەکو دکتۆر پێناسەدەکا. دکتۆر هەم نەخۆشی دیاریدەکاو هەم هەتوان، چارەسەر، گەرچی زۆر جاران دەرمانێك کە دکتۆر پێشنیاری دەکا یاخود چارەسەرێك بۆنەخۆشی کەسێکی نەخۆش زۆرجار تاڵە بەڵام لێرەدا ئازادییەك لەئارادانییە، واتە دەبێت تاڵی، یا ئەو بڕیارە، قبولْ بکردرێت گەر لەش ساغی بخوازێ. لەبەرانبەر ئەمەدا، ستەمکارەکان لەچێشت لێنەرەکان دەچن کە دەستەڵاتی خۆیان بەسەرماندا دەسەپێنن لەرێگای رازیکردنی تام‌و زەوقە فاسدبووەکەی ئێمەوە. ستەمکارەکان خەڵکی تەفرو توونا دەکەن لەرێگای کردنیانەوە بەکۆیلەی کار، کارکردن تەنیا بۆمانەوە، ئیدی ئەوخەڵکانە کاتی ئەوەیان نابێت بەرگری لەستەمکاری بکەن. ستەمکارەکان ئەو دەستەڵاتەی هەیانە دەیپارێزن لەرێگای موجامەلەکردنی زۆربە یا گاڕانەوە، لەرێگای پەیماندان بەرازیکردنی جەماوەرو لەدواجاریشدا هەوڵدان بۆ بوون وەك جەماوەر.
لەرژێمی ستەمکاریدا هیچ کەس سروشتی نییە یا رەسەن، هەرهەموو دەبنە ریاکار، شەکەرۆکە، ئەکتەر بۆ بینینی رۆڵێك یا چەند رۆڵێك، وازی دەکەن‌و تەمەلوق دەکەن

بۆ جەماوەر تاکو بەرژەوەندیە خودیە کانیان بپارێزن. لەستەمکاریدا هەموو کەسەکان ئەکتەرن لەو تراژیدیایەدا کە زۆر دوورە لەتەندروستییەوە دوورە لەوهارمۆنیەوە کە سروشت دەیخوازێ.

بەڵام پرسیاربکەین ئەو شتەچی‌یە کە ستەمکار، بەرجەستەبووی ئیرۆس، تاسەی دەکا؟ ئیرۆس، ستەمکاری ناورۆح، وێڵی چییە. ئیرۆس باڵی بەسەر ژیانی کەسی ستەمکاردا کێشاوەو ئیرۆس سەروەرەو ستەمکاریش کۆیلە، وەك کۆیلەیەکیش لەهیچ سڵ ناکاتەوە بۆ رازیکردنی سەروەرەکەی، واتە ئیرۆس. ئاشکرایە کە ئیرۆس تاسەی چاکە ناکا وەك ئەوەی کە عەقڵ تاسەی چاکە دەکا، تاسەی شەرەف ناکا، تاسەی سامان ناکا وەك ئۆلیگارکیەکان، تاسەی ژیانێکی سادەو چێژی بچوکی ژیانی دیموکراتی ناکا. ئایا ئیرۆس وێڵی ناعەدالەتیەکە کە تاکایەتی‌و تایبەتمەندی هەرتاکێك‌و هەمووشتەکان وێران دەکا، و لەشوێنی تاکایەتی ئاژاوەیەك (کەیاس chaos) بەرقەرار دەکا کەتێیدا هەرشتە هەوڵ دەدا ببێ بەهەموو شتێ؟ هەروەك دیدی شاعیرانەی "دیدی مانای تراژیدیای ژیان" تراژیدیاو مانای تراژیدی دەخوازێ؟ بەڵێ بەرمەبنای ئەرگومێنتی سوکرات دەتوانین بڵێین بەڵێ ئیرۆس خوڵقێنەری کەیاسە. مادامێك ستەمکار ئیرۆسەو ئیرۆسیش فەرمان دەدا کە هەموو ئارەزوەکان بەتایبەت ئارەزووە کیۆبیەکان‌و پێویست نەبوەکان، مادامێکیش ئەم ئارەزوانە ناشێت تێربن چونکی بەشێك لەسروشتیان ئەوەیە کەهەمیشە تینوو برسی بن، کەواتە ئیرۆس وێڵی ناعەدالەتیە، ستەمکاریش، دیلەکەی نێو ئەشکەوت، ئەو تەنیا وێڵی وەهمو خەیالات نییە بەڵکو وێڵی ناعەدالەتییەکیشە کە لەتوانای عەقڵدا نییە وێنای بکا. ئەم پیاوە ئەوبەشەی رۆحی لەدەستداوە کە عەقڵەو ئارەزووەکان لێك جیادەکاتەوە، بەهۆی کۆنترۆڵی ئیرۆسەوە. لەشارێکدا کە زۆربەی خەڵکی موعتەدیل بن چەند رۆحێکی ستەمکارانە رەنگە بتوانن تەنیا چەند بەرئەنجامێکی خراپی مەدەنی بخوڵقێنن بگرە لەدواجاردا خۆیان داغان بکەن، بەڵام لەشارێکدا کە لەو جۆرە کاراکتەرە، کەسایەتی ستەمکاری، ژمارەیان زۆر بێت، لەشارێکدا ستەمکار فەرمانرەوابێت کۆیلایەتی دەبێتە واقیع‌و هەموو کەس دەبنە کۆیلەو لەوانەش خودی ستەمکار، "لەراستیدا" ستەمکار کۆیلەی کۆیلایەتییە، تەمەلوق کەری پیاوە بێ بەهاکانە،" ستەمکار سەروەری ئەوانی دیکە، خودی خۆی کۆیلەی ئیرۆس‌و ناعەدالەتیە، لەبەرئەوەی حیکمەتی عەمەلی لەلایەن ئیرۆسەوە ترۆرکراوە. ئیرۆس نازانێ‌و توانای بەرهەمهێنانی بیرۆکەی نییە. لەبەرانبەر ئەم وێنەیەی ستەمکاردا سوکرات وێنەی فەیلەسوفمان بۆ دەکێشێ وەك کەسێکی عادل کە حوکمی خۆی دەکا. ستەمکارو فەیلەسوف دووکەسن یەکێکیان ناعادل‌و ئەوی

دیکە عادل. ستەمکارو فەیلەسوف تووڕ هەڵدراونەتە نێو سەمایەکی بێ کۆتایی سەرمەدی، هەریەك بۆ ئەوە دەژی کە دژی ئەوی دیکەبێت، یەکێکیان وێڵی ڕێکخستنێکی دروستە، ئەوی دی هەر ڕێکخستنێك تێك دەدا، ستەمکار هەوڵدەدا کەڕێکخستنی ئینسانی وێران بکا، فەیلەسوف ئەرگومێنت پیادەدەکا بۆتێکدانی ستەمکاری، فەیلەسوف ڕەمزی عەقڵەو ستەمکاریش ئیرۆس. دەتوانین لەڕێگای ئەم هێڵکاریەی خوارەوە سەرجەم بۆچوونی ئەفلاتوون لەمەڕ ستەمکارو فەیلەسوف و شارو بەشەکانی ڕۆح (ئارەزوو، عەقڵ، سومۆس) دیاری بکەین کە لەکتێبی کۆماردا خستۆتیە روو:

| ستەمکار لە<br>کتێبی ٩،٨ | فەیلەسوف<br>کتێبی ٧،٦،٥ | شا<br>کتێبی ٢، ٤ |
|---|---|---|
| ئارەزوو | عەقڵ | عەقڵ |
| سومۆس<br>spirit | ئارەزوو | سومۆس |
| ~~عەقڵ~~ | ~~سومۆس~~ | ~~ئارەزوو~~ |

لەو هێڵکاریەدا نیشانەی × دەلالەت لەکەبتکردن دەکا. بەم شێوەیە ڕۆحی شا یا پادشا ئەو هارمۆنیەیە لەنێوان عەقڵ و سومۆسداو تێیدا ئارەزوو جڵەوی دەگیرێ. ڕۆحی فەیلەسوفیش هارمۆنی عەقڵ و ئارەزووەو جڵەو گرتنی سومۆس. هەرچی پەیوەندی بەڕۆحی ستەمکارەوە هەیە بریتییە لەهارمۆنی ئارەزوو سومۆس و کەبت کردنی عەقڵ.

لای ئەفلاتون ستەمکاری بە هەڵە لێتێگەیشتنێکی مانا ڕاستەقینەکەی ڕازی بوونی مرۆڤەو چارەسەرکردنیشی بریتییە لە تەسامی کردن یا بالا بردنی سۆزو هەڵچوونە دەروونییەکان و حەماسەتە بە کەناڵی فەزیلەی ئەخلاق و عەقلی ئەو فەزیلەتانەی کەریشەکانیان وا لەنێو ڕێکخستنێکی سروشتی گەردووندا.

زیاتر لەمە بەڕای ئەفلاتوون ستەمکاری بریتییە لەتاسەیەکی سەرلێشێواوو ئارەزوویەك بۆ ڕازیکردنی ئیرۆس، ئیرۆسێ کە دەشێت لەڕێگای پەروەردەوە ڕاست بکردرێتەوە، واتە پەروەردەکردنی ئیرۆس بەرەو بابەتە گونجاوەکان لەوانە فەزیلەتی مەدەنی و فەلسەفی. سیاسەتمەدارییەتێك statemanship کە لەلایەن فەلسەفەوە ڕێنومایی بکردرێت دەبێتە مایەی سیاسەتێکی سالم و سایکۆلۆژیەتێکی تەندروست. لەگۆرگیاسدا، هەروەك چۆن لەسیمپۆزیەم و کۆماردا، دەتوانین قسە

لەسەر شەوق‌و ئارەزوویەکی پری مۆردیاڵ Premordial (بنەڕەنی)و موتەعالی (ترانسێندێنتاڵ) بکەین. ئارەزوو و شەوقی پری مۆردیاڵ (بنەڕەتی بنچینەیی) بریتییە لەخود هۆشیاری‌و ئنجا رەهەندێکی توندوتیژی بوونی سیاسیانە کە رەگی داکوتیوە لەسومۆسدا Thumos (حەماسەت) بەڵام شەوق‌و ئارەزووی ترانسێندێنتاڵ بریتییە لەئارەزووی راکردن‌و رەهابوون لەسنوورەکانی خودێتی (selfhood) لەرێگای یەك بوونەوە، وحدە الوجود، لەگەڵ ئەوشتەی کە جوان‌و نەمرە، واتە ریشەکەی وا لەنێو ئیرۆسدا. شەرەف‌و خۆشەویستی کە ریشەکانیان وان لەحەماسەتی ئیرۆسدا بریتین لەدوورێگا بەرەو سیاسەتمەداریەتێکی دروست‌و شوێنی رەزامەندی.

# بەندی سێیەم:

## ستەمکاری/ لەناوبردنی شارو خەساندنی مرۆڤو دیلکردنی عەقڵ
## "تەفسیرێکی ئەرستۆییانە"

لەکتێبی یەکەمو دووەمی "سیاسەت" (The politics)دا ئەرستۆ باس لەریشەی شار دەکاو ئەوەش روون دەکاتەوە کە بۆچی ئینسان ئاژەڵێکی سیاسییەو بۆچی شار (polis) سروشتییە.

**شار سەر بەو کلاسی بابەتانەیە کە بەسروشت بوونی هەیە،و مرۆڤیش بەسروشت ئاژەڵێکی سیاسییە. هەرکەسێك بەهۆی سروشتییەوە نەك بە هۆی بەدبەختییەوە شاری نەبێت یا زۆر خراپە یا زۆر چاکە.. یا ئاژەڵە یا خودایە(۱).. دیارە ئاشکرایە کە مرۆڤ ئاژەڵێکی ساسییەو بەومانایەی کە هەنگ ئەو بوونەی نییە.. سروشت وەك ئێمە دەڵێین، هیچ شتێك ناکا بێ مەبەست. سروشت لەنێو هەموو ئاژەڵەکاندا تەنیا بەمرۆڤ دەسەڵاتی گوتاری بەخشیوە.(۲)**

پێش ئەوەی قسە لەسەر ئەو کۆتە (اقتباس)ەی سەرەوە بکەین، گرنگە کە سەرنج بدەین لەوراستیەی کە ئەرستۆناڵێت مرۆڤ ئاژەڵێکی کۆمەلایەتییە وەك ئەوەی کەرۆژانە بەهەڵە دووبارە دەکرێتەوە، بەڵکو دەڵێت ئاژەڵێکی سیاسییە، جیاوازی کۆمەلایەتی بوونو سیاسی بوون ئاسمانو ریسمانە. کۆمەلایەتی بوون ئاستی خێزانو کۆمەڵەکانی دی پێش سیاسەت دەگەیەنێت. ئاژەڵی سیاسی کۆمەلایەتی بوون لەخۆدەگرێ بەلام کۆمەلایەتی بوون مەرج نییە سیاسی بوون لە خۆبگرێ. ئاژەڵی سیاسی واتە دەرگیربوون لەگەڵ بواری گشتیو مەدەنی (public)، بواری مەدەنیش ئەوکایەیەیە کەتێیدا گفتوگۆی سیاسی لەمەڕ هەموو رەهەندەکانی بوونەوە بەرمەبنای عەقڵ ساز دەدرێ. بەلام دەشێ کۆمەلایەتی بوون بەم ئاستە بالایە نەگا، گەر بێتو هەر کۆڕو کۆبوونەوەیەك خاڵی بێت لەگفتوگۆو پرسیار لەمەڕ ژیانی چاك کامەیە؟ چۆن بژین؟ چۆن لەکاروباری شار بگەینو هەڵی بسەنگێنین؟ چۆن فەرمانڕەوایەتی بکەینو فەرمانڕەوایەتی بکرێین؟ هەر کۆڕو کۆبوونەوەیەك خاڵی بێت لەم گفتوگۆ عەقڵیانەو حیکمەتی پراکتیکی ئەوا ناگا بەئاستی سیاسی بوونو بگرە لەقۆناغی پێش سیاسەتدایە. کاتێك باس لەستەمکاری بکەین ئەوا ئەم

جیاوازییە زۆر گرنگە لەبەرچاو بگرین، کاتێك کە ستەمکار یا رژێمێکی ستەمکاری دێت رەنگە نەتوانێت لەکۆمەڵایەتی بوونی ئێمە، واتە پەیوەندی ئێمە بەخێزان‌و کۆمەڵەکانی دی‌و دەوروبەر مانەوەبدا، هەرچەندە هەموو رژێمێکی ستەمکار لەمێژوودا، چ لەکلاسیکداو چ لەقۆناغی مۆدێرندا هەوڵی داگیرکردنی ئەو بوارەش دەدا، بەڵام بەدڵنیاییەوە دێت‌و خۆی یەك گورزە لەسیاسی بوونی ئێمە ئەویش لەرێگای داگیرکردنی بواری مەدەنی‌و گشتییەوە.

بابگەرێینەوە بۆ پێناسەکەی ئەرستۆ لەو کۆتەی کەوەرمانگرت. مرۆڤەکان ئاژەڵی سیاسین بەپلەی یەك بوونەوەری عەقلانین، ئاژەڵێکن زمانیان هەیەو توانای قسەکردن‌و گوتار (speech). دەتوانن تواناکانیان بخەنە گەڕ بۆ عەقلاندن‌و بەکارهێنانی عەقل‌و بۆچوونەکانیشیان دەربارەی عەدالەت‌و چاکە لەگەڵ کەسانی دیکەدا ئاڵ‌و گۆڕ پێ بکەن. لێرەوە سیاسەت سروشتییە چونکە دەخوازێ بەرزترین توانای سروشتی مرۆڤ مەشقی پێ بکردرێ کە عەقڵە. شاریش سروشتییە چونکە ئەو فەزایەیە کە ئەم توانایەی ئینسان تێیدا بەکەماڵ دەگا، تێیدا مرۆڤ بە جەوهەری خۆی دەگا، یاجەوهەری مرۆڤ تێیدا خۆی بەیان دەکا. شار لای ئەرستۆ بریتییە لەکۆمەڵە (association)، کۆمەڵەیەکی دەستەڵاتدار، کە هەموو کۆمەڵەکانی دی لەخۆدەگرێ‌و چاولەبەرزترین چاکە دەبڕێ.

**"سەرنجدان‌و لێوردبونەوە پێمان دەڵێ کە هەموو**
**شارێك خۆی لەخۆیدا یەك کۆمەڵەیە،و هەر**
**کۆمەڵەیەکیش بەنیازی مەبەستی چاکە**
**دامەزرێندراوە، دەڵێم "چاکە" لەبەرئەوەی لەهەموو**
**کردەوەکانیاندا ئینسانەکان لەراستیدا نیشانە**
**دەگرنەوە لەوشتەی کە ئەوان لەوباوەڕەدان چاکە..**
**ئەم کۆمەڵەیە کە پێی دەڵێن شار، کۆمەڵەیەکی**
**سیاسییە"(٣).**

وەك لەئەخلاقی نیکۆماخیدا هاتووەو دواجار قسەی لەسەردەکەین، بەرزترین چاکەشی چاك ـ بوون well being یا بەختیارییە کە بەدەست دێت لەرێگای مەشقکردنی عەقڵەوە. ئەو کاتەی ئەرستۆ دەڵێ کە شار چاو لەبەرزترین چاکە دەبڕێ، مەبەستی ئەوەیە کە لەرێگەی چالاکی سیاسییەوە تاکەکان دەتوانن ئەگەرەکانی ژیانی ئینسانی خۆیان تاقی بکەنەوەو شار ئەو زەمینەیە فەراهەم دەکا، بەپێچەوانەی هەموو کۆمەڵە ـ پێش سیاسییەکانی دی وەکو خێزان‌و گوند کە ناتوانن ئەو زەمینەیە بخوڵقێنن، لەشاردا هەلی تاقیکردنەوەی فەزیلە هەیەو بوارێکی فراوانتر

بۆ چالاكی عەقڵ دەرەخسێنێت. سیاسەت موجادەلە (arguments) دەربارەی عەدالەتو بڕیاری سیاسی لەمەڕ كاروباری شارو دەربارەی ئەڵتەرناتیڤەكانو هەڵبژاردنیانو چۆنیەتی بەدەست هێنانیانو پرسیار لەمەڕ ژیانو چاكەو باشترین رژێم، هەر هەموو ئەمانە لەخۆ دەگرێ. شار لەسروشتی كۆمەڵە سەرەتاییەكانەوە، خێزانو لادێ، ئەو كۆمەڵانەی كەبوونیان ناچارییە نەك هەڵبژاردن، گەشەدەكا. خێزان حاڵەتێكی ناچارییە نەك هەڵبژاردنو ئامانجیش یا وەزیفەی خێزانیش بریتییە لەتێركردنی پێویستییە فیزیكییەكان. لەخێزاندا ئینسان بۆ رۆژ دەژی. یەكەمین لادێش،، كە گەورەترە لەخێزان بریتییە لەو كۆمەڵەیەی كە لەكۆی چەند خێزانێكەوە سەرهەڵدەدا بەنیازی پێویستییە نارۆژانییەكان.

**قۆناغی دوایی تر بریتییە لەگوند (لادێ) یەكەمین**
**كۆمەڵەی ژمارەیەك خێزان (ماڵ) بۆ رازیكردنی**
**شتێك زیاتر لەپێویستییە رۆژانەكانیان.. ئەندامانی**
**ئەو گوندە پێیان دەگوترێت كۆرپەكانی هەمان شیر**
**(homogalactic).(٤)**

ئەرستۆ ئەو پێویستییە نارۆژانەییانە روون ناكاتەوە كە بوونە مایەی سەرهەڵدانی لادێ، بەڵام دەشێ بڵێین كە یەكێك لەو پێویستییە نا ـ رۆژانەیی یانەی كەلادێ لەپێناویدا سەرهەڵدەداو فەراهەمی دەكا بریتییە لەئارەزوی كوڕەكان یا نەوەی نوێ بۆ جۆرێك لەسەر بەخۆیی لەخێزان.

تائێرە لەپێناسەی ئەرستۆ بۆ شار دواین، ئێستا بابچینە ناو باسەكەمانەوە كە بریتییە لە راڤەكردنی بۆچوونی ئەرستۆ دەربارەی ستەمكاری.

ئەرستۆ پۆلێنی رژێمەكان دەكا بەرمەبنای كێ حوكمیان دەكاو بەچ مەبەستێ. یا یەك كەس، یا چەند كەسێك، یا كۆمەڵە كەسێ فەرمانڕەوایەتی دەكەن، گەر فەرمانڕەوایان لەبەرژەوەندی گشتیدا حوكم بكەن، ئەوكاتە حوكمی یەك كەس بریتی دەبێت لەمۆناركی "شاهەنشاهی"، حوكمی چەند كەسێك ئۆرستۆكراسی،و حوكمی ژمارەیەكی زۆریش دەشێ ناوبنێین "حكومەتی دەستوری". بەڵام گەر بێتو فەرمانڕەواكان فەرمانڕەوایەتی بكەن تەنیا لەبەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، ئەوا ئەوان مەبەستی ئەسڵی حكومەت فاسد دەكەن، لێرەوە حوكمی كەسێك دەبێت بەستەمكاری (Tyranny)، حوكمی چەند كەسێك دەبێتە حوكمی ئۆلیكارشی، حوكمی زۆربەش لەقاموسی ئەرستۆدا دەبێتە حوكمی دیموكراسی. پێش ئەوەی بچینە ووردەكارییەوە با ئەم بەشەی كتێبی "سیاسەت" بخوێنینەوە:

**لەکاتی مامەڵەکردنماندا لەگەڵ رژێمی**
**شاهەنشاهی، لەهەمان کاتدا دووشێوەی**
**ستەمکاریمان پێناسەکرد، لەبەرئەوەی دەستەلاتێك**
**کە مەشقی پێدەکرا لەلایەن ستەمکارەوە لەهەردوو**
**نمونەکەدا بەمانایەك لەگەڵ شاهەنشاهیدا**
**یەکدەگرنەوە، هەردوو شێوەیەکی فەرمانڕەوایەتی**
**بەرمەبنای یاسابوون (بۆ نموونە لەنێو هەندێك**
**ناگریکدا، فەرمانڕەوایانێك خاوەن دەستەلاتی**
**موتڵەق لەرێگای هەڵبژاردنەوە بەوجیۆ مەقامە**
**دەگەن.. بەشێویەك لەشێوەکان ئەم دووشێوەیە**
**لەستەمکاری لەیەك جیاوازن، بەلام لەهەمان کاتیشدا**
**لەحوکمی شا دەچوون چونکە بەپێی یاسابوون.**
**لەبەرئەوەی جۆرە حوکمێك بوو لەسەر رەعیەتێکی**
**رازی بوو (واتە بەحوسن و رەزای رەعیەت بوو) بەلام**
**لەهەمان کاتیشدا سیستەمی ستەمکارەکان بوون**
**چونکە فەرمانڕەوایەتی کردن، وەك فەرمانڕەوایەتی**
**سەروەر بوو بەپێی بڕیارە شەخسییەکانی ستەمکاران.**
**شێوەی سێیەمی ستەمکاری هەرچەندە زۆر**
**توندڕەوە بەلام تەواو پێچەوانەی شاهەنشاهی**
**موتڵەقە. هەر فەرمانڕەوایەك کە پێویست نەبێتو**
**ناچار نەکرێت کە لەخۆی لێپرسراوبێت،و بەسەر**
**خەڵکیدا حوکم وەك یەكو بگرە بەسەر کەسی**
**لەخۆی بالاتریش، تەنیا لەبەرژەوەندی خۆی نەك**
**بەرژەوەندی ئەوانەی کە حوکمیان دەکا، ئەوا ئەو**
**مەشقی ستەمکاری دەکا بەمانای سێیەم، ئەو**
**دەمێنێتەوەو خۆی دەسەپێنێ بەرەغمی ئیرادەی**
**خەڵك، چونکی هیچ کەس بەئیرادەوە تەسلیمی ئەو**
**جۆرە حوکمە نابێت گەر ئەو ئازاد بێت.(٥)**

کەواتە ستەمکاری بریتییە لە هەڕەمەکی تاکەکەسێك کە لەبەردەم هیچ کـەسو هیـچ هێزێکدا لێپرسراو نییە. سیستەمێکە کە میکانیزمی لێپرسینەوەی دەستەلاتی نییە،و

کەسی ئازادیش ناتوانێ لەژێر سایەی ئەو سیستەمەدا بژی، بەمانایەکی دی سیستەمێکە کە ئازادی زەوت دەکا. لای ئەرستۆ کەسی ئازاد ئەو کەسەیە "کە بۆخۆی دەژی نەك بۆکەسێکی دی"، یاخود کەسی ئازاد ئەو کەسەیە کە بەپێی فەرمانو ئیرادەی کەسێکی دی ناژی، ستەمکاری ئەم حاڵەتە دەشێوێنێو لێرەوە دەبێتە مایەی ئینکارکردنی نەك هەلومەرجی ئازادی بەڵکو خودی ئازادیش.

لەبەرئەوەی بۆچوونی ئەخلاقیو سیاسی ئەرستۆ دانەبڕاوە لەبۆچوونی میتافیزیقای ئەو، کەواتە سەرەتا بەلانی کەمەوە پێویستە ئاماژدەیەك بەکردارو چوارهۆکە بدەین. کێشانی وێنەیەك سەبارەت بەمیتافیزیقای ئەرستۆ یارمەتیمان دەدا کە لەمەسەلە سیاسییەکان کە مەبەستی ئێمەیە لێرەدا باشتر بگەین، بەتایبەت چەمکی کرداری سیاسیو ئامانجی رژێمی سیاسی. سەرەتا ئەرستۆ جیاوازی دەخاتە نێوان فعل یان واقیع (actuality)و ئەگەرێتی یان الامکانیە (potentiality)، جیاوازییەك لەنێوان بوونی توانای کردنی شتێك یا بوون بەشتێك لەگەڵ بەواقعی کردن، بەفیعلی کردنی شتێك یا بەفعلی بوون بەشتێك. بۆنمونە من توانای ئەوەم هەیە کە مەلە بکەم، واتە پۆتاسۆن، یا ئەگەری ئەوەم هەیە، بەڵام لەئێستادا، لەراستیدا، لەواقیعدا من نازانم مەلە بکەم، کاتێك مەلەبکەم، یافێرببم چۆن مەلەبکەم ئەوکاتە من توانای مەلەکردنم بەواقیعی کردوە (actualize)، واتە ئەگەری مەلەکردن دەکەمە واقیعی. فعلی (actuality) لە پەیوەندیدا لەگەڵ ئەگەرێتی (potentiality) وەك پەیوەندی ئەوپیاوە وایە کە دەبینێ لەگەڵ ئەوپیاوەدا کە چاوەکانی داخستوە. ئەو پیاوەی کە چاوی داخستوە بینەرێکە لەرووی بوون بەهێزەوە، ئەوپیاوەش کەدەبینێو دەڕوانێ ئەو لەواقیعدا بینەرە. زیاتر لەمە بوون بەشتێك (actuality) بریتییە لەوەزیفە (function)ی بوونەوەرێکی واقیعی، بۆ نمونە بینین وەزیفەی چاوە، لای ئەرستۆ بوون بەشتێك پێشتردێت لەرووی زەمەنەوە. ئەگەرێتی (potentiality) لەخۆیدا مانای نییە، بەڵکو ماناکەی بەستراوەتەوە بەبوونی واقیعییەوە. ئەگەرێتی لەرێگای ئەوەی کە هەیە، کە دەتوانێ ببێ، دەشێ بزانرێو بناسرێ وەك ئەوەی کە هەیە. بوون بەشتێك (actuality) لەرووی زەمەنەوە پێش وەختە (priori) لەبەرئەوەی بوونی واقیعی لەبوونی پۆتاسیۆن، ئەگەرەوە، دێت لەرێگای کرداری بوونێکی ترەوە کە خۆی بوونێکی واقیعییە. بۆ نمونە کەسێك ئەگەری بوون بەزانابوونی هەیەو تەنیا ئەوکاتە دەبێتە زانایەکی واقعی یان فعلی گەر ئەومەشق ببینێت لەسەر زانست، رێنومایی بکردرێت لەلایەن زانایەکی فعلییەوە. زیاتر لەمە بوون بەشتێك (actuality) بریتییە لەدوا پرنسیپی شەرحکردن. بەشێکی چاکی لێکۆڵینەوەی ئەرستۆ پێکهاتوە لەئامازدە بۆکردنی ئەوەی کە چۆن مادە، یا

ماتەریاڵەکان ڕێکخراون لەودیدەوە بەلەبەرچاوگرتنی چەند وەزیفەیەکی دیاریکراو. بۆ نمونە، چاو ئەوکاتە دەناسرێتەوەو پێناسەدەکرێتو ڕاڤەدەکرێ کە نیشاندرا کەماتەریاڵەکانی وارێکخراوە کە ببینێ، لێرەدا بینینو وەزیفەی بینین ناوکی ڕاڤەکردنەکەیە. کاتێ وێنەی فیزیکی گشتی کامڵ دەبێ کە بتوانین بونە سروشتییەکان بەگشتی وەسف بکەین، لەهەموو میکانیزمەکانی جوڵە بگەین کە دەبنەمایەی هێنانی ئەم بوونانە بۆ بوون. لێرەوە، شێوە هەمیشە هاوڕێیە لەگەڵ مادە (ماتەریال)بوونی واقیعی لەگەڵ ئەگەری بوون، چەمکە بنەڕەتیەکانی فیزیا قسەلەم یەکێتییە دەکەن، ئەمەش کە پەیوەندی بەم یەکێتییەوە هەیە بریتییە لەتیۆری هۆکان (چوار هۆکە). بەڕای ئەرستۆ، چوار هۆهەن، یەکەم هۆی ماتەریاڵی، کە لێوەی شتی شوێنی مەبەست دروستدەکرێ، بۆ نمونە برۆنز، دووەم، هۆی شێوەیی (formal) واتە شێوەی یا ئایدیای پەیکەر لەعەقڵی هونەرمەندا، سێیەم، هۆی فعال(efficient)، یا چالاك کە بریتییە لەهونەرمەندەکە،و چوارەم، دواهۆ، واتە پەیکەرەکە.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە لەڕێگای لەبەرچاوگرتنی پەیوەندی مادەو شێوەوە، چوار هۆکەوە، ئێمە لە چەمکەکانی وەکو شانس،و عەفەویەت (spontaneity)دەگەین. ئەم چەمکانە ئاماژدە بۆ دەرنەکەوتنی، یانەبوونی هۆکان ناکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئاماژدە بۆ ئەوەدەکەن کە یاهۆکان لەبەختی ئێمەن یان بەئاراستەی بەدبەختیو بێ شانسی ئێمەدا کاردەکەن. لێرەوە دەشێ کە ئەم پارچەیە لەکتێبی میتافیزیك بخوێنینەوە:

**ئەم پیاوە بەرێگای توندوتیژی دەمرێت، گەر لەماڵ بڕواتە دەرەوە، ئەو لەماڵ دەڕواتە دەرەوە ئەو کاتەی تینووی دەبێت، تینووش دەبێت ئەو کاتەی شتێکی دی ڕوودەدا، بەم شێوەیە ئێمە بەوشتە دەگەین کە ئێستا ئامادەیی هەیە، یاخود هەندێ ڕووداوی ڕابڕدوو.. .. هەمووشتێك کەدەبێت بەناچاری دەبێت، بۆ نموونە حاڵەتێکی ناچارییە کە ئەوکەسەی بژی ڕۆژێك دێ بمرێ، چونکە هەل و مەرجەکە ئامادەیە. جائەو بەتوندوتیژی یا نەخۆشی دەمرێت ئەمە جارێ دیاری نەکراوە، بەڵکو پەیوەندی بەڕوودانی شتێکی نرەوە هەیە. ئاشکرایە کەپرۆسەکە دەگەڕێتەوە بۆ خاڵێکی دیاریکراوی دەستپێکردن.(٦)**

سەیركردنی جیهان لەدیدی میتافیزیقی ئەرستۆوە واتە بینینی جیهانێك كە لەگۆڕاندایە. هەربەشەی بەرەو بەدستهێنانی ئامانجێك دەبزوێ. كردار بەمەبەستی ئامانج لەشتەكاندا ئامادەیی هەیە. شتەكان لێرەوە دەێنەبوون و لێرەوە هەن. "درەختەكان گەڵا دەردەكەن لەبەرخاتری بەروبووم و رەگەكانیاندا بەناو زەویدا شۆڕدەكەنەوەو لەبەرخاتری گەشەدەكەن، ئاشكرایە كە ئەم جۆرە هۆیە (operative) لەشتەكاندا، ئەو شتانەی كەدێنەبوون و بەسروشت هەن".(٧)

لەبەرئەوەی ئینسانەكان بەشێكن لەسروشت و ئامانجیان هەیە، لەبەرئەوەی شتێك هەیە بەناوی جەوهەری ئینسان كە دەبێت هەوڵ بدەین پێی بگەین، گەر بێت و ئەم جەوهەرە بناسین، یا ئە هۆیەی فعال، (مؤثر) كاریگەرە (operative) لەئینسانەكاندا یاخود مەبەست و ئامانجی ئینسانەكان، ئەوا ئەوسا دەتوانین وەڵامی كۆمەڵێ پرسیاری سیاسی دەربارەی ئینسان بدەینەو، دەتوانین بزانین چۆن هەڵس و كەوت بكەین، كام داموو دەستگای سیاسی پێویستە بۆ بەواقیعی كردنی ئەگەرە ئینسانیەكانمان.

لەكتێبی "ئەخلاقی نیكۆماخی" (The Nikomachean Ethics)دا دەخوێنینەوە.

> **هەموو هونەرێك و هەموو لێكۆڵینەوەیەك، بەهەمان شێوە هەموو كردارێك و هەوڵێك، نیشانە لەچاكەیەك دەگرێتەوە، لێرەوە چاكە (The good) بەدروستی واپێناسەكراوە وەك ئەوشتەیە كە هەموو شتەكان چاوی لێدەبڕن "كەواتە گەر چالاكییەكانمان ئامانجێكیان هەبێت كە ئێمە دەمانەوێت لەبەرخاتری خودی ئەو ئامانجە، خۆ لەبەرخاتری ئەویش هەموو ئامانجەكانی ترمان دەوێ، گەر ئێمە ئیختیاری هەمووشتێك نەكەین لەبەر خاتری شتێكی دی" (ئەمە دەبێتە مایەی دووبارە بوونەوەیەكی هەمیشەیی بەو شێوەیەی كەمەبەستی ئێمە بێ ئامانج و بێ سوود دەبێت). كەواتە ئاشكرایە ئەم ئامانجە دەبێت چاكترین ئامانج بێت، باڵاترین چاكە. ئایا ئەم خود بەخودە ئەو مانایە ناگەیەنێت كە زانینی چاكە گرنگی خۆی هەیە بۆ ئێمە بۆبەڕێوەبردنی ژیانمان.(٨)**

لەنێوان ئامانجەکاندا، ئەرستۆ ئامانجێك دیاری دەکا کە ئینسانەکان چاوی لێدەبڕن ئەویش بەختیاری (eudaimonia) یاخود چاك ـ بوون ـ ە(well - being).
چاکەی هەرشتێکی تایبەت چییە؟ بەدڵنیاییەوە بریتییە لەو مەسەلەیەی کە هەرشتەو هەمووشتێك لەبەرئەو بەئەنجام دەدرێن. لەزانستی پزیشکیدا ئەم شتە تەندروستییە، لەستراتیژیەتدا، سەرکەوتن ، لەبیناسازیدا، ساختمان، شتی جیاواز لەهونەرە جیاوەزەکاندا، بەڵام لەهەموو کردارێکدا ئەو مەسەلەیە بریتییە لەئامانج، چونکە لەبەر ئامانجەکە هەموو شتەکانی دی ڕوودەدەن.
دەربارەی ئامانجی کردارەکانی ئینسانیش ئەرستۆ درێژە بەقسەکانی دەداو دەڵێ:

**بەختەوەری "چاك ـ بوون"، لەهەمووشت زیاتر**
**ئەو ئامانجەیە، لەبەرئەوەی ئێمە هەمیشە**
**هەڵدەبژێرین لەبەرخاتری خودی خۆی، لەبەرهیچ و بۆ**
**هیچ هۆیەکی دی نا. بەختەوەری جیاوەزە لەشەرەف،**
**لەچێژ، لەتوانای عەقڵیو بەگشتی لەخاسیەتە**
**چاکەکان. ئێمە هەڵیان دەبژێرین بەشێك**
**لەبەرخاتری خۆیان، بەڵام بەدڵنیاییەوە**
**هەڵیاندەبژێرین لەبەرخاتری بەختەوەری خۆمان.**
**لەوباوەڕەوە کە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن**
**لەتەشویقکردن و گەیشتن بەبەختەوەری.(٩)**

چاك ـ بوون یا بەختەوەری ناشێت شتێك بێ لەودیو سنورەکانی ژیانی ئێمەوە، لەبەرئەوەی هەموو ئامانجەکان کوورت دەبنەوەو ورد دەبنەوە بۆ ناو چالاکیو چاك بوون . ئەرستۆ لێرەدا سێ شێوەی ژیان دیاری دەکات. خەڵکانی گشتی سەرقاڵی زاوزێو بەدەست هێنانی چێژن، کەسانی ناوازە چاو لەچێژی مەدەنی، گشتی، دەبڕنو توێژێکی دیکەش هەن، فەیلەسوفەکان کە سەرقاڵی ژیانی عەقڵین.
ژیانێکی ویستراو دەبێت هەر لەسەرەتاوە ببێتە مادەی ئیمتحانێکی نەقدی (هەروەك چۆن لای سوکرات)، واتە بەکارهێنانی عەقڵ، لۆگۆس، ئەوەی لەئینساندا خاسیەتێکی بنەڕەتییەو لەرێوەی ئینسان دەناسرێتەوە بەکارهێنانی عەقڵە. عەقڵ چالاکییەکی ئینسانییە.
لۆگۆس کە لەرێوەی ئینسان لەئاژەڵەکانی دی جیادەکرێتەوە واتە عەقڵ، بەمانا لاتینیەکەی (ratio) بەڵام عەقڵ یانی چی؟ لۆگۆس (عەقل) کۆمەڵێ مانای هەیە

(قسه) گوتـار (دیسـکۆرس)، حیسـاب کـردن، فۆرمیلـه کـردن، toreckon، فـاکولتی (واته عەقلْ وەك بەشێك بەرانبەر ئارەزوو و سومۆس (spirit)، گێڕانەوە،و ئنجا واتـە گوزارەیەك. گەر سەیری ئەدەبیاتی ئەرستۆبکەین ئەو لۆگـۆس بـەم هـەموو مانایانـە بەكاردەهێنێ. تا كاتی ئەرستۆ لـەیۆنانی كۆنـدا لۆگـۆس چـەند مانایـەكی دەگـەیاند سـەرەكیترینیان وتەیـەكی عـەقلانی كـراو، زمـانێك وەك تـەعبیركردن لـەفیكر وەك جیاكردنەوەی لەتەنیا دەربڕینـی دەنـگ، ئەرسـتۆ لەبـەكارهێنانی عـەقلدا (لۆگـۆس) مەبەسـتی هـەموو ئـەو رەهەندانـەی ژیـانی ئینسـانە كـە زمـان گەیەنەرەكەیـە، ئامرازەكەیە، لێرەوە لۆگۆس وەك گوتار (دیسكۆرس) خۆی تۆخ دەكاتەوە.

بۆ ئـەوەی لەكاریگـەریو بەرئـەنجامی ئـەم بەكارهێنانـەی ئەرسـتۆ بـۆ لۆگـۆس تێبگەین دەبێـت بپرسـین ئەوشـتە چییـە كـە مایـەی جیاكـەرەوە (differentiation)و خاسیەتی ژیانی ئینسانەكانە؟ ئەوشـتەی لـەرووی بنەڕەتییـەوە ئینسـانییە بریتییـە لەژیان لەنێو شاردا، گـەر ئـاژەلْ سروشـتی هـەبێت، ئینسـان ژیـانی سیاسـی هەیـە لەرێگای گوتارەوە، واتـە عەقڵـەوە، هەمیشـە بـەژێر تاقیكردنـەوەی عـەقڵیدا دەڕوا، دیـارە لـەپالْ بەشـداریكردنی سیسـیانەدا. ئـەوە دەسـتەلاتی عەقلـە كەئینسـان جیادەكاوە، هەر ئەوەشە مایەی پرسیار كردن لـەژیانی چاكـتر، یـا باشـتر، ئەمـەش خود بەخود هەم لەشاردا دەبێتو هەم پرسیاریشە لەخودی شـار. پرسـیاری" چـۆن دەبێـت بژیـن" لـە هـەناویدا پرسـیاركردن لەشـارو چۆنیـەتی شـارو چۆنیـەتی بەرێوەبردنی شار لەگەلْ خۆهەلدەگرێ، چونكە تەنیا خوداو ئاژەلْ لەدەرەوەی شـار دەژیـن. هـەرچی وەلامێكیـش بەدەسـت بهێنیـن ئـەوا لـەنێو گوتـاردا دایدەرژێنـەوە، ئەمەش واتا ئامانج (telos)ی خـوازراو بۆ ژیـانی ئێمـە دەگۆڕێتـە سـەر مەبەشـتێكی هۆشیارانە، لەدوا قۆناغدا واتە بەعەقلی كردنی پرسیارو گەڕان بەدووی وەلامدا.

چاكـەی ئینسـان لـێرەدا وا خـۆی بـەیاندەكات وەك چالاكییـەكی رۆح بەرمـەبنای فەزیلەت (vrtue). لەیادمان بێت كە لـەزمانی یۆنـانیدا وشـەی چـاك واتـە (agothos)، پیاوی چاك (agathos) ئـەو پیاوەیـە كـە ئازایە، خـاوەنی رۆحێكـە كـە گرنگـی دەدا بەبواری مەدەنیو خاوەنی جیّو مەقامێكە لەبواری مەدەنیدا. بەلام ئەرستۆ ووشەی (agathos) بەكارناهێنیّ بـۆ كەسـیّ كەشـتەكان بـەچاكی ئـەنجام بـدا، بـەلكو وشـەی (spondaios) بـەكاردەهێنیّ، ئـەو وشـەیە لـەرووی ئیتمۆلۆژیكییـەوە واتـە "جیـدی- serious" راستگۆ یا پڕ لەحەماس. لێرەوە چاك بوون لەشتێكدا، چ لێدانی گیتار بێت یـا هەرشـتێكی دی، یـاخودی ژیـان، واتـە وەرگرتنـی ئەوشـتەو ژیـانیش بـەجیدی. ئەوانەی ژیان بەجیدی وەردەگرن خۆیان جیدین، ئەمەش مانا ئەرستۆییەكەیەتی.

لای ئەرستۆ ژیانێك تەرخان كرابێت بۆ تێڕامانی فەلسەفیژیانێكی پڕ بەختەوەرییە، بەڵام بەختەوەرترین كەس ئەوكەسەیە كە ژیانی تەرخان كردووە بۆ تێڕمانی فەلسەفیو كرداری سیاسی. بەختیاری چالاكییە، ئەنجامدانی كرداری چاكو نەجیب. ئەرستۆ ناوی دوو كەسایەتی یۆنانی دەهێنێ وەك نمونەی كەسی بەختەوەر كە ژیانیان تێكەڵەیەك بوو لەتێڕامانی فەلسەفیو چالاكی سیاسی، ئەو دوو كەسایەتیەش: سۆلۆنو پێركلیس.

كاتێك تێگەیشتین كە ژیانی چاك تەنیا دەشێ لەشاردا (polis) فەراهەم بێت، ئەمە بەناچاری ئەو ئەنجامەمان دەداتێ كەسیستەمی سیاسی پێویستە بۆ فەراهەمكردنی چاكترین ژیان، لێرەوە پێویستە جارێكی دی چاو بەكتێبی "سیاسەت"دا بخشێنینەوەو كەمێك دوورو درێژتر لەسەر شار قسەبكەین.

شار جۆرێكە لەهاوكاری كردن، كۆمەڵە (association) یا جڤات (Koinonia – community) واتە كۆمەڵە كەسێك كە لەكۆمەڵێ بەهاو پرنسیپو شتو مەسەلەدا هاوبەشن. لای ئەرستۆ تاكە هاوكاریكردنێك هەیە كە لەوانی دی بەدەستەڵات ترەو زیاتر ئامانجو مەبەستەكان لەئامێز دەگرێت ئەویش هاریكاریكردنی سیاسییە. لێرەدا دەبێت بۆ چوونی ئەرستۆ جیابكەینەوە لەو بۆچوونە باوەی كە دەڵێت "دەوڵەت" تەنیا وەك ئامرازێك ئیش دەكا، ئامرازی دەستی كۆمەڵە تایبەتییەكان كە كۆمەڵگا پێك دەهێنن. جیاوازی نێوان دەوڵەتو كۆمەڵگا مەسەلەیەكی غەریبە بەئەرستۆ. شار ناشێت لەگەڵ دەوڵەتدا تێكەڵ بكرێنو بكرێنەیەك،و دەستەڵاتێكیش كە ئەرستۆ بەشاری دەدا هیچ پەیوەندییەكی بە سەربەخۆیی یاسایی <u>Juridical soveringnty</u>)یەوە نییە، ئەمەی دوییان بەشێكە لەوێناكردنی مۆدێرنانە بۆ دەوڵەت. شتراوس لەم ڕووەوە دەڵێت:

> **{ئەمڕۆ ئێمە كە قسە لەسەر "دەوڵەت" دەكەین، وا لەدەوڵەت دەگەین وەك شتێكی جیاوازو دژ لەبەرانبەر "كۆمەڵگا"دا، ئەمە لەكاتێكدا "شار" پێكهاتووە لەدەوڵەتو كۆمەڵگا. بەدیقەت تر بڵێین، شار دەگەڕێتەوە بۆ پێش جیاكردنەوەی كۆمەڵگاو دەوڵەت. نزیكترین ووشەی ئینگلیزی كە مانای شار بگەیەنێت بریتییە لە "the country" "ووڵات"، ئینسان دەتوانێ بڵێ "وڵاتەكەم ڕاستە یا هەڵەیە، بەڵام ناتوانێ بڵێ كۆمەڵگاكەم ڕاستە یا هەڵەیە". شار دەشێ بەكاربهێنرێ وەك هاومانای "خاكی باووباپیران". لەگەڵ ئەمەشدا ناشێت جیاوازی نێوان**

**"شار"و "وولات" پشت گویٚ بخردریٚ.. ئەلتەرناتیڤی "شار" جۆرێکی تر نییە لە دەوڵەت، بەڵکو "عەشیرەت " یا "نەتەوە"یە وەك شێوەیەکی نزمتر لەشار. گەر نەڵێین شێوەیەکی بەربەری، کۆمەڵگایەك کە جیاوازو دژی شارە کە ناتوانێت شارستانێتیو ئازادی پێکەوە گریٚ بدات.. لەکاتێکدا بۆ هاونیشتمانیانی مۆدێرن هاومانای شار، یاموقابیلی شار بریتییە لەولات، ئەوا بۆکەسی تیۆریست (theoritieal man) ئەو موقابیلە بریتییە لەیەکێتی دەوڵەتو کۆمەڵگا کە خۆی دەگۆڕیٚ "بەکۆمەڵگایەك"و ئنجا "شارستانێتی"و"کلتور" (١٠)**

شار وەك شێوەیەکی کۆمەڵەی ئینسانی نەك جیاوازە لەرووی جەوهەرییەوە لەکۆمەڵە پێش سیاسییەکان (خێزانو عەشیرەت)، بگرە جیاوازیشە لەفەرمانڕەوایەتی شا بەسەر عەشیرەتو خەڵکیدا. شار لەحوکمی شاهەنشاهی (kingship) جیادەکرێتەوە لەبەرئەو حەقیقەتەی کەشار بریتییە یان دەیەوێت ببێت بەهاوکاریکردنی ئینسانەکان کە دەیانەوێت ئازادو یەکسان بن. ئەم جیاوازییە جەوهەرییە. ئەم پێکەوە گرێدانەی ئازادی سیاسیو هونەری سیاسی بریتی نییە لە جەوهەری شار.

لای ئەرستۆ بۆ گەیشتن بەیەکێتی لەنێوشاردا، پەیڕەویکردن لەهەندیٚ ڕێگا وەك هەڵوەشاندنەوەی خێزانو موڵکداریو باوەڕ هێنان بەهاوبەش بوونی موڵکداری، ئەمانە هەر هەموو لای ئەو مەحاڵنو شوێنی ڕەتکردنەوە. هەڵوەشاندنەوەی خێزان لەجیاتی ئەوەی کە "هاوڕێیەتی"و ڕۆحی دۆستایەتی لەنێوان هاولاتیاندا بەهێزبکا، لەراستیدا دەبێتە مایەی لاواز کردنی هاوڕێیەتیو لەناوبردنی هەستی سەربەخێزانێك بوون، کۆمۆنیست بوونی، یا هاوبەشی بوونی بە کۆمەڵی موڵکداری، دەبێتە مایەی ئەو چێژە ڕەوایەی کە ئینسانەکان دەیبینین لەو شتانەی کە هی خۆیانە، ئنجا لەناوبردنی چاکەی ئازادی، بیٚ ئەوەی ئەمانە هیچی ئەو هۆیانە بنەبڕبکا کە دەبنە مایەی کێشمەکێشو دژایەتی لەسەر شمەکەکان شار نابێتو ناتوانێت هەوڵی ئەوە بدا کە ئەو یەکێتییەی بەرژەوەندی ناو قەبیلەو عەشیرەتو خێزان دروست بکاتەوەو یا چاوی لیٚ ببڕیٚ. شار لەهەمەچەشنەییو هەمەرەنگیەکەیدا، پێویستە پشت بە

پەروەردە ببەستێت بـۆ بەدیـهێنانی یەکێتییـەکی هاوبـەش، "(١١) یـاخود لـەرێگای کاریگەری هەریەك یا هەرسێ "فەلسەفەو خوو عاداتو یاسا".

هەڵەیـەکی گەورەیــە کــە وابزانــین کەشــار تــەنیا پێکــهاتوە لەبەشــداریکردنو کۆبوونەوە لەسەر خوانی شمـەكو پێویسـتییە ماتەریاڵیـەکان. شـار لەکۆمەڵـە یەکـە کەپێك هاتووە، بەمانا بنەڕەتییەکەی ، لە کۆبوونەوەو هاوڕابوون لەسەر هـەندێ راو بۆچوون لەمەڕ چاکەوە، یاخود دروست ترین شێوەی ژیان. شار لای ئەرسـتۆ بریتـی نییە، وەك ئەوەی لیبرالیزمی مۆدێرن دەیبینێت، لـەوەی کـە جۆرێـك بێت لەبـەرەی (تحالف) نێوان ئەندامەکانیدا بۆ رێگاگرتن لەروودانی ناعەدالەتیو، بەرەیەك بێت بـۆ فەراهەم کردنی ئاڵو گۆڕی ئابووریو یاساش گـەرەنتۆر (زامنەکـە) بێـت، نـا بـەڵکو والەشار بگەین کە بوونی هەیە نەك تەنیا بۆ خاتری گـوزەران بـەڵکو بوونـی شـار بـۆ خاتری ژیانێکی چاکو نەجیبو بەختیارە.

**بەڵام ئامانجی شار بریتی نییە تەنیا**
**لەفەراهەمکردنی گوزەران، بەڵکو رەخساندنی**
**هەلو مەرجێ بۆ ژیانێ کە چاکە. گەر وانەبێت شار**
**دەبێتە شوێنی کۆبوونەوەی کۆیلەو ئاژەڵەکان نەك**
**ئینسانەکان، ئەمەش مەحاڵە چونکە کۆیلەو ئاژەڵ لە**
**بەختەوەریدا هاوبەشی ناکەن،و لەژیانێکیشدا کە**
**هەڵبژاردن لەخۆبگرێ بەشداری ناکەن.. مەبەستی**
**شار هەروەها دەبێت لەوەزیاتر بێت کە تحالفێکی**
**سەربازی بێت بۆ پاراستنی عەدالەت.. ئیدی بەڵگە**
**نەویستە کە ئەوشتەی کە بەرەسەنی پێی دەگوترێت**
**شار نەك تەنیا بەناو ئەوە ئەو شارەیە کە غەمی**
**فەزیلەت (virtue) دەخوا. گەر وانەبێت دەبێتە**
**کۆمەڵەیەك کە هیچ نییە جگە لەتحالفێکی سەربازی**
**کە تەنیا لەرێگای شوێن و مەوقعو سنورداری**
**جوگرافییەوە جیاواز دەبێت لەوتحالفانەی کە**
**بەشەکانی بەشدار بوو لێك دوورن، لەهەلو مەرجێکی**
**ئاواشدا یاسا تەنیا دەبێتە رێککەوتن، یا خود وەك**
**لیکۆفرۆنی سۆفستائی دەیگوت: تەنیا "زامنێکی**
**عەدالەت" کەناتوانێ کارێ بکا هاوڵاتیان عادلبن و**
**چاك.(١٢)**

کەواتە تەنیا لەشاردا ئینسان دەتوانێ ئەگەرەکانی تاقیبکاتەوەو ژیانێك بـژی کـە چالاکەو بەرمەبنای فەزیلەت. لەسەرەتاوە گوتمان شار حاڵەتێکی سروشتییە، بـەڵام ئەمە نابێت والێك بدرێتەوە وەك ئەوەی کە شار ئۆرگانێکی سروشتییەو خود بـەخود گەشـەدەکا شـار خـۆی لـەخۆیدا گەشـەناکا، شـارەکان بـەهۆی چـالاکیو لەلایـەن ئینسانەکانەوە دادەمەزرێندرێن. لەیادمان بێت هەندێ رەهەندی مرۆڤایەتی هەیە کە دژ بەشارو ئامانجی شارە.

> **ئینسـان باشـترین ئاژەڵـە ئەوکاتـەی کـە دەسـتی بەگەشەکردنی تەواوی خـۆی دەگـا، بـەڵام لەهـەمان کاتیشدا بەدترین ئاژەڵی ئاژەڵەکانە ئەوکاتەی لەیاساو عەدالەت جیادەبێتەوە.. ئینسـان بەکۆمەڵەچەکێکـەوە لەدایك دەبێ کە دەتوانێ بەکاریان بهێنێو لەخزمەت حیکمەتی عەمەلیو فەزیلـەتدا، زۆر ئاسـانە بـۆی کـە بەکاریان بهێنێ بۆ مەبەستو نیازی تـەواو پێچەوانـەی حیکمەتی عەمەلی. کەواتە ئینسانی بێ فەزیلـەت بـەر بەریترین بوونەوەرە نادروست ترینو بێ ئـەخلاقترینو خراپترینیش دەربارەی مۆڵەتی سێکسو..**

شار لەخۆیەوە گەشە ناکاو ناتوانێ بەئامانجەکانی بگا بـەبێ چالاکیو حیکمـەتی سیاسـەتمەداران. لـەرێگای بینـاکردنو دامەزراندنـەوەو بڕیـارو هەڵبژاردنەوەیـە کـە ئینسـانەکان دەتوانـن تـەجاوزی کەڵکەڵـەو ململانـێ وەحشـیەکان بکـەنو چـاو لەمەدەنیەتێك ببڕن کە دەتوانن پێی بگەن. شار دێتـەبوون لەبەرخاتری ژیـان، نـەك تـەنیا بۆ کۆمـەك کـردن لەبەدەسـت هێنـانی پێویسـتییەکاندا، بـەڵکو بۆخسـتنی ململانێکانی کە سەر هەڵدەدەن بۆ نێوچوار چێوەیەکی یاسایی. گەر فیکـرو چـالاکی ئینسـان ـو ئنجـا شـارەکانیش، دابـڕێن لەئامانجـە ئەسـڵییەکان، بێسـوود دەبـن، لەمەزیاتر بگرە دەبنە شوێنی مەترسـی. گـەر ئینسـانەکان کاراکتـەریان ترانسێند، بەجێ نەهێڵنو بەرزنەکەنەوە ئەوا بەرزترین خزمـەتی نزمـترین دەکـا. تـەجاوزکردنی سروشـت لەلایـەن مرۆڤایەتیـەوە بەمانایـەك هۆکارێکـە بـۆ رازیکـردنو تـێرکردنی سروشتی خۆی. سروشت لەهەردوو ماناکەدا لەدڵی ژیانی سیاسیدایە داکۆکی ئەرستۆ لەسروشتی بوونی شار دەبێت واببینرێت وەك وەلامێکی توند دژ بەسۆفستائییەکان کـە پێیـان وابـوو کـە شـار پێچەوانـەی سروشـتەو لەسـەر هـێزەوە بینـاکراوە ئـەم

موجادەلەیەی سۆفستائیەکان، ئەفلاتوون لەهەردوو دایەلۆگی کۆمارو گۆرگیاسدا مامەڵەیان لەگەڵ دەکا. لێرەدا ئەرستۆ هاوڕای ئەفلاتوونە بەڵام رەخنەی خۆشی هەیە لەئەفلاتوون.

بەڕای ئەرستۆ، پێشنیاری سوکرات سەبارەت بەکۆمۆنیزم، هەڵەی ئەو گریمانکاریانە نیشاندەدا کە ئەو دەیانکا بەرامبەر بەسیاسەت. یەکێتییەکی توندڕەو زیاد لەپێویستی کە سوکرات خەونی پێوەدەبینێت، بەڕای ئەرستۆ، ئامانجێکی هەڵەیە، چونکە جیاوازییەکان لەناودەبا، ئەو جیاوازیانەی کە شار لەسەریان دامەزراوە شار نابێت هۆمۆ جینیۆس (متجانس)بێت، چونکە لەهەمەچەشنەیی (diversity) پێک هاتووە، یەک بوونی شار ئەو هەمەچەشنەیی‌یە وێران دەکاو بەمەش خودی شار وێران دەبێت، ئەوکاتەی شار دەبێتە یەک، یا یەک دەگرێ بەمانا سوکراتییەکەی، زیاتر دەبێت بەیەک کەس،و لەوحاڵەتەدا زیاتر لە خێزان دەچێ وەک لەوەی لەشار بچێ، فیکر دەبێتە شوێنی مەترسی بۆ ژیانی سیاسی ئەوکاتەی هەوڵ بدا کە کۆمەڵەیەکی ئاڵۆزی وەک شار سادەبکاتەوە. بابزانین شار بە چ مانایەک کیانێکی ئاڵۆزە.

لەکتێبی "سیاسەت"دا دەبینین کە شار کۆمەڵەی کۆمەڵەکانە، لەخێزان‌و کۆبوونەوەی خێزانەکانەوە هاتۆتە بوون‌و خێزانیش لەپەیوەندی پیاوو ژن‌و سەروەرو کۆیلە پێك هاتووە. لێرەوە ئەو هەمە چەشنەیی‌یەی کە شاری لەسەر دروستکراوە لەسروشتی ئینسانەکانەوە هاتووە، ئەوانەی کە بەرێگای جیاوازو هەمەچەشنەو بەپلەی جودا جودا گەشە بەتوانا فیزیکی‌و هونەری‌و فیکرییەکانیان دەدەن.

ئەم جیاوازییانەی نێوان ئینسانەکان کە بریتییە لەهەمەچەشنەیی شار، لەخێزانەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەو خێزانەی کە کۆمۆنیزم لەناوی دەبا. هەروەها ئەرستۆ قسە لەپەیوەندی منداڵان‌و دایك‌و باوکان‌و لێك چوونیان دەکا، ئەو لێکچونانەی کە خێزانێك لەخێزانێکی دی جیادەکاتەوە. ئەو جیاوازیانە پێویستن بۆ پاراستنی هەمەچەشنەیی شار. ئەرستۆ پێی وایە گەر ئینسانەکان نەزانن دایك‌و باوکیان کێن، ئەو کۆمۆنیزمەی "کۆمار" هەوڵی بۆ دەدا بەڕای ئەرستۆ، ئەوان ناتوانن ببنە پاسەوان دژی ئەو تاوانانە بوەستنەوە کە رەنگە دژیان ئەنجام بدرێت یا خۆیان ئەنجامی بدەن.

**ئەمە چەند بەرئەنجامێکی تری خراپە کە ناشێ**
**دووره پەرێزیان لێبکردرێت لەلایەن ئەوانەی کە**
**دەیانەوێت کۆمەڵەیەکی لەوشێوەیە دروست بکەن.**
**اهانە، مرۆڤ کوژی، چ بەمەبەستو چ بێ مەبەست،**
**دوژمنکاریو شێواندنی سومعە، ئەمانە زۆر ناپیرۆزن**
**گەر بێتو ئەنجام بدرێن دژ بەدایك یا باوك یاخزمان،**
**هەروەك چۆن ئەنجام بدرێن دژ بەکەسانی غەریبە.**
**لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تاوانانە روو دەدەن گەربێتو**
**کاتێك خەڵکی نەزانن کێن کەسو کارو**
**خزمەکانیان. کاتێکیش روویاندا، ئەوانەی ئەو**
**پەیوەندیانە دەناسنەوە بەلانی کەمەوە جەزاکەی**
**دەدەن، کە عاداتو تەقالیدی ئایینی داوای دەکا،**
**گەر نەیناسنەوە ئەوا ئەوکارە ناکەن. (١٤)**

لەلایەکی دیکەشەوە کاتێك خێزانەکان لەلایەن شارەوە شوێنیان دەگیرێتەوە ئەوا ئیدی بەزەیی کار ناکا، هەستی بەزەیی خاسیەتێکی جیاکەرەوەی ئینسانە کە لەنێو خێزانەوە فێری دەبێت.

کەس لەرێگای کۆمەڵێ پەیوەندییەوە دەناسرێتەوە کە هەیەتی، کۆمۆنیزم ئەو شوناسانە خاپوور دەکا. کۆمۆنیزم لەهاوڕێیەتییە دەچێ کە ئەریستۆفانس لەدایەلۆگی "سیمپۆزیۆم"ی ئەفلاتوندا وەسفی دەکا، دوو عاشق ئارەزووی ئەوە دەکەن کەببنە یەك. لەپەیوەندییەکی لەم جۆرەدا، ئەرستۆ پێی وایە، "یا هەردووك، یا بەلانی کەمەوە یەکێکیان دەبێت لەناوبچێ.. چونکە ئەوکاتەی دەبن بەیەك ئیدی وەك دوو تاکە کەسی جیاواز بوونیان نییە.(١٥)"

مەسەلەیەکی دی کە شوێنی گرنگی پێدانی ئەرستۆیەموڵکدارێتییە. هەبوونی چەند شتێك وەك موڵکی خۆ جیاوازیەك دروست دەکا لەوەرگرتنی چێژێك کە لەوشتانەوە بەدەست دێن. نەك ئەم بەڵکو بوونی موڵکداری تایبەتی نەك بەتەنیا بوونی هاوڕێیەتی مسۆگەر دەکا بەڵکو دەبێتە مایەی هاتنەکایەوەی فەزیڵەتەکانی وەکو اعتدالو ئازادی.

پراکتیککردنی ئەم فەزیلەتانە گریمانکاری ئەو جیاوازییەدەکا لەنێوان ئەوشتەی کە موڵکی کەسە لەگەڵ ئەوشتەی کە هی خەڵکانی ترە. گەر هەرکەسێ هەوڵ بدا

ئەم جیاوازیانە لەناوبەرێتو پێشنیاری کۆمۆنیزم بکا ئەوا بەرئەنجام هیچ نابێت جگە لەستەمکاری یاخود ئاژاوەیەك کە ئەوسەری دیار نەبێت. لێرەدا پێویستە بڵێین کە ئەمە تەفسیری ئەرستۆیە بۆ کتێبی "کۆمار"ی ئەفلاتوون، بۆ چونێکی تریش هەیە کە تەواوو پێچەوانەی تەفسیری ئەرستۆیە لەوانە لیوشتراوسو ئالان بلۆم کەتەواو دژی ئەم تەفسیرەی ئەرستۆن.

گوتمان کە ستەمکاری بەدترین سیستەمی سیاسییە چونکە رێگە دەگرێت لەگەشەکردنی ئەگەرەکانی ئینسان. وەك دیمان لەناو چوارچێوەیەکی گونجاوی شارێکی چاکدا ئینسانەکان دەتوانن دەستیان بەمەزنی بگا، بەلام ژیان لەدەرەوەی شار یا لەناوشارێکی فاسددا لەرووی سیاسییەوە، وەك ستەمکاری فارسی، ئینسانەکان ناتوانن کامڵ بن.

ئەرستۆ سیاسەت ناودەبا بە "سەروەرترین هونەر"، ئنجا مادامێکیش ئامانجەکەی بریتییە لە "چاکەی ئینسان" کەواتە ئەو کەسانەی کە لەژیانی سیاسیاندا سەرکەوتوون ئەوانە بە بەرزترین چاکە شاد دەبنو بگرە مەزنییەك کە درێژە دەخایەنێت. بەهادارەکە ئامانجی ئینسانێك بەدی بهێنرێ، بەلام چاکترو مەزنترەو بگرە خودایی ترە گەر بێتو ئەو ئامانجو چاکەیە بۆ نەتەوەیەك یا شارێك بهێنرێتەدی(١٦) ئەرستۆ بەپێچەوانەی لیبرالیزمی مۆدێرنەوە، باوەڕی بەهونەری سیاسەتێك هەبوو کە چاو لەدروستکردنی "کاراکتەر" ببڕێت، وە هەر رێکخستنێکی سیاسی کە خۆی سەرقاڵی وەزیفەی نێگەتیڤانەی پاراستنی کەسەکانو موڵکداری بکا، لەراستیدا سیاسەت نییە، چونکە سیاسەت واتە سەرقاڵ بوونو دەرگیری بوون لەگەڵ غەمی هێنانەکایەوەی مەزنێتی ئینسان (human excellence) (یۆنانییەکەی arcte)، بەدەست هێنانی ئەو هەلو مەرجو ئەو حاڵەتە دەبێتو وەزیفەی شاربێت یا دەوڵەت، بێ لەم ئامانجە کۆمیۆنتی یان جڤات، کۆبوونەوەی خەڵك تەنیا دەبێتە تەحالفێك، هاوپەیمانێتییەك. بەرای ئەرستۆ سروشت رۆڵێکی پۆزەتیڤانەو گەورەتری بەشار بەخشیوە ئەویش گەشەپێدانی ئەگەرەکانی ئینسانەکان، ئەگەری گەیشتن بەکامڵ بوون، ئەگەری گەیشتن بەو شتەی کە چاکە، جوانە، مەزنە.

شوێنی سیستەمی ستەمکاری لەم وێنە، ئەرستۆیی‌یەدا لەکوێدایە؟

ستەمکاری ئەو سیستەمەیە کە ئازادی کەسو ئەگەرەکانی کەس پایەماڵ دەکا، هەلو مەرجێکە کەتێیدا لە جیاتی پەروەردەکردنی ئەو ئەگەرانە، تیرۆرکردنیان مسۆگەرە، تێیدا ئینسان ناچار دەکرێت بەکەمترین شتو بەنزمترین رۆڵ رازی بێت. سیستەمێکە توندو تیژیو رەقی فەرمانڕەوایە. ئەم رژێمە پایەماڵ کردنی رێکخستنی

سروشتییەو ڕێگرە لەبەردەم گەشەکردنی فیکریو ئەخلاقیو بە مەزنایەتی گەیشتن لای ئینسان. سیستەمێکە لەئینساندا جوانترین شت دەکوژرێ کە بریتییە لەکەڵکەڵەی گەشەکردن بەئاراستەی گەورەییو بەمەزنایەتی گەیشتن. ئەو دەڵێت کە "بەسروشت بەرژەوەندیو عەدالەتێك هەیە کە گونجاوە لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی سەروەر، دانەیەکی دی فەرمانڕەوایەتی شاهانە، دانەیەکی دی بۆفەرمانڕەوایەتی دەستوری، بەڵام هیچ شتێکی سروشتی نییە بۆ فەرمانڕەوایەتی ستەمکاری، یا هەر سیستەمێکی فاسدی ترو شێوەی حکومەتی لەم جۆرە، ئەم ڕژێمانە (واتە ستەمکارانە) هاتونەتە بوون بە پێچەوانەی خواستی سروشتەوە. (١٧)"

گەر ئامانجێکی شارێکی حەقیقی بریتی بێت لەژیانێکی چاك، ئەوا ئامانجی ستەمکاری لەباشترین حاڵەتدا بریتییە لەتەنیا گوزەرانو ژیانو مانەوە، تەنانەت مانەوەش لەژێر سایەی ئەم سیستەمەدا لەژێر مەترسیدایە.

گەر سیاسەتمەدارەکان لەشاری حەقیقیدا "تەشویق ببن بۆ ئەنجامدانی کاری مەزن" ئەوا لەستەمکاریدا هەوڵدەدەن بۆ پاراستنی خۆیانو دابین کردنی ئارەزوو و پێویستییە خود پەرستانەکانیان. ئەرستۆی فەیلەسوفو حەکیم تا ئەوشوێنە دژ بەستەمکاریو ستەمکارەکانە کە دەڵێ "شەرەفێکی گەورە بەو کەسە دەبڕدرێ کەستەمکارێك بکوژێ"(١٨).

لای ئەرستۆ چ ستەمکارەکانو چ سیستەمە ستەمکارەییەکان بێ ئاگان لەژیانێك کە لەلایەن عەقڵەوە ڕێنومایی دەکرێت. ئەو ژیانەی کە سروشت دەیخوازێ، ئەوان لەلایەن غەریزەوە ڕێنومایی دەکرێن. "ستەمکارەکان لەکازیوەوە کە ڕۆژیان دەست پێدەکەن، هەموو ڕۆژەکە لەغەرق بوون لەشەهوەتدا دەیبەنەسەر"و "تەشویقی ڕەعیەتیش دەکەن کە پەیڕەوی لەئازادییەکی فاسدو بەد بەکەن"(١٩) ئەمەش واتە تەشویقکردنی جەماوەر (maltitude - masses) بۆ بوون بەکۆیلەی ئارەزوو و غەریزەکانیان. لای ئەرستۆ "ئارەزوو ئاژەڵێکی کێوییەو عەقڵی فەرمانڕەواکان فاسد دەکا"(٢٠) لەبەرئەوەی چ ستەمکارو چ ڕەعیەت لەلایەن ئارەزووەوە لێدە خورڕدرێن، ستەمکاری کە هیچ سنورێك ناناسێ ئەگەری ئەوەی هەیە کە هەرکارێکی بەدو لەخەیاڵ بەدەر ئەنجامبدا. ئەرستۆ دەڵێ: "ڕاستییەکەی ئەوەیە کە گەورەترین تاوان بەهۆی زیادە ڕۆیییەوە ئەنجام دەدرێت نەك پێویستی"، کەواتە ستەمکاری تاوانێکی گەورەیە نەك بەتەنیا دەرهەق بەهاونیشتمانیان بەڵکو دژ بەسروشتیش، گەر شاری چاك ڕێکخستنێکی سروشتی بێتو چاو لەژیانی عەقڵی ببڕێت، ئەوا ستەمکاری هەواو کەشێکی ناسروشتییەو، لاقە (اغتصاب) کردنی هەموو بەهرەو توناکانی مرۆڤە،و تەنیا دەغدەغەی بەدترین شت لەئینساندا دەکا. ستەمکاری

دەرگاخستنە سەرپشتە لەبەردەم ئارەزووە کیویی‌یەکاندا، ئەو ئارەزووانەی کە سنور ناناسن، ئەو ئارەزووانەی لەدەست جڵەوی عەقڵ هەڵاتوون، ئیدی لەژێرسایەی ئەم سیستەمەدا دەبێت چاوەڕوانی هەموو شتێك بکەین، ئەوسیستەمە بەرجەستەبووی ئیرۆسە، ئەوسیستەمە عەدەمیەتێکی تەمام عەیارە چونکە تێیدا هەمووشت رەوایە، چونکە تێیدا عەقڵ تیرۆر کراوە.

لەکتێبی سێهەمی سیاسەتدا، ئەرستۆ دەست دەکاتە قسەکردن لەسەر سروشتی هاوڵاتێتی (citizenship)، بەدوایدا جۆرەکانی رژێمو جیاوازی نێوانیانو ئیدعاکانیان بۆ عەدالەتی سیاسی. هاوڵاتی بریتییە لەو کەسەی کە بەشداری دەکا لەحوکمداو ئنجا حوکم دەکرێ. هاوڵاتی لەبەڕێوەبردنی عەدالەتدا بەشداریدەکا، لەکاروباری شاردا رۆڵی خۆی هەیە، هاوڵاتی چاك دەبێت بزانێت "چۆن وەك ئینسانی ئازاد حوکم بکاو چۆنیش وەك ئینسانی ئازاد گوێ رایەڵ بێت" .

شوناسی شار لەو کەسانەوە سەرچاوە دەگرێ کە هاوڵاتی ئەوشارەن (politia). بەشێوەیەکی گشتی هاوڵاتی دەشێ واپێناسە بکرێ وەك ئەوەی ئەوکەسەیە کە بەشداری دەکا لەپرۆسەی بڕیارداندا، یاخود بەشی خۆی هەیەو رۆڵی لەفەرمانڕەوایەتیکردندا، جیا لەرێگای بەفعلی بوونی پۆست یا ئۆفیس یاخود بوونی مافی دەنگدان لەبواری مەدەنیداو لەئەنجومەنەکاندا،و "ئەوەی زۆرتر کاریگەرترە لەجیاکردنەوەی هاوڵاتی لەهەموو شتێکی دی بریتییە لەبەشداریکردنی لەحوکمدان (judgement)و وەرگرتنی پۆستێکدا."(٢١)

**هاوڵاتی بوون بەناچاری لەدەستورێکەوە بۆ دەستورێکی دی جیاوازە لەبەرئەم هۆیە پێناسەی ئێمە بۆ هاوڵاتی زیاتر بەسەر دیموکراسیدا دەسەڵاتیو بۆ ئەو دەستورە گونجاوە، رەنگە گونجاویش بێ بۆ دەستورەکانی دی بەڵام مەرجیش نییە. چونکە لەهەندێ دەستوردا جەستەیەك نییە کەپێك هاتبێت لەخەڵکی یاخوود ئەنجومەنێك بوونی نییە، تەنیا کۆبوونەوەی ناوبەناو نەبێت،و رەنگە عەدالەتیش ئیدارە بکردرێ هەرشتە بەپێی خۆی.. بەڵام دەشێ پێناسەکەمان بەسەر دەستوورەکانی تریشدا بچەسپێ.. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانە، ئاشکرابوو کە هاوڵاتی کێیە. هەرکاتێك کەسێك بووە خاوەنی مافی**

**بەشداریکردن لەپۆست یا ئۆفیسدا، هەبوونی مافی مشاوەرەکردن، یاخود مافی بەشداریکردن لەکاروباری قەزائی، ئێمە ئەوکەسە بەهاوڵاتی ئەو شارە دەناسینەوەو ژمارەی ئەو کەسانە کە هێندە زۆربن تا بتوانن ژیانێکی خود ـ کەفا بۆخۆیان دابین بکەن ئەوا بەو کۆمەڵەیەش دەڵێن شار.(٢٢)**

سیاسەت بریتییە لەناونان، پێناسەکردن،و توانای حوکم کـردن، کـە روودەدا لـەو رەوتەدا کە لـەرێگای ئـەو کردەوانـەوە دادەمـەزرێ. لەدواشـیکردنەوەدا، هـاوڵاتێتی وەزیفەی رژێمە، ئەوکەسانەی کە هاوڵاتی دیموکراسین مەرج نییە وەکـو ئـەوان وابـن کەلەژێر سایەی ئۆلیگارشیدا دەژین. لێرەوە، شوناسـی شـار لـەدوا قۆنـاغدا لەلایـەن تایپی ئەو رژێمەوە دیاریدەکرێ کە هەیەتی، نەك جوگرافیا یـا هـەر فاکتـەرێکی دی. رژێمیش بریتییە لەچۆنیەتی رێکخستنی شار. رژێـم رەنگدانـەوەی واقیعـە سیاسـییە بنەڕەتییەکانـە، پـەیوەندی دەسـتەڵاتدارێتی، و پـەیوەندی گروپـە جیاوازەکـان کـە شـارێ پێـك دەهێنـن، بەمانایـەکی دیکـەش کلاسـی لـەرووی سیاسـییەوە خـاوەن دەستەڵات، جەستەی حوکم کەر ئەوشتەیە کە پێی دەڵێن رژێم.

لەسەرەتادا ئاماژدەمان بەجۆری رژێمەکان دا، لێرەدا وەك بیرهێنانـەوە ئـەمجارە دەڵێین کە ئەرستۆ شەش جۆر رژێم دیاریدەکا: شاهەنشاهی کە بریتییـە لـەو شـێوە حوکمەی ـ یەك ـ پیاو یـا فەرمانڕەوایـەتی شـا، ستەمکاری کـە شـێوەیەکی فاسـدی حوکمـی شاهەنشـاهییە، فەرمانڕەوایـەتی چـەند کەسـێك کـە دەشـێ یاشـێوەی ئۆرستۆکراسی بگرێتە خۆی، بۆیەشە پێی دەگوترێـت ئۆرستۆکراسـی لەبـەر دووهـۆ: چاکـترین کەسـی فەرمانڕەوایـەتی دەکـەن، یـاخود چاکـترین کەسـەکان لەفەرمانڕەوایـەتی کردنـدا چـاو لەباشـترینو چاکـترین شـت دەبـڕن بۆشـار، فەرمانڕەوایەتی چەند کەسێك دەشێ شێوەی ئۆلیگارشی لەخۆبگرێ کە شـێوەیەکی فاسدی ئۆرستۆکراسییە؛ ئنجا فەرمانڕەوایەتی کردنی زۆربە کـە فاسـدترین شـێوەی بریتییـە لـە دیموکراسـیو باشـترین شێوەشـی دەشـێت ناوبـبرێت بـەرژێمی ( polity ــ politiea) حوکمـی دەستوری، وەك دەبینـین سـتەمکاری شـێوەیەکی فاسدی حوکمی شاهەنشاهییە.

یەکـەم شـتێك کـە دەبێـت دەربـارەی سـتەمکاری بـیزانین ئەوەیـە کەسـتەمکاری وەزیفەی خێزانو شار بەسەریەکدا دەشێوێنێ. لەگەشەکردنو گەورەبوونی ئینساندا وەزیفەی خێزان بریتییە لەفەراهەم کردنی ژیانو پێویستییەکانی ژیان تا دوای ئـەوە

ئینسان بیر لەکارە سیاسیو عەقڵییە گەورەکان بکاتەوە کە خۆی بواری مەدەنی پێك دەهێنن. مەبەستو نیاز لەخێزان ژیانە نەك ژیانی چاك. لێرەوە ئەرستۆ ئابووری بەنۆکەری سیاسەت دەزانێ، بەڵام بەڕای ئەرستۆ ستەمکاردێتو هەموو وەزیفەکان بەسەریەکدا دەشێوێنێ، شوێنی شتەکان دەگۆڕێ، ئەوەی سیاسییە لەسیاسەت دادەبڕێ، هاونیشتمانێتی، بەشداریکردن لەسیاسەتدا، ئەنجومەنەکان، توانای بڕیاردان، هەرهەمووی شوێنو وەزیفەیان دەگۆڕێ، سیاسەت لەهونەری فەرمانڕەوایەتی کردنو بەشداریکردن لەکاروباری مەدەنییەوە دەگۆڕێتە سەر ڕێکخستنی خێزان، واتە ئابووری. لێرەوە لەستەمکاریدا خۆری سیاسەت ئاوادەبێتو شەوی یەڵدای ئابووری دەست پێدەکا.

لای ئەرستۆ سامان (wealth) هۆکارە بۆ گەیشتن بەئامانج، نەك خۆی لەخۆیدا ئامانج بێت. کاتێك کە سامانو کەڵەکەکردنی سامان بێتە ئامانج ئەوە هەڵەیەکی ئەخلاقی گەورەیە، چونکە لەبیرکردنی ئامانجە سەرەکییەکەی ژیانە، واتە هەبوونی ژیانێکی چاك، بەڵام کاتێك ئینسانەکان ئەم پێویستی بوونە وەك هۆکار تێکەڵ بەپێویستی بوونی موتڵەق دەکەن، خۆیان تەسلیمی هۆکار دەکەن نەك ئامانج. ئێمە دەزانین چێژ پێویستە بۆ بەختەوەری بەڵام کاتێك چێژ دەبێتە ئامانج، ئینسانەکان تەسلیمی چێژ دەبنو تەنیا وێڵی چێژ دەبن، چێژ دەبێتە ئامانج، لەم ڕێگەیەشەوە ئینسانەکان دەبنە کۆیلەی چێژ، هەر بەم شێوەیەش دەبنە کۆیلەی سامان.

**هەندێ خەڵك لەوباوەڕەدان کەزیادکردن (زیادکردنی سامانو موڵکداری - وەرگێڕ) وەزیفەی خێزانو بەڕێوەبردنی خێزانە.. هۆی ئەوەی کە خەڵکی ئەم ئایدیایە لەسەریاندا پەروەردە دەکەن ڕەنگە ئەوەبێت کە ئەوان بەپەرۆشن بۆژیان، بەڵام نەك ژیانێکی چاك، لێرەوە ئارەزووی ژیان بێ سنوور دەبێت، ئارەزووی زۆرترین بڕیش دەکەن تا بەردەوام بن. هەندێکی دی، لەکاتێکدا چاو لەژیانێکی چاك دەبڕن، هەوڵ دەدەن دەستیان بەوشتە بگا کە بنەڕەتییە بۆچێژی جەستە ئەمەش وادەردەکەوێ کەپشت بەهەبوونی موڵکدارێتی ببەستێ، هەموو چالاکییەکانیان لەدەوری بیزنسو بەدەستهێنانی شمەك دەخولێتەوە.. ئەم خەڵکە هەموو مەهارەت دەگۆڕنەوە سەرمەهارەتی بەدەست هێنانی شمەك، وەك ئەوەی کە ئەمە ئامانج بێت، هەمووشتەکانی دی دەبێت خزمەتی ئەم ئامانجە بکەن.(٢٣)**

لای ئەرستۆ "کۆیلایەتیە کە تەنیا ئارەزووی ئەوەبکەین کە بژین، لەجیاتی ئەوەی کە چاك بژین، کۆیلایەتییە کەدوای راو و سەرنجی زۆربە بکەوین لەجیاتی ئەوەی کە ناچاریان بکەین گوێ لەڕای ئێمە بگرن یا وێڵی پارەبین‌و هیچ غەمێك‌و بیرێکمان نەبێت لای ئەوشتەی کە مەزن‌و نەجیبە".

ئەرستۆ ئەوە ناشارێتەوە کەبێزی لەبازرگانی دەبێتەوە، هەموو کۆبوونەوەیەکی بازرگانی یا ئابووری لەشار جیادەکاتەوە وەك سیستەمێکی سیاسی، بەومانایەی کە شار ئامانجەکەیەو خۆشی هۆکارێکە بۆ گەیشتن بەژیانێکی چاك. ستەمکار ئەم موعادەلەیە دەشێوێنێ‌و شار لەبنکەیەکی سیاسییەوە کە تێیدا بەحەقیقەت بوونی خۆی دەگا، دەگۆڕێتە سەر بنکەیەکی ئابووری‌و کەڵکە بوونی سامان دەکاتە ئامانجی ژیان کە ئەمەش لای ئەرستۆ دەست درێژی کردنە بۆ سروشت. لێرەوە ستەمکار ئەوکەسەیە کە بەوشێوەیە لەگەڵ شار مامەڵە دەکا وەك ئەوەی کە خێزان بێت، وەك کۆمەڵەیەکی ئابوری لێی دەڕوانێ کە ئامانجی سەرەکی بەدەستهێنانی سامانە. لەرووی سیاسییەوە ئەمە ستراتیژیەتێکی تری ستەمکاری‌و ستەمکارە بۆرێگە گرتن لەهاوڵاتیان تابیر لەپرسیارە سیاسییە جیدییەکان نەکەنەوە، دروستکردنی حاڵەتێکی ئەوتۆ کە سەرجەم خەڵکی سەرقاڵی کاربن‌و هەمیشەش لەکلۆلیدا بژین. ژیانی ئابووری‌و غەرق بوون لەژیانی ئابووریدا دەبێتە مایەی پووکانەوەی ژیانی سیاسی کە ژیانە بنەڕەتیەکەیە. بەزمانی هانا ئارێنت ئەمە داگیرکردنی بواری مەدەنی (public)ە لەلایەن بواری شەخسی یا تایبەتەوە (private). یەکێك لەمەرجەکانی بوونە مرۆڤ‌و ئازادبوون بریتییە لەتوانای بڕیاردان‌و بەجێهێنانی بڕیارو بەهرەی حوکمدان، وەك هاوڵاتییەکی شار، بڕیاردان‌و حوکمدان دەربارەی ژیانی چاك‌و چۆنیەتی جێبەجێکردنی.

تا ئەوشوێنەی باشترین دەستوور شوێنی مەبەست بێت، هاوڵاتی ئەو کەسەیە کە دەتوانێ فەرمانڕەوایەتی بکاو دەتوانێ فەرمانڕەوایەتی هەڵبژێرێ‌و، فەرمانڕەوایەتی بکرێ لەو دیدەوە بۆ ژیان کە بەپێی فەزیلەتە.(٢٤)

بڕیاردانی سیاسی کە لەچەند قەنەواتێکەوە بەئەنجام دەگەیەنرێت لەوانە ئەنجومەنەکان لای ئەرستۆ رەهەندێکی گرنگ لەخۆدەگرێ ئەویش حیکمەتی عەمەلییە (phronesis).

**ئەو قەناعەتە هەیە کە کەسی حەکیم ئەو کەسەیە**
**دەتوانێ بڕیاربدا بەشێوەیەکی دروست لەسەر ئەوشتەی**
**چاکەو بەسوودە بۆخۆی، نەك سەبارەت بەشتی جزئی،**
**وەکو چی باشە بۆ تەندروستی‌و لایەنی فیزیکی، بەڵکو**

**ئەوشتە چییە کە پێویستە بۆ ژیان بەشێوەیەکی گشتی.**
**نیشانەی ئەمە ئەوراستی‌یەیە کە ئێمە خەڵکانێك**
**بەحەکیم ناو دەبەین کاتێك توانیان حیساب بۆ چەند**
**ئامانجێکی جیدی بکەن (لە دەرەوەی بواری هونەر)**
**هەروەها بەشێوەیەکی گشتی ئەو پیاوەی کە بتوانێ**
**بڕیاربدا ئەوە حەکیمە. (٢٥)**

حیکمەتی عەمەلی بەشێوەیەکی گشتی واتە مەعریفەی ئامانجە گونجاوەکانی ژیانی مرۆڤ، لەگەڵ زانینی هۆکارە ئەخلاقی‌و سیاسییە گونجاوەکان بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە.

لەسیستەمی ستەمکاریدا دانیشتوان توانای پرسیارکردنی حیکمەتی عەمەلی لەدەست دەدەن، توانای بڕیاردان‌و بەهرەی حوکمدانیان کاڵ دەبێتەوە لەمەڕ پرسیارو کێشە گرنگەکانی ژیانەوە (لەدونیای مۆدێرن ئەمە دووبارە دەبێتەوە). لەناوبردنی ئەم توانایەو لەبیرکردنی پرسیارە گرنگەکەی "ژیانی چاك چییە؟" لەسیستەمی ستەمکاریدا بەدوایدا زنجیرەیەك کێشەی تر دەهێنێت لەوانە دانیشتوان ئیدی پرسیار ناکەن کە ئایا ئاڵتەرناتیڤی دی هەیە بۆ وەزعی هەنووکە. نەك دانیشتوان ئیدی پرسیار لەکێشە سیاسییەکان ناکەن بەڵکو ئیدی هەر هەموو لەجیهانە بچووکە تایبەتیەکەی خۆیاندا زیندانی دەبن، بەڵکو هەستی هاوبەشی، هەستی بیرکردنەوە لەکۆمەڵو جڤات، بەرەو کاڵ بوونەوە دەڕوا.

لەحاڵەتە سروشتییەکەدا ئینسانەکان لەجڤاتی سیاسیدا دەژین لەسەر بناغەی هاوڕێیەتییەوە ئەمەش دەبێتە مایەی زاڵ بوون بەسەر تەنیایداو گەشەکردنی بەهرەو تواناکانی مرۆڤ.

**خۆش ویستنی هاوڕێ، واتە خۆش ویستنی شتەکانی**
**خۆ. لەبەرئەوەی دی، کاتێك پیاوێك دەبێتە هاوڕێی**
**پیاوێکی دی، دەبێتە چاکەی ئەوی دی، بەم شێوەیە**
**هەریەکە چاکەو شی خۆی خۆش دەوێت، و ئەو**
**پاداشتەش دەداتەوە کەلەوی ترەوە بەدەستی گەیشتوە**
**لەرێگای ئاواتخواستنی چاکەوە بۆ ئەوی دی‌و**
**دانی چێژ پێی. عیبارەتێك هەیە دەڵێت "بەتەنگەوە**
**هاتن بەشداریکردنە" ئەم خاسیەتانەش خاسیەتی**
**هاوڕیەتی پیاوە چاکەکانن.**

گەر ئەمە حاڵەتە سروشتییەکە بێت، ئەوا ستەمکاری حاڵەتە ناسروشتییەکەیە. ستەمکاری کارێك دەکا کە "بەتەنگەوە هاتن" وەك هەستێکی نەجیبی ئینسانەکانی ناوشار لەناوبچێ، جڤات بتوێتەوەو ئینسانەکان نەك تەنیابن بەڵکو پەیوەندییەك لەنێوانیاندا دەخولقێنێ کە پەیوەندییەکی ستەمکارانەیە، نەك هاوڕێ نابن بەڵکو دەبنە ستەمکار بەسەریەکترەوە، نەك بەتەنگەوەهاتن کاڵ دەبێتەوە بەڵکو ترس ئەمجارە دەبێتە فەرمانڕەوای نێو پەیوەندییەکان. لێرەوە ستەمکاری ئەو سیستەمەیە کە تێیدا هەستی کۆمەڵ بوون، سەر بەکۆمەڵەو جڤات بوون، هەستی هاوبەشیو بەتەنگەوەهاتن دەمرێت. لەجیاتی هاوکاریو هاوغەمیو هاودەردیو پێکەوە بیرکردنەوەو گفتوگۆ کردن لەسەر باشترین ژیان، پەیوەندییەکان شێوەی خودپەرستی، بەکارهێنانی یەکتر، دوژمنایەتی، گومانکردن،و ئنجا تەنیایی موتڵەق لەخۆدەگرن. لێرەوە شارێك سەرهەڵدەدا کەشاری کەسە ئازادەکان نییە، بەڵکو شارێکە کە تێیدا پەیوەندییەکان دەبنە پەیوەندی سەروەرو کۆیلە، یەکێك بێزی دێتەوە، ئەوی دی حەسوودی هەیە، شارێك کەتێیدا هاوڕێیەتیو هاوڕێی چاك دەگمەن دەبێت، تێیدا خۆری بەتەنگەوە هاتن ئاوا دەبێتو شەوی بوغز باڵی بەسەردا دەکێشێ.

# بەندی چوارەم

## کۆڵەکەکانی ستەمکاری: ترس، عەشق، خووی پەرستن و گۆشەگیری
## خوێندنەوەی دوو کتێبی مۆنتسیکیو
## "رۆحی یاساکان" و "نامە فارسییەکان"

## پێشەکی:

لەنێو ژمارەیەکی کەمی بیریارەکان، ئەوانەی لەپشت ریشەکانی ترادسیۆنی لیبراڵەوە وەستاون، وەك هۆبزو سپنۆزاولۆك، شوێنی مۆنتسیکیو جێی گومان نییە. کۆمەڵێ چەمكو ئایدیا کە ئەمرۆ بەشێکن لەقاموسی سیاسیو بوونەتە هەستی هاوبەش (Common Sense) داهێنانی مۆنتسیکیون، مۆنتسیکیو بیریارێکی مۆدێرنتی سیاسی بوو بەپلەی ئیمتیاز.

لەکتێبە گرنگەکەیدا، "رۆحی یاساکان"، ئەو جەغد دەکاتە سەر حەماسەتی رۆحی مەدەنی public یاخود فەزیلەتی مەدەنی public virtue کە هۆکارێکی زیندوو راگرتنی جڤاتە (Community). تێگەیشتنی کلاسیك بۆ فەزیلەت تێگەیشتنێکی نا - ئیگالیتاری - نا - یەکسانی خوازی - بوو: فەزیلەت کۆمەڵێ داواکاری دەخستە بەردەم ئینسانەکان، ئەوانەی کە یەکسان نەبوون، کە یەکسان بوون چ لەتواناو چ لەمەوقعدا، و لەرێگای داوو پێنك - ستانداردی - فەزیلەتەوە عادل ترین شێوەی حکومەت وا دەردەکەوت کە بریتی بێت لەئەرستۆکراسی، مۆنتسیکیو پێی وابوو کە راستی فەزیلەی کەشف کردووە لەسیستەمی کۆماریدا (Republic) کە ئەو سیستەمە پراکتیکی دەکا، وەك دژە بۆچونێك لەمەڕ فەزیلەتەوە بەو شێوەیەی کە فەیلەسوفەکانی کلاسیك لەفەزیلەت گەیشتبوون. مەبەستیش لەسیستەمی کۆماری واتە سیستەمی دامو دەستگاو یاساکان. مۆنتسیکیو لەلایەکی دیکەوە غەمی ئەوەی دەخوارد کەسیستەمێ یا کۆمەڵگایەك دابمەزرێندرێ کە ئەمرۆ ژانە ناو ریزدەکرێ وەك "کۆمەڵگایەکی مرۆڤدۆستانە" (humanized). لەراستیدا لەگەڵ مۆنتسیکیوو بەهۆی مۆنتسیکیووە بوو کە "مرۆڤایەتی" (humanity) وەك چەمكو ئایدیایەك شوێنی چەمكو ئایدیای مەسیحیانەی "خێر" (charity)ی گرتەوە وەك چەمکێکی سەرەکی لەگوتاری سیاسیدا. ئەو دەیویست ریشەکانی ئەم سۆزو حەماسەتە، مرۆڤایەتی، بخاتە بەر رووناکیو ئەو هەلو مەرجە سیاسیانەش بدۆزێتەوە کە دەبنە مایەیپاڵپشتو برەو پێدانی ئەم سۆزو حەماسەتە، مرۆڤایەتی. هەروەها پرسیاری

"ئازادی ئینسان" چییە، کامە سیستەمی سیاسی دەتوانێ ئەم ئازادییە فەراهەم بکا، مەبەستی سەرەکی "رۆحی یاساکان"ە.

فەلسەفەیەك کە لەپێشەکی کتێبی یەکەمی "رۆحی یاساکان"دا ناسێنراوە دوو ئامانجی هەیە: تێگەیشتن لەهەمە چەشنەیی یاسا ئینسانییەکان و عورف (moris) (یاسا نەنووسراوەکان)، وە ئامانجی دووەم، کۆمەك کردنی هەر حکومەتێ کە گوێ لەراوێژی بیریارەکان بگرێ. ئامانجی یەکەم تیۆرییەو دووەم عەمەلی. پەیوەندیشیان لەکێشەی "یاسا" خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ. لەدەست پێکردنە بەناو بانگەکەیدا بۆ دارشتنی تێگەیشتن لەیاسا، مۆنتسیکیو یاساکان وا پێناسە دەکا، لەچرترین مانادا، وەك پەیوەندیە پێویستەکان کەلەسروشتی شتەکانەوە سەرچاوە دەگرن. یاساکان بریتین لە پەیوەندییەکان: بونێکی مەوزوعی و پێویستیان هەیە. یاساکان فەرمانرەوایەتی کرداری هەموو شتەکان دەکەن، هی خودا لەسەر جیهان، هی جەستەکان لەسەر یەکتر، بەم شێوەیە تا دوای ئەم حاڵەتە یاساییە گەردونییە ئەو پێشینەیەیە کە دەبێت لەرێگەوەی لەیاسای ئینسانی بروانین. بەڵام زاراوەی "یاسا" زاراوەیەکی ئاشکرانییەو چەند مانایەك لەخۆدەگرێ: لەتەشریعی ئینسانیدا یاسا مانای یاسا دانەر لەخۆ دەگرێ، راگەیاندنی یاسا بۆ ئەوانەی کە دەبێت پەیرەوی لێ بکەن، لەلایەکی دیکەوە یاسا واتە جێ بەجێکردنی (enforcement). یاسا بەمانای رازی بوون لەسەر شتێك، اقرار، قەدەغە کردن.. هتد. بەڵگە نەویستە کەپێش یاسا ئینسانییەکان ئینسان دێت. لێرەوە بۆ تێگەیشتن لەهەمە چەشنەیی یاسا ئینسانییەکان ئێمە دەبێت وێنای ئەوە بکەین کە ئەو یاسایانە لەسروشتی ئینسانەوە هاتوون کەوەك بکەرێك کە خاوەنی کردارەکانە لەنێو رەوتە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکاندا. جیاوازی و هەمە چەشنەیی ئەو رەوتانە خۆی بەمانای هەمە چەشنەیی کاروباری ئینسانەکان دێت، لەهەمان کاتیشدا ئەو رەوتانە لەمێژووی هەموو نەتەوەکان دەدوێ، بەو مەرجەی کە ئێمە پرنسیپە گشتییەکان بزانین کە لەم مەسەلەیەدا شوێنی پەیوەندین، بەو مەرجەی کە لەحاڵەتە ئیستسنائیەکان بگەین و حیسابیان بۆ بکەین، لەوانە مەهارەتی سیاسی، شانس وە هتد. زانستە مرۆڤییەکان پێویستی بە لێکۆڵینەوە مێژووییەکان هەیەو داوای دەکا، ئەم لێکۆڵینەوانەش پەیوەندی نێوان تیووری و پراکتیك رۆشن دەکەنەوە، هەروەها ئەو پرسیارەش دەخەنە روو: ئینسانەکان چۆن بوون پێش دارشتنی یاسا ئینسانییەکان؟ بۆچی ئەو یاسایانە سەریان هەڵدا.

هەر لەسەرتاوە، خواستی پێناسەیەك بۆ یاسا، مۆنتسیکیو وادیارە کە ئەو بۆچوونە قبولْ بکا دەربارەی یاسا کە یاسا وەك بەیانکردنی عەقلْ دەبینێ[1] یاخود

لەراستیدا یاسا هیچ نییە جگە لە خوودی عەقلْ[٢] کـە هـەر لەسـەرەتای زەمەنـەوە بوونی هەبوە (واتە یاسا وەك عەقڵو وەك بەیانکردنی عەقل) بەڵام چاوەڕوانی هەلو بۆنەیەکی گونجـاوی کـرد تـا خـۆی بـۆ مرۆڤایـەتی دەربخـاو نیشـان بـدا. یاسـا وەك ئامرازێك سەر هەڵدەدا بۆ سەرکوتکردنی کۆمەڵیْ غەریزە، کەڵکەڵـە،و ئنجـا جـەنگو جـەدال چ لـەناو کۆمەڵگایـەکدا یـاخود لـەنێوان کۆمـەڵگاکاندا، لـەناو کۆمـەڵگادا، پـەیوەندی نێـوان فـەرمانڕەواکانو فەرمانبەسـەر دراوەکـان (یاسـای سیاسـی) و پـەیوەندی هاونیشـتمانییەك بەهاونیشـتمانییەکی تـرەوە (یاسـای مـەدەنی) ئەمانـە دادەمەزرێندرێن بەشێوەیەكو بەنیازی یەکخستنی جڤاتێك کەگەر ئەم یاسایانە نـەبن ئەوا ئەو جڤاتە وجوودی نـابێت وە بگـرە یـەکتر تـەفروتونا دەکـەن. ئایدیـای مـاف، عەدالەت، ئەرك هەر هەموو لەئایدیای یاساوە سەرچاوە دەگرنو پێـش ئـەو بوونیـان نییە. بەڕای مۆنتسیکیو ئینسان بەسروشت یا بەئەسڵ هۆشیاری یا هەسـتی واجـب، یا ئەرك ناناسێت، بەمانایەکی دی هەست کردن بەلێپرسراویو ئەرك بەرانبەر ئـەوانی دیکە حاڵەتێکی سروشتی نییە بـەڵکو زادەی پـەروەردەکردنی عەقڵـە، زادەی کـاملْ بوونە.

**مۆنتسیکیو دەڵیْ:**

**یاسا بەشێوەیەکی گشتی، بریتییە لەعەقڵی ئینسان تا ئەو شوێنەی کە حوکمی خەڵکانی گۆی زەوی دەکا،و یاسا سیاسیو مەدەنییەکانی هەر نەتەوەیەك دەبێت ئەو مەسەلانە بێت کە ئەم عەقڵەی ئینسان بەسەریاندا دەچەسپیْ (٣)**

یاساکانی هەر نەتەوەیە دەبێت ببەسترێتەوە بەشێوەو جۆری ئەو حوکمەتەی کـە هەیەتی (واتە ئەو نەتەوەیە)، هەلو مەرجی فیزیکی ئـەو نەتەوەیـە، (بۆنمونـە ئـاوو هـەوا، جوگرافیـا) ئنجـا هـەلو مـەرجی کۆمەڵایـەتی (بۆنمونـە ئـازادی، بۆچوونـی ئەوخەڵکـە بەرانبـەر بـەئازادی، عـورف، عـادات، بازرگـانی، ئـایین). هـەموو پەیوەندیەکانی کە یاساکان هەیانە دەبێت هەیانبێت، هەموو پێکەوە ڕۆحی یاساکان پێك دەهێنن. لێرەوە کتێبی "ڕۆحی یاساکان" ڕاڤەکردنی کۆمەڵیْ شتی جیاوازە کە پەیوەندیان بەیاساوە هەیە.

مۆنتسیکیو وەك تیۆریستێکی فەلسەفەی سیاسی زیاتر لـەرێگای کتێبـی "ڕۆحـی یاساکان"ەوە کە لەساڵی ١٧٤٨ دا چاپی کردوە دەناسرێتەوە وەك لەرێگای کتێبـی "نامە فارسییەکان" کـە لەسـاڵی ١٧٢١دا چـاپی کـردوەو یەکـەمین کتێبێتـی. بـەڵام بەرای من کتێبی "نامە فارسییەکان" گرنگییەکی لەڕادەبـەدەری هەیـە. لەلایەکـەوە

رەگو ریشەی کۆمەڵێ چەمكو ئایدیا كە دواجار لە "رۆحی یاساكان"دا تەواو شێوە دەگرن، سەرەتا لەکتێبی "نامە فارسییەکان"دا دەتوانین بیانبینینەوە. لەلایەکی دیکەشەوە ئەم کتێبە بەهایەکی ئەدەبیو ریتۆریکیو تیۆری گەورەی هەیە. وەسف کردنی "نامە فارسییەکان" ئاسان نییە، بەڵام ئاشكراترین خاسیەتی ئەو نامانە هەمەچەشنەییە، هەمەچەشنەیی بابەتەکانی ئەو نامانە: ئەدەب، حەریم، میناتۆر، ئایین، ستەمکاری، عەشق، ترس، عاداتو تەقالید، پەیوەندی ژنو پیاو، کۆنترۆڵ، خۆرهەڵاتو ئەوروپا (گومان نییە لەوەی کە "نامە فارسییەکان" سەرەتای دروستکردنی هاوکێشە یا دوو دژەیەکی خۆرهەڵاتو ئەوروپایە، واتە سەرەتای گوتاری ئۆرێنتاڵیزمەو وێناکردنو دروستکردنی خۆرهەڵات وەکو مەخلوقێکی ناو خەیاڵی ئینسانی ئەوروپی). زۆربەی نامەکان بەشێوەیەك رێکخراون کە لەلایەکەوە بۆچوونی میتافیزیقی لەخۆ بگرن لەپاڵ تەنزی کۆمەڵایەتی، مەزەنەکردنی مێژوویی دەربارەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو ئنجا نیشاندانی ستەمکاری فارسیو .. هتد. لەلایەکی دیکەوە ئەم کتێبە لەچەند بەشێك پێکهاتوە لەوانە دەربارەی ژیانی فەرەنسیو کۆمەڵگای فەرەنسی لەرێگای ئەو نامانەوە کە وەك راپۆرت وان لەفەرەنساوە دەنێردرێنەوە بۆ وڵاتی فارس، ئەمە دوای ئەو بەشانەی كە دوو فارس وڵاتەکەیان جێدەهێڵن، ئۆزبەكو ریکا، وێڵی رۆشنگەرین لەئەوروپا، ئنجا ئەو بەشانەی کە لەهەرەسهێنانی دیسپلینی لەنێو حەرەمی ئۆزبەکدا دەبینین. لەسەرەتادا تۆنی نامەکان گەشبینانەیە، بەڵام لەدواییدا فەرنسا دووچاری کارەساتی دراوی دەبێت،و لەوڵاتی فارسیشدا دوژمنایەتی شوێنی عەشق دەگرێتەوە، ئەمەش لەسەر تۆنی نامەکان رەنگ دەداتەوە.

مەبەستی سەرەکی مۆنتسیکیو لەکتێبی "نامە فارسییەکان"دا نیشاندانو وەسفکردنی ستەمکارییە (Despotism) لەتوندوتیژترین شێوەیدا، تاکو فەرەنسییەکان عیبرەتی لێوەربگرنو لەدەوری سیستەمی ئەنجومەنەکان کۆببنەوە کە لەلایەن ریجنت (Regent)ەوە دامەزرێنرابوون، ریگپت دیوکی، ئۆرلینس بوو تا فەرەنسییەکان دوورە پەرێزی بکەن لەسەرهەڵدانی وەزیرە زۆر بەدەستەڵاتەکان، بۆ نموونە کەسانی وەك لویڤیس (Louvois)، تارێگە نەدەن کەسیستەمێکی ستەمکاری وەکو فارسیو تورکی لەفەرەنسا شوێن پێی خۆی بکاتەوە. لێرەدا دەبێت سەرنجی خاڵێکی گرنگ بدەین ئەویش ئەوەیە کە نیشاندانی ستەمکاری فارسیو تورکیو گەندەڵی سیاسیانەی ئەو سیستەمە خۆرهەڵاتیانە خۆی لەخۆیدا ئامانج نییە، هەروەها مەبەستو نیاز هەوڵێکی مێژوویيو مەعریفی نییە بەڵکو ئامانجی سەرەکی لەلایەکەوە بە ئەوی دیکە کردنە (othering)و لەلایەکی دیکەوە جەغدکردنە سەر

دنیاو ماڵی خۆیە (ئێمە ـ us)، لەم هاوکێشەیەدا ئەوەی لە مەرکەزدایە (ئێمەی ئەوروپی) هۆشیاربین‌و خۆمان لەو هەمووشتانە بپارێزین کە ئەوی دیکە پێیانەوە دەناڵێنێ. تا ئەمڕۆ رۆڵی ئێمەی خۆرهەڵاتی‌و نیشاندانی ئێمەو سیستەم‌و کلتوری ئێمە مەبەست لێی جگە لەکێشەی کۆنترۆڵ کردن، مەسەلەیەکی دیکەی ئاشکرایە، ئەویش سەیرکردنی ئێمە وەك ئاوێنەیەك تا "خۆرئاواییەکان" یا ئەوروپیەکان لەبەردەمیدا خۆیان چاك بکەن، خۆیان جوان نیشان بدەن، تا ئەمڕۆ ئێمە تاقیگای ئەزموونە کەینونیەکانی ئینسانی ئەوروپی‌و "خۆرئاوایی"ین.

ئەوەی کە شوێنی گومان نییە ئەوەیە کە مونتسیکیو لەم کتێبەدا ئەو جۆرە ئەدەبە (Genre) هەڵدەبژێرێ کە گونجاوە بۆ وێناکردنی ئەو ستەمکارییەی کە لەو سەردەمانەدا لەئاسیادا بوونیان هەبووە، لەلایەکی دیکەشەوە ستەمکاری ئاسیاوی هەر لەمێژەوە بۆ خۆی ببوە شوێنی باس‌و لەفیکری سیاسیدا شوێنی خۆی کردبوەوە، زۆر پێش مۆنتسیکیو، بەپلەیەك کە ئەو مەسەلەیە هێندەی فەلسەفەی سیاسی کۆنە، بۆ نموونە لەکتێبی سێهەمی "مێژووەکان"دا هیرۆدتس (Herodotus) باس لەو حاڵەتە دەکات کە چۆن فارسەکان فەرمانڕەوایەتی شاهنشاهیان هەڵبژاردوو ئەم مۆنارکیەش چۆن دواجار دەبێتە ستەمکار (Despotic) لەسەردەستی شاکاندا، ئەوانەی دەیانویست کە یۆنان داگیربکەن، هیرۆدتس ناو لەچەندین ستەمکاری فارسی دەهێنێت.

مۆنتسیکیو بەدەوری خۆی کۆمەکی کرد لەهێنانە کایەوەی فەنتازیاو تەعەجوب کردن لەمەڕ خۆرهەڵاتەوە لەرێگای جەغدکردنە سەر وەحشیەت یان سەیرو سەمەرەیی عادات‌و تەقالیدی فارسی. هەروەها ئەو دیمەنە فارسییانەی کە لەو نامانەدا دەیانکێشێ بەکاریاندەهێنێ بۆ نیشاندانی بەزەیی‌و رەحم بەرانبەر بە فەرەنسیەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە رەعیەتی (subject) سیاسی‌و ئاینین، ئنجا ئافرەتان. بەشێوەیەکی گشتی لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە ناسکەدا کۆمەڵێ هەستمان لادروست دەبێ، لەوانە وڵاتی فارس بەڕاستی شوێنی وەحشەت‌و ترسە، بەڵام شوێنی سەرسوڕمان‌و ئنجا شوێنی ئیعجابیشە. نامەکان شتێکمان دەخەنە بەردەم کە نزیکە لەشیکردنەوەی سۆسیۆلۆژییەوە بەڵام لە رێگای زاراوە خەیاڵیەکانەوە، شتێك کە ناسروشتییە ئەویش حاڵەتێك کە لەحەرەمدا بوونی هەیە، حاڵەتێك کە لەگرژی نێوان ژنەکان‌و خەساوەکان‌و خەسێنەرەکاندا هەیە.

(ئونەك ـ Eunuch هەم مانای خەساوو هەم مانای خەسێنەر دەگەیەنێت)

خاڵێکی تر کە دەبێت سەرنجی بدەین ئەوەیە کە لەسەدەی شانزدەهەم‌و حەڤدەهەمدا وەك یەك سەیری ستەمکاری تورکی‌و ستەمکاری فارسی دەکرا.

لەکاتێکدا ئەو دووسیستەمە ستەمکارییە جیاوازیان هەیە بەڵام لەترادسیۆنی سیاسی ئەو دووسەدەیەدا زیاتر جەغد لەسەرخاڵی ناوکۆیی ئەو دوو سیستمە بوو ئەویش ستەمکاری. ئەو باوەڕە زۆر باو بوو کە هەموو حکومەتە خۆرهەڵاتیەکان ستەمکاری بوون، وەك چۆن ئۆزبەك بۆ رهدی (Rhedi) دەنوسیٚ:

**"لەوکاتەوە کە من لەئەوروپام، رهدی ئازیزی من، من چەندەها حکومەتم بینیوە. حاڵەتەکە بەهیچ شێوەیەك لەئاسیا ناچێت، لەئاسیایەکدا کە فەرمانڕەوا سیاسییەکان هەمیشەو هەمیشە یەکێکن"(٤)**

مۆنتسیکیو لەپەیوەندی نێوان ستەمکاری و شێوەکانی تری حکومەت دەدویٚ لەو نامانەدا. ئۆزبەك لەنامەیەکدا بۆ ئیبین (Ibhen) دەنووسیٚ:

**"زۆربەی حکومەتەکانی ئەوروپا شاهەنشاهین، یاخود وایان پیٚ دەگوتریٚ، چونکی من دڵنیانیم کە هیچ کات حکومەتێکی شاهەنشاهی بوونی هەبێت. بەلانی کەمەوە سەختە بۆ حکومەتیٚ لەو جۆرە بۆماوەیەکی زۆر بەشێوەیەکی چاك بمێنێتەوە. چونکی شاهەنشاهی حکومەتێکی توندوتیژ ئامێزە، هەمیشە سەرەو لێژ دەبێتەوە بەرەو ستەمکاری یاخود ریپەبڵیك (کۆماری). دەستەڵات هەمیشە لەلایەك مەحف دەبێتەوەو لەلایەکی دی گەشەدەکا. بەڵام تەرازووەکە هەمیشە بەلای میردا سەنگە چونکی ئەو هێزی سەربازی لەژێر دەستدایە"(٥)**

بەڕای مۆنتسیکیو چەندشێوەیەکی دەوڵەت هەن وەك بوون بەهێز نەك وەك بوون بەکردەوە، بەڵام بەهۆی ئینفعالات و کەڵکەڵەو حەماسەتی ئینسانەکانەوە، ئەم شێوە موجەڕەدانەی دەوڵەت دەیانەوێت بەفعلی ببنە واقعی و بەرجەستە ببن. لەکتێبی "رۆحی یاساکان"دا ترس لەستەمکاری ئامادەیەکی تەواوی هەیەو مۆنتسیکیو وەك ئەگەرێك سەیری دەکاو بەمەترسیەکی گەورەی دەزانیٚ لەحکومەتە شاهەنشاهییە ئەوروپیەکانداو تیۆرییە بەناو بانگەکەشی، واتە جیاکردنەوەی دەستەڵاتەکان، تەشریعی و تەنفیزی و قەزائی، مەبەست لەو تیۆریەش هەوڵدانێکە بۆ رێگەگرتن لەستەمکاری، لەئەگەری ستەمکاری کە حەقیقییە. لە "نامە فارسییەکان"دا ترس لەستەمکاری خۆی لەوشتەدا دەبینێتەوە کەنامەی سەدودوو باسی لێدەکات ئەویش

سزادانی وەحشیانەی ئینسانەکانە لەلایەن فەرمانڕەوا فارسەکانەوە. خاڵێك کەشوێنی سەرنجو تاڕادەیەکیش سەرسوڕمانە ڕۆڵی عەشقە لەسیستەمی ستەمکاریدا. لەدەوڵەتە ستەمکاریە ئاسیاویەکاندا ئەوە ئامادەبوونی عەشقە لەشێوە هەرە گرژییەکەیدا، پەرستنو عیبادەت بۆ کردن، کەکارێك دەکا کە ڕەعیەت دەبەستێتەوە بەمیرەکەیانەوە، لەهەمانکاتیشدا ترس لەژیانیان کە خۆی لەبەیانکردنی خۆشەویستیان بۆ میردەردەبڕیّ.

دەربارەی پەیوەندی شێوەکانی حکومەتو جۆرەکانی عەدالەت کە لەسروشتی ئەو شێوانەی حکومەتەوە سەرچاوە دەگرن، مۆنتسیکیو لەسەر زمانی ئۆزبەکەوە لەنامەیەکدا بۆ ڕهدی دەنووسیّ:

**"گەر لەژێر سایەی حکومەتێکی بەڕەحمدا، نەتەوە بەشێوەیەك بەچۆکدا بێت هەروەك ئەوەی کە لەژێرسایەی حکومەتێکی دڕندەدا هەیە، ئەوا حاڵەتی یەکەم زیاتر شوێنی قبوڵکردنە، چونکی زۆرتر لەگەڵ عەقڵدا دەگونجیّ لەکاتێکدا دڕندەیی بەعەقڵ نامۆیە. دڵنیابە ڕهدی ئازیز، کە لەدەوڵەتدا پلەی وەحشیەتی سزاکارێك ناکا کە خەڵکی زیاتر مل کەچی یاسابن. لەو وڵاتانەدا کەسزا شێوەیەکی ئیعتدالی وەرگرتوە، یاساکان شوێنی ڕێزن هەروەك چۆن لەو وڵاتانەدا سزادان شوێنی تۆقاندنە چ حکومەت بەڕەحم بێت یا وەحشی، سزا هەمیشە بەپلەدابەش دەکریّو.. پەیوەندی بەعادات و تەقالیدی وڵاتەوە هەیە، هەفتەیەك لەزیندان یاخود دانی بڕیّ پارە سەرنجی ئەوروپیەك ڕادەکێشیّ کە لەژێر سایەی حکومەتێکی بەڕەحمدا دەژی، هەروەك چۆن لەدەستدانی دەستێك ئاسیاویەك دەترسێنیّ.. غەمی لەدەست دانی ناوبانگ بەڕاستی فەڕەنسیەك ئازاردەدا کە حوکمی بەسەردا دراوە هەر هەمان کاریگەری هەیە کە تورکێك لە لەدەست دانی سەر خەوشکاندنێکی چارەکە سەعاتی دەیترسێنیّ"(٦)**

کەواتە لەودیو عەدالەتەوە ئەوە پەیوەندی یەکەسیەکانە کە دەوڵەت پێکەوە گرێدەدا، ئەو پەیوەندیانەش وەك یەکن چ لەخێزاندا، لەنێوان ژنو مێرددا، براو

خوشك، سەربازەكان لەئۆردویەكی سەربازیداو.. هتد. لە"نامە فارسییەكان"دا مۆنتسیكیو هەوڵ دەدا كە هەموو جۆرە شیاوەكانی بناغەی دەستەڵات تاقی بكاتەوەو بیخاتە ژێر پرسیارەوە، لەوانەش دەستەڵاتی ستەمكار.

دەتوانین بڵێین كە "نامە فارسییەكان" دەربارەی عەشقن، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ترس، ئنجا بارگاوی كردنی رەعیەت، یا هەریەك لەو پەیوەندیانەی سەرەوە بەخووی پەرستن، تەنیا لێرەوە دەتوانین لەدیاردەی سەرا بگەین، سەرا وەك وەسفی مۆنتسیكیو بۆ حكومەتێكی ستەمكار. لێرەدا باپرسین، لەچوارچێوەی ئەم كتێبەدا، پرنسیپی داینامیك چییە لەسەرادا كە باڵا دەستە؟ بەسەر سورمانەوە، بریتییە لەو حاڵەتەی كە سەروەر، یا ئاغا، سەرۆك خێزان، عەشقی خۆی بۆ ژنەكانی بەیان دەكاو ژنەكانیش دەبێت عەشقی خۆیان بەیان بكەن‌و ئنجا مل كەچ بن. بەڵام لەنێوانیاندا، واتە لەنێوان سەروەرو ژنەكانیدا، خەساوەكان، خەسێنەرەكان (eunuchs) هەن كە كاروباری سەرا رێكدەخەن‌و سەرپەرشتی ژیانی ناو سەرا دەكەن. ئەوكاتەی بەناوی سەروەرەوەدەجوڵێنەوە ئەوا دەستەڵاتێكی لەرادەبەدەریان هەیە بۆ سزادان‌و گەر پێویستیشی كرد هەقی كوشتنی هەركەسێ كە سەرپێچی بكا لەئیرادەیان. ئەم گرژییە لەنێوان بەیانكردنی ئاشكرای خۆشەویستی كە سەپێنراوە بەسەر هەموو كەسێكدا لەسەرادا،و میكانیزمە شاراوەكانی ترس لەسزادان‌و مەرگ، ئەم گرژییە بریتییە لەداینامیكی ئەو كۆمەڵگایە كە سەرایە، كەسیستەمێكی ستەمكارییە. (دواجار دەگەڕێنەوە سەر "نامە فارسییەكان"، بەڵام باجارێكی دی سەیرێكی "رۆحی یاساكان" بكەینەوەو ئەمجارە كەمێك وردتر لەكێشەكان قسەبكەین).

لە"رۆحی یاساكان"دا مۆنتسیكیو لەچەندین جۆری حكومەت دەدوێ لەرێگای ژماردنی ئەگەری "جۆرەكانی"حكوومەت، كە هەریەكە لەرێگای چەند خاسیەتێكەوە دەناسرێنەوە كە تایبەتن بەسروشتی ئەو حكومەتەوە، ئەوەش كە سروشتی ئەو حكومەتە دیاریدەكا بریتییە لە "بونیادێكی تایبەت" یاخود كەسەكانی كە "دەستەڵاتێكی سەربەخۆیانە" دەبەخشنە ئەو حكومەتە [(٧)]. "ئەم سروشتە تایبەتیەی هەر حكومەتە جۆرە شێوازێكی تایبەتی ژیان دەخوازێ، كە مۆنتسیكیو ناوی دەبا بە گونجاندنی رۆح"، و ئەم گونجاندنی رۆحەش لای مۆنتسیكیو بریتییە لەپرنسیپی هەر شێوەیە لەحكومەت، پرنسیپێ كە ژیانی هەموو هاونیشتمانیان دەگرێتەوەو هێزێكی پاڵنەرە، رۆحی حكومەت، ئەم پرنسیپە كاریگەریەكی مەزنی هەیە لەسەر یاساكان.

لای مۆنتسیکیو ئامانجو مەبەست یاسروشتی حکومەت بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە بەرکەماڵ کردنی ئاسایش، یاخود ئازادی بۆ هاونیشتمانیان ، ئازادبوون لەکۆنترۆڵو ئازاد بوون لەهەڕەشەی مەرگ یا پەلاماردانی کەسانی دی. مۆنتسیکیو حکومەت بەسەر سێ یا چوار (پەیوەندی بەوەوە هەیە کە چۆن دەیخوێنینەوە) جۆر یا شێوەدا دابەش دەکا، ریپەبڵیك (Republic) (کە دەشێ دووجۆر لەخۆ بگرێ: ئەرستۆکراسیو دیموکراسی)، شاهەنشاهیو ستەمکاری. وەك پرنسیپێکی گشتی، ئەرکی حکومەتە کە لەبیری چاکەی گشتیدا بێت، چاکەی گشتیش چاکەیەکە بۆ هەموو خەڵك. بەڵام حکومەتێك کە ئۆرستۆکراتییە بریتییە لە فەرمانڕەوایەتی "بەشێك لەخەڵك"[8]، ئەم بەشەش لەخەڵك بەتەنگ گشتەوە نایەت، چاکەی گشتی، بەڵکو وەك ئامرازێك لەچاکەی گشتی دەڕوانێ بۆ برەو پێدانی بەرژەوەندییەکانی خۆی. لەدیدگای دیموکراتەوە، ئەوکاتەی "بونیادی حکومەتت" زانی، ئەوکاتەی زانیت کێ حوکم دەکا، ئەوسا دەزانی چاکەی کێ خزمەت دەکرێ. مۆنتسیکیو لەم بارەیەوە دەنوسێ "نەجیب زادەکان لەرژێمێکی ئۆرستۆکراسیدا جەستەیەك پێك دەهێنن لەبەرژەوەندی تایبەتی خۆیان،.. کە ئەومەبەستەیە دەبێتە مایەی سەرکوتکردنی بەرژەوەندی خەڵك" لەورژێمەدا، نەجیبزادەکان چونکی ئاسایشو دەستەڵاتی "شا"یان نییە، ئەمە وادەکات زیانر تموح (ambitious)بن.

دیموکراسی، بەپێچەوانەوە، حکومەتی خەڵکییە چونکی دەستەڵات پشت بەهەمووان دەبەستێ، دیموکراسی بەرژەوەندییەکی تایبەت سەرکوت ناکا بەڵکو سەرگەرمی "بەرژەوەندی گشتی یا مەدەنی" دەبێت. لەم سیستەمەدا، یا جۆری حکومەتەدا، هەر هاونیشتمانییەك راستەوخۆو بەشێوەیەکی یەکسان دەنگیان هەیە لەبڕیارە گرنگەکاندا کە جڤات (community) دەیاندات لەفەزایەکی کراوەی ئەنجومەن یا پەرلەماندا.

ئێستا وادەردەکەوێ کە مۆنتسیکیو هاوڕابێت لەگەڵ ئەو رایەدا کە فەزیلەت بەجەوهەری دەزانێ لەریپەبڵیکدا، بەڵام لەیادمان بێت کە ئەو بەتەواوی لەگەڵ تەفسیری ئەرستۆدا یەك ناگرێتەوە دەربارەی ژیانی چاك کەلای ئەرستۆ دەبێت ئامانجی ریپەبڵیك بێت. لای ئەرستۆ شار دەبێت ئەم ئامانجە بکاتە سەرمەشقی خۆی، شارێك کە دەیەوێ کۆمەڵگای هاوڕێکان بێت، هاودەنگو هاوماڵ لەژیانێکی چاکدا[9] مۆنتسیکیو ئەم بۆچوونەی ئەرستۆ دەربارەی فەزیلەت ڕەتدەکاتەوە وە دەتوانین ناوەڕۆکی ئەم ناڕەزایەتییەی مۆنتسیکیو تەفسیری تازەی ئەو بۆ ژیانی چاك بەم شێوەیەی خوارەوە بەیان بکەین:

ئەرستۆ پێی وابوو کە ئامانجی (Republic) ناشێ ئازادی بێت هێندەی کە دەبێت بەکارهێنانی ئازادی بێت بەشێوەیەکی چاك دوای ئەوەی بەپرۆسەی پەروەردەدا تێپەڕ دەبێت. لێرەدا ئازادی بەهیچ شێوەیەك جیاناکرێتەوە لەپەروەردەی لیبراڵ (Liberal Education)، ئازادی دەبێت مل کەچی فەزیلەت بێت. مۆنتسیکیو ئەم ئەو لەویاتە (Priority) هەڵدەگێڕێتەوە.

مەبەستو ئامانجی ریپەبلێك بریتی نییە لەفەزیلەت بەڵکو بریتییە لەئازادی. ئازادی چییە؟ یا لەم رەوتەدا ئازادی چ مانایەك لەخۆدەگرێ؟ لەم رەوتەدا ئازادی دەشێ بەم مانایە بێت:نەژیانو نەچوونە ژێر رکێفی ئیرادەی کەسێکی ترەوە، بەموفارەقەوە، ئەمە هەمان تەفسیری ئەرستۆیە بۆکەسی ئازاد، نەژیان بەپێی خواستی کەسێکی دی ئەو کاتەفەراهەم دەبێت کە تاکە کەس خۆی حوکمی خۆی بکا، لێرەوە ریپەبلێك چاو لەو جۆرە خۆ ـ فەرمانڕەوایەتی کردنە دەبرێ یاخود نزیکترین ئەگەری ئەو جۆرە مامەڵە کردنە لەسەر ئاستی کۆمەڵگا کەواتە ئامانجی ریپەبلێك بریتییە لەبەشداریکردنی هەموو دانیشتوان، هاوڵاتیان لەخود ـ فەرمانڕەوایەتی کردنی سیاسیدا. ژیانی چاك ژیانی کەسێکی کامڵە، ژیانی کەسێکی ئازاد کە دەتوانێ مەشق بە تواناکانی بکا لەبواری خود ـ فەرمانڕەوایەتی کردندا، ئەوکەسەی کە چارەنوسی خۆی وا بەدەستی خۆی[10]. کەسی بەم شێوەیە ئەو کەسەیە کە لەپڕۆژە مەزنەکاندا بەشداری دەکا، "رۆحی ئازادی" کارێك دەکا کە کەسی ئازاد پشت بکاتە هەموو ئەو "کەڵکەڵە کۆیلایەتیانە" ئەو هەموو. پیشەو کارانە"و ئەو هەموو "چێژوو ئارەزووانە" کە رێگرن لەبەردەمیدا، کەرێی لێدەگرن کاتێ لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەسەربەرێتو سەرقاڵی کاروباری مەدەنی بێت.

ئەوکاتەی ئینسانەکان لەژێر سایەی رژێمکدا نەژین کە تێیدا ئازادی خۆیان بەبەشێکی دانەبڕاو لەئازادی ئەوانی دیکە بزانن، ئەوا هەوڵ دەدەن کە سەرکوتی خەڵکی دیو ئەوانی دیکە بکەن تاکو خۆیان سەرکوت نەکرێن. گەر چاکەیەکی هاوبەش نەبێت کە فەرمانڕەوایەتی سیاسی بەجێی بهێڵێ، تەسامی بکا، ئەوا ژیانی سیاسی یا ئەوەتا بەرەو ستەمکاری مل دەنێ، ستەمکاری بەسەر ئەوانی دیکەوە، یاخود سەرگەرمی پاراستنی دەستەجەمعی دەبێت لەستەمکارییەك لەو جۆرە. فەزیلەت بریتییە لەخۆ بەختکردنێکی پێویست لەپێناو بەردەوامی دان بەبوونی کۆمیۆنتی (جڤات)، جڤاتێك کە تێیدا هەمووومان لەفەرمانڕاوایەتیکردنیدا بەشداربین. لێرەوە لای مۆنتسیکیو فەزیلەت ئامانجی ریپەبلێك نییە بەڵکو ئامرازێکە بەرەو ئازادی، یاخود خود ـ فەرمانڕەوایەتی کردن کە خۆی ئامانجەکەیە.

بۆ ئەوەی کە ریپەبڵیك ببێتە جڤاتێکی راستەقینە، جڤاتێ کەهەرهەموو ئەندامەکانی فەرمانڕەوایەتی دەکەن، هیچ بەشێك سەرجەم بەشەکانی دی نەچەوسێنێتەوە، ئەوا دەبێت هەر تاکە کەسە، هەر هاونیشتمانییەك چاکەی خۆی لەگەڵ چاکەی هەمووواندا بگونجێنێ، هەر هاونیشتمانییەك پێویستە ئاوات و ئارەزووی بۆ ئازادی تاکە کەسیانەی خۆی بگۆڕێتە سەر ئاواتخواستن بۆ خود ـ فەرمانڕەوایەتی کردنی هەر هەمووان و دەبێت ئەم گواستنەوەیەش بەسەر هەموو ئاواتەکانی تریدا بچەسپێنێ. هەریەکە لەرێگای ئەم خۆبەختکردنەوە دەبێت سەرگەرمی دانی ئەفزەلیەت بە بەرژەوەندی مەدەنی نەك بەرژەوەندی خودی خۆی بێت، واتە بەرژەوەندییەك کە دەشێت لەلایەن هەمووانەوە بەش بکرێ. تێرکردن و گەیشتن بە بەرژەوەندییەکان لەرێگای سیاسەتی مەدەنییەوە مەیسەر دەبێت کە خۆی لەشێوەی یاسادا دەخاتەروو. لەدروستکردنی یاساو تەنفیزکردنیدا هەر هاوڵاتییەك تا ئەو شوێنە دەبێت وێڵی بەرژەوەندییەکانی خۆی بێت کە ئەو بەرژەوەندیانە بتوانرێ بکرێنە گشتی لەیاسادا یاخود ببنە ئامانجی هەموو هاوڵاتیان. ئەوەی حیسابی بۆ دەکرێ ئەوەنییە کە ئایا میر تاجەکەی بەشێوەی ڕەوا بەدەست هێناوە یا دەستەڵات بەشێوەیەکی چاك مەشق پێدەکا، ئەوەی حیسابی جدی دەبێت بۆ بکردرێ بریتییە لە "شێوەی دستووری گشتی"، وە سروشتی ئەو دەستوورە. بەڕای مۆنتسیکیو ئێمە ناتوانین پشت بەفەزیلەت ببەستین بۆ رێگەگرتن لە بەخراپ بەکارهێنانی دەستەڵات لەلایەن دەستەڵاتدارانەوە، چونکی وەك ئەو دەڵێ "ئەوە ئەزموونێکی ئەبەدییە کە ئەوکەسەی دەستەڵاتی هەبێت ئەگەری خراپ بەکارهێنانی ئەو دەستەڵاتە ئەگەرێکی گەورەیە"(١١) هەر بۆیەشە ئەوکاتەی هەموو دەستەڵاتەکان لەسەر دەستی پیاوێك، تەنیا سەرکردەیەکدا کۆبونەوە، ئەوا حکومەت هەمیشەو لەهەموو حاڵەتەکاندا حکومەتێکی ستەمکارە، و هەموو هاونیشتمانیان دەبنە کۆیلەی ئارەزووەکانی ستەمکار. لێرەوە مۆنتسیکیو دەڵێ "ستەمکاری ئیهانەیەکە بەسروشتی ئینسان"(١٢). تەنیاو تەنیا لەسیستەمێکی سیاسیدا کە دەستەڵاتی دەستەڵاتدار فەحس دەکرێو لێی دەپرسرێتەوەو سنووری بۆ دادەنرێ لەلایەن دام و دەستگاو دەستەڵاتە سەربەخۆکانەوە، تەنیا لەو سیستەمەدایە کە هاونیشتمانیان نابنە رەعیەت و نابنە کۆیلەی ستەمکاری.

## چەمکی ستەمکاری Despotism

بابزانین ئەم چەمکە لەکوێوە دێت و بۆچی مۆنتسیکیو لەجیاتی (Tyranny)، (Despotism) بەکاردەهێنێ؟

ئێمە دەزانین کە مۆنتسیکیو جیاوازیەك دروستدەکات لەنێوان حکومەتی دیسپۆتیك (ستەمکار ـ Legovernment despotique) کەڕەسەنترین شێوەی خۆی لەشێوەی حکومەتەکانی ئاسیادا دەبینێتەوە، چین‌و تورکیاو ئێران، لەگەڵ حکومەتی شاهەنشاهی (Legovernment monarchique) کەمیکانیزمی لێپرسینەوەی تێدایە لەلایەن یا بەهۆی بوونی جەستە یان داموو دەستگا میانجییەکان (نێوانەکان) (intermediary bodies) ئەمەش نمونەی وڵاتە ئەوروپییەکانە لای مۆنتسیکیو.

سەرەتا دەبێت بزانین کە (Despotism)و حکومەتی ستەمکار (دیسپۆتیك) زاراوەیەکی فەلسەفەی سیاسی نەبووە هەتا سەدەی هەژدەهەم، لێرەوە دەڵێین داهێنانێکی نوێیە، لە یۆنانی کۆندا دیسپۆت زیاتر بۆ سەرۆکی خێزان بەکاردەهێنرا، ڕۆمانەکان کە ئێمە دەزانین ئەوان لەزۆر بواردا ئیعتیمادێکی زۆریان لەسەر یۆنان بوو بەڵام ئەم وشە یا زاراوە یۆنانیە یان لە ئەدەبیاتی فیکری‌و سیاسی خۆیاندا بەکارنەهێنا. بۆ نمونە ئەفلاتوون لەدایەلۆگی "سیاسەتمەدار"دا ئەم وشەیە وەك ناو بەکاردەهێنێ (despotes) بۆ ئاماژەکردن بەجێگای سەرۆك خێزان، یاسەرورەری کۆیلەکان، لای ئەرستۆش ئەم وشەیە پەیوەندی بەئیدارەکردنی خێزانەوە هەیەو لەوانە کاروباری کۆیلەکان، ئابووری (Oikonomia) کەمتر پەیوەندی بەکاروباری سیاسی (politikan)ەوە هەیە، چونکی پۆلیتیکا لەمەوقعێکی بالاتردایە.

ووشەی (despotikos)ی یۆنانی ئەوکاتە دێتە ناوەوە کە یەکێك لەشێوەکانی حکومەت دادەڕژێ، ئەوکاتەی کە ئۆلیگارکی، دیموکراسی، یا شاهەنشاهی سەرەولێژ دەبێتەوە، سیستەمێکی سیاسی سەرهەڵدەدا کە زیاتر لەکاروباری خێزان دەچێ‌و لەپەیوەندی نێوان کۆیلەو سەروەر، لێرەدا دەشێ (despotic) بەکاربهێنرێ، بەڵام خودی ئەرستۆ Tyrrannous بەکاردەهێنێ لەجیاتی (despotikos) لەبۆ ئاماژەکردن بەستەمکاری، لەم ڕووەوە خاڵێکی تر کە گرنگە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کەکاتێك ئەرستۆ دێتە سەر باسکردنی خەڵکانی ئاسیاوی‌و "وڵاتە بەربەریەکان" ئەوا زاراوەی (despotikos) بەکاردەهێنێ بۆستەمکاری یۆنانیش (Tyrannous) بەکاردەهێنێ. هۆی ئەمە چییە؟ هۆی ئەمە پەیوەندی بەبۆچوونی یۆنانیەکانەوە هەیە دەربارەی خەڵکی ئاسیا. بەڕای ئەوان ئەو خەڵکە بەدوور لەشارستانیەت یا وەحشییە بەسروشت کاراکتەرێکی کۆیلەییان هەیە زیاتر لەیۆنانیەکان، لەبەرئەوە بێ ناڕەزایی دەربڕین لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی ستەمکاریدا هەڵدەکەن‌و پلەی هەڵکردنیان (تسامح) لەم ڕووەوە بەرزە. هەروەها ئێمە وای دەبینین کەمانای شاراوەی ئەم بەکارهێنانە لای ئەرستۆ ئاماژەکردنە بۆ مەسەلەیەکی دیکەش، ئەویش وڵاتە بەربەریەکان، ئاسیاویەکان، سیستەمی سیاسیان نییە بەڵکو یەك خێزانی گەورەن‌و تەنیایەك

پەیوەندی بەرکەماڵە ئەویش پەیوەندی سەروەرو کۆیلە، ئەمەش مانا ئابوریەکەیەتی، لەوێ ئابوری هەیە بەڵام سیاسەت نییە، سیاسەت گەمەی ئینسانی ئازادە. پلوتارخ پێمان دەڵێ کە ئەرستۆ ئامۆژگاری ئەلکسەندەری مەزنی کردووە کەوەك سەرکردەیەك مامەڵە لەگەڵ یۆنانییەکان بکاو وەك ستەمکاریش (despotes) لەگەڵ بەربەرییەکان کە ئەم لەجەنگدا داگیریان دەکا[١٣] نووسەرە رۆمانیەکان، کەسانی وەك مێژوو نوس تاکیتوس (Tacitus)، لوکانو ئۆگستانسو ئەوانی دی دەشێ هەمان هەڵوێستی ئەرستۆیان هەبووبێت تا ئەوشوێنەی پەیوەندی بەخەڵکی ئاسیاوە هەیە، بەڵام بێ ئەوەی لەخوارەوەی (despotikos) سود وەربگرن، بۆ نمونە لوکان گوتویە کە بەخیلی بەعەرەبو مادەکانو خەڵکی خۆرهەڵات دەبا لەبەرئەوەی زۆر لەمێژە بەستەمکاری حوکم دەکرێن، بەپێچەوانەی رۆمانەکانەوە، کە هیچ شەرمیش ناکەن کە کراون بەکۆیلە. بەکورتیەکەی رۆمانەکان زاراوەی هیلنستی (Tyrannous) یان پاراستو بەکارهێنا[١٤].

لەجیاتی (despotes) بەمانا ئەرستۆییەکەی لەلاتیندا تا سەدەی شانزەهەم زاراوەی (dominus) بەکارهاتووە. هۆبز لەکتێبی "توخمەکانی یاسا، سروشتیو سیاسی"دا یەکەم کەسە کە ناوە رەسەنگەریەکەی (despotic) بەسەر دەکاتەوەو بەومانا یۆنانییە بەکاریدەهێنێ: ئەو دەڵێ: "سەرکەوتوو یا براوە مافی هەبونی دەست بەسەراگرتنی موتڵەقی هەیە بەسەر داگیرکراودا یا دۆڕاودا" چونکی ئەم پەیوەندییە لەپەیوەندی "سەروەر" و "خزمەتکار" دەچێو هاوکێشەیەکە "جەستەیەکی سیاسی بچوك دروست دەکا"[١٥]. دواجاریش لەکتێبە سەرەکیەکەیدا (Leviatnan)، هۆبز مانای (despotic) دەپارێزێ وەك "دەست بەسەراگرتنو زاڵ بوون لەئەنجامی داگیرکردنەوە". ئەو لەچاپتەری بیستهەمدا پێی وایە کە زاڵ بوونی دیسپۆتیك، ستەمکارانە بەرئەنجامی داگیر کردنێکی فعلییەو لەئەنجامی بەکارهێنانی هێزەوە بەدەست هاتووە، بەشێوەیەك ئەوانەی خۆیان لەم حاڵەتەدا دەبیننەوە خۆیان دەکەنە رەعیەتی ئەوکەسەی لێی دەترسن. لای هۆبز ئیدی زاراوەی (despotic) پەیوەندی بەخۆرهەڵاتەوە یان بەربەریەکانەوە نییە بەڵکو حاڵەتێکی سروشتییە، بەو مانایەی لەهەموو شوێنێك دەشێ رووبدات. (دیارە گەربمانەوێت لەبەکارهێنانی هۆبز بۆ ئەم چەمکە بدوێین لەکتێبی لیڤایەثاندا ئەوا وتارێکی تایبەتیمان دەوێ، لێرەدا بەم دوو ئاماژەکردنە کۆتایی پێدەهێنین).

لەگەڵ ئەم بەکارهێنانەشدا تا سەردەمی مۆنتسیکیو زاراوەی (despotique) بەکارهێنانێکی باوی بەخۆوە نەدی وەك دالێك بۆ حکومەتێکی هەرەمەکی، لەجیاتی ئەم زاراوەیە زاراوەی (Tyrannique) مەوقعی خۆی لەفیکری سیاسی سەدەکانی

ناوەڕاستو ڕێنیسانسو سەرەتاکانی مۆدێرنتی پاراست، لەیادیشتمان بێت هەمیشەش زاراوەی (Tyranny)لەسەدەی شازدەوە تا سەردەمی مۆنتسیکیوو دوای ئەویش بۆ وەسفکردنی ئیمپراتۆریەتی تورك بەکارهاتووە لەسەر دەستی مۆنتسیکیودا چەمکی حکومەتی ستەمکار (despotic) وەك ئاماژە بۆکردنێکی بێزەوەرانە بۆ ڕژێمی تورکیو فارسیو چینی خۆی دەچەسپێنێ. ئیدی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە لێرەوە برەو پەیدا دەکات. ئامازدە کردن بەم باکگراوندە پێویست بوو لەبەرچەند هۆیەك: یەکەم: چەمکەکان ژیانی تایبەتی خۆیان هەیەو بەکارهێنان بەماناو دەلالەتی جیاواز جیاواز لەڕەوتە جیاوازەکانو لەبیری بیریارە جیاوازەکاندا، ئێمە نابێت حیساب بۆ ژیاننامەی چەمکەکان نەکەینو هەڕەمەکیانە بەکاریان بهێنینو ئەو مێژووەی لەپشت هەر چەمکێکەوەیە بەسەر یەکدا بشێوێنین. دووەم: دیقەتی ئەکادیمی داوامان لێدەکا کە کاتێك چەمکێك بەکاردەهێنین بەلانی کەمەوە هۆشیاربین لە جینیۆلۆجیای (ڕەگو ریشەی) ئەو چەمکە. سێیەم: بۆ ئێمەی کورد کە ئەگەری ئەوە هەیە فێری نوسین ببینو لەهونەری نوسین بگەین، دەبێت ئاگامان لەو خاڵەبێت کە بەکارهێنانی دروستی چەمك یەکەم هەنگاوی بیرکردنەوەیە، کەواتە دەبێت فێربین بەناسکی لەگەڵ چەمکەکاندا مامەڵەبکەین. با ئیدی بگەڕێینەوە سەر تیۆری ستەمکاری لای مۆنتسیکیو.

وەك ئاماژەمان پێکرد مۆنتسیکیو لە "ڕۆحی یاساکان"دا جیهانی سیاسیو جۆری حکومەتەکان دابەش دەکات بەسەر، ریپەبلێك (دیموکراسیو ئۆرستۆکراسی)، شاهەنساهی (monarchis)و ستەمکاریو هەرجۆرەش لەڕێگای سروشتییەوە پۆلێن دەکا، سروشتیێ کە ئەوە دیاری دەکا کێ فەرمانڕەوایەتی دەکاو چۆن، ئنجا بەپێی پرنسیپی هەر جۆرە، کە ئەو پاڵنەرانە (motivates)ی خەڵکی دەردەخا کە لەژێر سایەی هەریەك لەو جۆرە سیستەمانەدا دەژین. هەروەك ڕژێمی شاهەنشاهی، ستەمکاری لەلایەن یەك کەسەوە کۆنترۆڵ دەکرێ، بەڵام سروشتی ستەمکاری (despotism) بریتییە لەفەرمانڕەوایەتییەك کە یەك کەس هەموو شتێك بەپێی ئیرادەو هەواو ئارەزووی خۆی لێدەخوڕێ. پرنسیپی سەرەکی ئەم حکومەتە، واتە هێزە پاڵنەرەکەی، یاخود وەك مۆنتسیکیو ناوی دەبا "سەرچاوەی ئەم حکومەتە" بریتییە لەتەنیاو تەنیا ترس. ئەو دەڵێ:

**ترس بریتییە لەپرنسیپی حکومەتی ستەمکار**
**مەبەستیش لێی بریتییە لەئارامیو سکون، بەڵام ئەم**
**سکونە ناشێ ناوبنرێ بەئاشتی، نەء، ئەمە تەنها**
**بێدەنگی ئەو شارانەیە کە دوژمن ئامادەیە**
**داگیریان بکا**[١٦]

کەواتە لەکاتێکدا ڕێکخستن‌و سکونێ کەستەمکاری دەیخولقێنێ ڕەنگە بۆکەسێکی دەرەوەی ئەوسیستەمە وەك هارمۆنی‌و بەختەوەری خۆی بنوێنێ لەراستیدا ئەو ڕێکخستنە هیچ نییە جگە لەناکۆکییەکی سەرکوتکراو کە چاوەڕوانی هەلێکە بۆ تەقینەوە، ئەو ڕێکخستنە هیچ نییە جگە لەسەرکوتکردنی هەموو ئازادیەك، سادەترین ئازادی ئینسانەکان، ئەوڕێکخستنە لەوەهمێك زیاتر چیدیکە نییە. دەشێ لەستەمکاری ئاسیاویدا لەرووکاری دەرەوەدا، ڕێکخستن‌و یەکێتیەك ببینین، یەکێتی نێوان خەڵکی بەڵام وەك مۆنتسیکیو بلیمەتانە دەڵێت "گەر ئێمە لەوێ یەکێتییەك ببینین، ئەوە هاونیشتمانییەکان نین کە یەکیان گرتووە، بەڵکو جەستە مردووەکانن کە یەك لەپاڵ ئەوی ترەوە نێژراون"(١٧) هەر یاسایەك کە بوونی هەبێت لەسیستەمی ستەمکاریدا مەبەست لەبوونی تەنها ڕێگە گرتنە لەئاشوب‌و ناڕێکی مەدەنی،و لێرەوە تەنها وەك ئامرازێك کۆمەکی جەندرمە دەکا بۆ سەرکوتکردن، بەڵام لەیادمان بێت کە ئەم سیستەمە کەمتر ناچار دەبێت پەنا بباتە بەر یاسا، لەجیاتی ئەمە داب‌و نەریت کۆمەکی خۆیان بەم سیستەمە دەکەن لەپاراستنی ئەو ڕێکخستنەدا. لەراستیدا ستەمکارییە ئاسیاوییەکان کەمتر پشت بەتشریع (legislation) دەبەستن وەك لەپشت بەستنیان بەداب‌و نەریت کە هەر لەمنداڵییەوە تاکە کەس ڕادەهێنن بەمل کەچ کردن بۆ ئۆتۆرەتی

بەرئەنجامی هەر سیستەمێکی ستەمکاری سەرکەوتوو بریتییە لەکۆیلایەتی هەموان، هەرتابعە (رەعیەت ـ Subject) تەنیا "ملکەچ بوونی پاسیڤانە" دەزانێ‌و هەر تابعە "کوێرانە خۆی داوەتە دەست ئیرادەی موتلەقی دەستەڵاتدارەوە"و بەشی ئینسان لەم یارییە، هەروەك ئاژەڵ بریتییە لەغەریزە، ملکەچ کردن، پەیڕەوی کردن،و سزادان".

بەدترین ڕژێمە ستەمکارییەکان ئەوانەن کە تیایدا ستەمکاری ئیدعای خاوەندارێتی هەموو زەوی‌و موڵکی ئەو مەملەکەتە دەکا، لەم حاڵەتەدا هیچ چالاکییەکی ئابووری ئەوتۆ ڕووناداو خێزانەکانیش تەنیا چاو لەتێرکردنی پێویستیە بایۆلۆژیەکانی ژیان دەبڕن، واتە مەمرەو مەژی، ئەوان نە لەسیاسەتدا دەتوانن، نە لەبواری کۆمەڵایەتیداو نە لەبواری ئابووریشدا دەتوانن ئیرادەیان بخەنەگەڕ.

لەم جۆرە ستەمکاریەدا ئەوەی دەیبینین بریتییە لە وەك یەك بوونی، یەك ڕەنگی هەموو لایەك‌و یەکسانی هەموولایەك لەکلۆڵی‌و بەدبەختیدا، لێرەوە بەهۆی هەژاری‌و کلۆڵی‌و کۆیلایەتیەوەئینسانەکان ناتوانن دەستیان بەهیچ کارێکی گەورەو مانادار بگا، هیچ کارێکی گەورەیان لێ ناوەشێتەوە کە سروشت ئەگەری ئەوەی پێداون تا بەدەستی بهێنن گەر ستەمکاری نەبوایە. ئەم حاڵەتە هیچ نییە جگە لەسەرەولێژ

بونەوەی هەر هەموو بەرەو حاڵەتێکی گەمژەیی و میانمایەیی (mediocrity) خەڵکێك کە لەکلۆڵیدا بژین بێ گومان تەفەسخ دەکەن. بەڕای مۆنتسیکیو، لەژێر سایەی ستەمکاریدا هیچ کەس ئومێدی ئەوەی نییە کەدەستی بەفەخرو پاداشتو خەڵات بگات، چونکە ترس و تۆقاندن هەموو ئومێدێك و خەون بینینێك لەناو دەبا، هەموو کارێك کورت دەکاتەوە بۆ ئارەزووی مانەوە، ئەو دەڵێ:

"ترس رۆحیان غەمۆك دەکا، هەروەها کەمترین مانای تموحیش لەناو دەچێ"[١٨]

ستەمکاری هیچ نییە جگە لە کەئابەیەکی ئەبەدی کە باڵی بەسەر ئەم کۆمەڵگایانەدا کێشاوە، لەم سیستەمەدا نەك کەئابە قبوڵ دەکرێ، نەك هەژاری ئاسایی دەکرێتەوە بەڵکو کەئابەو هەژاری و کلۆڵیش دەڕازێنرێنەوە. هەردوو ستەمکارو رەعیەتیش لەناو گێژاوی جەهلدا سەمادەکەن. مل کەچی زیادەڕۆیی بەندە لەسەر جەهلی ئەوکەسەی کە مل کەچە، هەمان شت بۆ ئەو کەسەش کەفەرمانڕەوایەتی دەکا دروستەو بەسەریدا دەچەسپێ، چونکی بۆنەیەکی نییە تا بڕیاربدا، گومان بکا، عەقڵی بەکاربهێنێ. لەسەرەتاوە ستەمکارەکان پشت بە بەکارهێنانی هێزو زۆرو توندو تیژی دەبەستن بۆ دامەزراندنی ستەمکاری، بەڵام کاتێك کە ستەمکاری رەوتی خۆی وەردەگرێ، ستەمکار بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ ئەوانە بەجێ دەهێڵێ کە بەناوی ئەوەوە حوکم دەکەن، ئەوکاتەی ستەمکار کەسانێکی هەڵبژارد کە کاروباری بەناو دەوڵەت بەڕێوەبەرن ئیدی لەنێو سەراکانیاندا سەرگەرمی غەریزە دڕندەکانیان دەبن و سەرقاڵی ئارەزووە هەرگیز تێر نەبووەکانیان، ئەوەتا خەساوێك (eunuch) لە "نامە فارسییەکان"دا بەسەرسوڕمانەوە دەڵێ "خودای گەورە، دەبێت لەمە زیاتر چی بکردرێت تایەك پیاو بەختەوەر بکرێت". لێرەدا ئێمە تەونێکمان هەیە، تەونی کۆیلایەتی کە هەر هەموو تێیدا سەرگەردانن، لەستەمکارەوە بۆ رەعیەت، ستەمکاریش کۆیلەیە چونکی بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی و گەیشتن بەچێژ دەبێت بە ناچاری پشت بەکەسانی دی ببەستێت: هەرەمەکە بەم شێوەیەی لێ دێ، لەسەری سەرەوە چێژە بەدەنیەکان و لەخواریشەوە یەك بەرگی (uniformity)و کلۆڵی و کۆیلایەتی.

لەسیستەمی ریپەبلێکدا دەتوانین سێ دەسەڵات دەست نیشان بکەین، قەزائی (Judicial)و تەشریعی (legislative)و تەنفیزی (executive)، لە سیستەمی ستەمکاریدا هەرسێ دەستەڵاتەکە لەشەخسی ستەمکاردا کۆدەبنەوە. ئەمەش رەچەتەیەکە بۆ بەکارهێنانی هەرەمەکیانەی دەستەڵات. مۆنتسیکیو دەڵێ "لەتورکیا، لەو شوێنەی کە هەرسێ دەستەڵاتەکە لەشەخسی سوڵتاندا کۆبوونەتەوە، رەعیەت لەبەدترین خەفەقاندا ژیان بەسەر دەبەن" چونکی دان و

وەرگرتن (take and give) لەنێوان خەڵکیدا یا دامو دەستگاکاندا بوونی نییەو دەستەڵات بەش ناکرێ، سیاسەت لەسیستەمێکی ئاوادا کورت دەکرێتەوە بۆ فێڵو تەڵەکەی دادگا، درکاندنی نهێنی بەچرپە،و غەیبەتی ناو سەرا، یەك حوکم هەیە ئەویش حوکمی سوڵتان یا پاشا. لەسیستەمی ڕیپەبلێکدا (چ دیموکراسیو چ ئۆرۆستۆکراسی) کۆمەڵێك دامو دەستگا هەن کە وەکو جەستەی وەسیت، میانجی (intermediate) وەزیفە دەبینن، لە نێوان فەرمانڕەوایانو فەرمان بەسەرا دراوەکاندا، لێرەوە دەستەڵات کەناڵی خۆی وەردەگرێو بەم شێوەیە دەستەڵات ڕێلیێدەگیرێ بێتە دەستەڵاتێکی هەڕەمەکی، گەمەیەك بەپێی ئارەزوو زەوقی دەستەڵاتدار، بەڵکو ئەو دامو دەستگایانە وەزیفەیان ئەوەیە کە فەحسو محاسەبەو هاوسەنگی دروست بکەن. ستەمکاری بێگومان لەناوبردنی ئەم دامو دەستگایانەیە، یاخود واقعی تر ئەوەیە بڵێین ڕێگەنەدانە بەسەر هەڵدانی ئەو دامو دەستگایانە. لەم وێنەیەدا ستەمکارێکمان هەیەو رەعیەت، ئەوانەش کەپێیان دەگوترێت پیاوانی دەوڵەت، والیو پاشاو موختارو..هتد، هیچ نین جگە لەئامێرێك بەدەستی ستەمکارەوە بۆ چەسپاندنی دەستەڵاتو فەرمانی سوڵتان.

مۆنتسیکیو لەنێو دامو دەستگا میانجەییەکاندا گرنگی زیاتر بەسیستەمی قەزائی دەدات، چونکی ئەم دامو دەستگایە ئازادی تاکە کەس دەپارێزێ. لەکاتێکدا لەستەمکاری تورکیدا یاسا هیچ نییە جگە لەئیرادەی سوڵتانو فایلەکانی دادگاش "بەخێرایی بڕیاریان لەسەر دەدرێ". لەژێر سایەی شاهەنشاهی دەستوریدا زەحمەتو گرانیو هەندێ جار دواخستنی مەسەلەیەكو درێژ خایاندنی پرۆسەی حوکمدان ئەو بەهایانەن کە خەڵکی دەیدەن بۆ پاراستنی ئازادیان. بە رای مۆنتسیکیو گەر خاڵێك یا خاسیەتێك هەبێت سەرەکی بۆ جیاکردنەوەی ستەمکاری ئەوا ئەو خاسیەتە، حەتمەن ئەو خاڵەیە کە لەستەمکاریدا بەدیدەکرێ ئەویش لەناوبردنی یان هەر نەبوونی ( Judiciary ــ سیستەمی قەزائی) وەك جەستەیەکی میانجی لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمان بەسەردراودا تا دەستەڵاتداران لەخراپ بەکارهێنانی دەستەڵات بپارێزێ، بەڵام لەستەمکاریدا ئێمە ڕووبەڕوی دەستەڵاتێکین کە هیچ نییە جگە لەهەڕەمەکیو بەدوور لەهەر پرنسیپێك جگە لەئارەزوو زەوقو ئیرادەی سوڵتان. کێشەکە تەنیا لێرەدا نییە بەڵکو مادامێك ئەو دامو دەستگا یا جەستە میانجیانە نین بۆ فەرمانڕەوایەتی کردن، تەنیا پرنسیپێ کە پێویستە بۆ پاراستنی دەستەڵاتی ستەمکار بریتییە لەتۆقاندن. ستەمکاری پێویستی بە ترسو تۆقاندن هەیە بۆ حوکم کردن. لێرەوە ترس ئەو پرنسیپەیە کە لێوەی ستەمکاری دەناسرێتەوە. بۆ ئەوەی خەڵکی چۆکدابەن ستەمکاری پەنادەباتە بەر تۆقاندن،

بەکارهێنانی توندوتیژی، وەحشیەت، ئەشکەنجە. بۆ ئەم مەبەستە ستەمکاری پێویستی بەهێزی سەربازی هەیە بۆ فەراهەم کردنی ئەو ئاوو هەواو کەشە کەپڕیەتی لەترساندنی رەعیەت، ئەو سەربازە دڵسۆزو بەوەفایانە پێویستن کە لەهەموو چرکەیەکداو لەهەر بۆنەیەکدا فەرمانەکانی سوڵتان جێبەجێدەکەن بۆ دامرکاندنەوەی هەر ناڕەزاییەك. ئیشی سەرەکی ئەم ئۆردوە سەربازییە چاندنی ترسە لەناو رەعیەتدا، ئەمەش تەنیا مەرج نییە بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش و ئاشوب بەڵکو لەحاڵەتی ئارامی و نەبوونی هیچ گێروگرفتێکیشدا پێویستە کە رەعیەت ناو بەناو ئەم ترسەیان تێدا زیندوو بکرێتەوەو بهێنرێتەوە یادیان کە ئەوان هیچ نین جگە لەموممتەلەکاتی سوڵتان یا ئیمپراتۆر. هەروەها بڵاوکردنەوەی ترس ئامانجێکی تریشی هەیە، ئەویش لەناوبردنی ئیعتیماد لەنێو خەڵکیدا، واتە ئیعتیمادکردن بەیەکتر، بوونی ئیعتیماد واتە بوونی هاوڕێیەتی، بوونی هاوڕێیەتیش واتە هەبوونی سیاسەت بەمانا ئەرستۆییەکەی. لای مۆنتسیکیو هاوڕێیەتی فەزیڵەیەکی سیاسییەو خاسیەتی ریپەبلیکەو تەنیا لەژێر سایەی ئەو سیستەمەدایە کە هاوڕێیەتی راستەقینەبوونی هەیە. ئەرستۆ پێی وابوو کە ستەمکاری جیهانێك دروستدەکات بێ هاوڕێیەتی ، ئەو رای وابوو کە ئەو کەسەی ژیانی بەتەنیا بەسەر دەبا کەسێکی بەدبەخت و نا بەختیارە، ئەو لە بێدەنگی و لەگۆشەگیریدا دەژی، ئەو کەسەش کە فەرمان دەردەکاو ناتوانێ قسەبکاو گوێڕایەڵی کوێرانە دەخوازێ، ئەمەش بەدبەختە، ئەم کەسەش کەسی ستەمکارە. بەهەمان شێوە مۆنتسیکیو لەمەسەلەکە دەڕوانێ. ئەوەتا لە "نامە فارسسیەکان"داو لەنامەی نۆهەمدا دەخوێنینەوە: "من تەنیا خۆمم هەیە وەك هاوڕێی نزیك .. من بەدەگمەن ئەوشتەی کە پێی دەڵێن هاوڕێیەتی زانیومە چییە.. من تەنیا لەخۆمەوە پێچراوم".

هاوڕێیەتی، بەمانا یۆنانی و رۆمانییەکەی، وەك فەزیڵەیەکی سیاسی مەترسیەکی سیاسی بۆ ستەمکاری دروست دەکات. هەر لە "نامە فارسسییەکان"داو لەنامەی (٣٤)دا مۆنتسیکیو دەڵێ:

> **مەسەلەکە لەتورکیا زۆر خراپترە، لەوێ ئەو خێزانانە لەباوکەوە بۆ کوڕ، هیچ کەسێ پێ نەکەنیوە هەر لەسەردەمی دامەزراندنی سەڵتەنەوە.. هاوڕێیەتی، ئەو بەیەك گەیشتنە شیرینەی دڵەکان، کە کارێك دەکا ژیان لێرە پڕبێت لەخۆشی، تا رادەیەك دەتوانین بڵێین بوونی نییە.. ئەوان پاشەکشە دەکەن بۆناو ماڵەکانیان بەواتایەك هەر خێزانە لەگۆشەگیریدا دەیباتە سەر.**

لەسەرای فارسیشدا دەبینین کە ژنان لێك دابڕاون، ژنان لێرەدا سومبولی کۆیلەکانو رەعیەتەکانی ستەمکارین. لەنامەی (١٥٦)دا دەخوێنینەوە (نامەیەکە رۆخانە بۆ ئۆزبەکی دەنێرێ کە لەپاریسە)

**ئەو هەریەکێ لەئێمە لەئوتاقەکانی خۆیدا قەتیس دەکا، هەرچەندە ئێمە لەئوتاقەکانیشماندا تەنیاین کەچی ناچارمان دەکا حیجاب لەسەر بکەین. ئیدی ئێمە مۆڵەتی ئەوەمان پێ نادرێ قسە لەگەڵ یەکتر بکەین، بەتاوان لەقەڵەم دەدرێ کە بنوسین (نامە بنوسین) تاکە ئازادییەك کە هەمانە بریتییە لەگریان.**

گۆشەگیر کردن، چ فیزیکیو چ سایکۆلۆژی، بەردی بناغەی ستەمکارییە، چونکە دەبێتە مایەی رێگەگرتن لەئالۆ گۆڕکردنی بیروڕا، دەبێتە مایەی گفتوگۆ نەکردن لەسەرکێشە سیاسیو حەیاتیەکانو کە گفتوگۆش نەبوو، نەك بەتەنها ئومێدێك بۆ گۆڕانی سیاسی نابێت بەڵکو خودی سیاسەت بوونی نییە لەدەرەوەی گفتوگۆ. لێرەوە ستەمکاری دەبێتە خوویەك کە رەعیەت یا بەناچاری یا بەخواست قبوڵی دەکەن. ئەمەش تەنها بەرئەنجامی خراپی نییە لەرووی سیاسییەوە بارودۆخێك دروست دەکا کەتیایدا کەس باوەڕی بەکەسی دیکە نییە، کەس هاوڕێی کەس نییە، هاوڕێیەتی زادەی مرۆڤە ئازادەکانە، ستەمکاریش سیستەمێکە کەسی ئازادی تێدا پەروەردە نابێتو ئەو ئینسانە پەروەردە دەبێت کە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە دەبێت هەمیشە درۆبکا، فێڵ بکا، بوختان بکا لەسەر هەموو ئاستەکانی، هەمیشەش ترسی ئەوەی هەبێ کە کەسێك لەوێ چاودێری دەکا، ئەوەتا ئۆزبەك بۆ هاوڕێکەی دەنوسێ: "ئێمە هەمیشە بەدرۆ غەمباری خۆمان نیشان دەدەین، شادی نیشاندانیشمان ساختەچیانەیە".

ئەمە ئەو راستییە نیشان دەدات کە ئینسانی ئازاد لەژێر سایەی ستەمکاریدا نەك بوونی نییە بەڵکو ئەوسیستەمە تەنیا ئینسانێك پەروەردە دەکا کە هیچ نییە جگە لەئەکتەرێك، شەکەرۆکەیەك، کە تەنیا دەور دەبینێتو ماسك دەپۆشێ بەپێی پێویستی سەعاتو رۆژ.

ئایا لەم دنیا پڕ درۆیەی کە ستەمکار دەیخولقێنێ ئایین رۆڵی چییە؟

گەر ئایین وەکو پەیوەندییەکی زیندوی رۆحانی ئازادانەی نێوان خوداو ئینسانی ئازاد سەیربکەین، پەیوەندییەك کە هەمیشە خۆی زیندوو دەکاتەوەو لەسەر بناغەی دۆگما نییە، لەم حاڵەتەدا دەتوانین بڵێین کە ستەمکار رەنگە نەتوانێ دزەبکاتە ناو

ئەم پەیوەندییەوە. بەڵام ئەم جۆرە سەیرکردنە یان ئەم ڕەهەندە ڕۆحانیەی ئایینو ئەم جۆرە پەیوەندییە کارێکی سانا نییەو بگرە دەگمەنە، تەنیا ژمارەیەك عارفو ڕۆحانی گەورە دەتوانن بەو ئاستەبگەن. کەواتە دەبێت لەئایین بەمانایەکی دیکە قسەبکەین ئەویش ئایین وەکو داموو دەستگا، یا وەکو خووو عاداتو عورفو تەقالید ئەمەش مەسەلەکە تەواو پێچەوانە دەکاتەوە.

مۆنتسیکیو لە "ڕۆحی یاساکان"دا مەدحی مەسیحیەت دەکاو فەزڵی مەسیحیەت دەدا بەسەر ئیسلامدا لەبەرئەوەی لای ئەو مەسیحیەت لەبار نییە بۆ ستەمکاری هێندەی کە ئیسلام لەبارە. مەسیحیەت کارێك دەکا کە دەستەڵاتی موتڵەق موعتەدیل بێ، ئەمەش بەهۆی "نەرمو نیانی" عەقیدەی مەسیحیەتەوە ، کە بەپێچەوانەی عەقیدەی ئیسلامەوە کە توندو ڕەقو پڕە لەداواکاری. مەسیحیەت ئەوستاندارانە دەخولقێنێ کە لەڕێوەی ئیماندارەکان دەتوانن مەسەلە سیاسییەکان هەڵبسەنگێنن. دواجار مۆنتسیکیو مەدحی ئاییني پەیگان (وثنی)دەکا بەهۆی "یاسا ئەخلاقییەکانیەوە"، ئەو پێی وایە کە "ئایینو قانونی مەدەنی" لەڕووی مەبدەئیەوە دەبێت چاو لەیەك شت ببڕن ئەویش کردنی ئینسانە بەهاونیشتمانی چاك لەکۆمەڵگایەکی ئازاددا. لێرەوە موقەدەسترین دۆگما دەشێ بەرئەنجامی خراپی هەبێت گەر نەبەسترێتەوە بەمەبدەئە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای ئازادەوە. گەر ئایین تەنیا بووە ترسو پەیڕەوکردنێکی کوێرانەی بەدوور لەئیرادە، ئەوا ئەو کاتە دەچێتە خزمەتی ستەمکارییەوەو دەبێتە دارودەستی ستەمکار. گەر لەجیاتی ئومێدو هاوڕێیەتی ئایین زیاتر سەرقاڵی تۆقاندن بێت، ئەم تۆقاندنە دەچێتە سەر تۆقاندنە سیاسییەکەو ئیدی ئایین دەبێتە بەشێك لەستەمکاری. بەڕای مۆنتسیکیو ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە لەوڵاتە ئیسلامییەکاندا بوونی هەیە، ئەو دەڵێ:

"لەوڵاتە موحەمەدیەکاندا، بەشێوەکی جزئی لەئاینەکەیانەوەیە کە خەڵکی ئەو تەبجیلو تەعزیم کردنە وەردەگرن کە هایەنە بۆ میرەکەیان"

(دەبێت لەیادمان بێت کە ئەم دیدەی مۆنتسیکیو شوێنی ئیشکالیەتێکی گەورەیەو مۆنتسیکیو هەرچی پەیوەندی بە فیکرو فەلسەفەو سیۆلۆجیای ئیسلامیەوەهەبێت، ئەو کەسە نییە کە بەحسی کردبێو شارەزای ئیسلام بێ، بەڵکو سەرچاوەکانی ئەو، هەروەك بیریارەکانی دی ئەورووپی تا سەدەی نۆزدە، ئەو ڕاپۆرتانەن کە گەشتیارەکان لەخۆرهەڵاتەوە دەیانناردنەوە بۆ ئەورووپاو ئەو ڕاپۆرتانەش لەدیدی بەحسی زانستی ئەمڕۆکەوە هیچ بەهایەکیان نییە. هەروەها دەبێت لەیادمان بێت کە مۆنتسیکیو باس لەڕەهەندی شەعبی ئیسلام دەکات نەك میراتی فیکری ئەو ئایینو شارستانیەتە).

مۆنتسیکیو پێی وایە کە لەتورکیاوە تاچین، ئایینەکان ئەو کۆدە یاساییانە لەخەڵکیدا دەچێنن ئەو ئەخلاقی سەر شۆڕکردن‌و تەسلیم بوونە پەروەردە دەکەن کە کۆمەکی ستەمکارەکان دەکا. مەبدەئێك کە لەم گەمەی دەستەڵاتەدا سەری لێدەشێوێ‌و گلۆردەبێتەوەو لەمانا ڕۆحانییەکەی خۆی هێدی هێدی دوور دەکەوێتەوەو دەبێە هۆکاری بەهێزکردنی ستەمکاری، ئایدیای پەرستنە، عیبادەتە - پەرستن لەپەیوەندییەکی ئازادانەی ئینسان لەگەڵ خودا دەبێتە مایەی زیاتر ئازاد بوون‌و گەشەکردنی بەهرە ناوخۆییەکان، توانای عەقڵ‌و توانای داهێنان، توانای تەجاوزکردنی ئەم واقیعە، بەڵام کەپەرستن دەبێتە خوو، بێ گومان دەبێتە کۆڵەکەیەك کە سیستەمی سیاسی سوودی لێوەردەگرێ ئەمەش بەئاشکرا لەسیستەمی ستەمکاریدا دەبینرێتەوە. ستەمکاری لەمنداڵییەوە ئینسان فێری خووی کۆیلایەتی دەکا، فێری خووی پەرستنی دەستەڵات، بەپلەیەك کە ئینسانێ دروست دەبێ کە لەنێوان پەرستنی خودا وەکو پەروەردگاری بوونەوەرەکان‌و ستەمکار وەك ئایکۆنی سیاسی جیاوازی بۆ ناکرێ.

یەکێك لەژنەکانی ئۆزبەك بۆ ئۆزبەك دەنووسێ کەکچەکەی دەخاتە سەراوە لەتەمەنی حەوت ساڵیدا، "هەرچی زووتر کەسی گەنج لەئازادی منداڵی دابڕێ درەنگە" ئنجا رەخنە لەو دایکانە دەگرێ کە دەوەستن تا کچەکانیان بەتەمەنی شووکردن دەگەن ئەوسا بۆ سەرا ڕەوانەیان دەکەن، ئەم تەمەنەش زۆر درەنگە کە فێری مل کەچی‌و گوێڕایەڵی ببن.

"ئایا دەبێت ئێمە بۆ هەمووشتێك چاو لەبەهێزی عەقڵ ببڕین ، چاوەڕێی هیچ نەبین لەکاریگەریە ئاسانەکەی خوو عادەت". [١٩]

ستەمکاری خێزان، ئایین دەخاتە گەڕ بۆ چاندنی خووی تەسلیم بون، خووی خۆش ویستنی ئەمیر، بەمانایەك چ خێزان‌و چ ئایینیش لەڕۆڵە سروشتییەکەی خۆیان دوور دەکەونەوەو دەبنە دوو داوو دەستگا بۆ پەروەردەکردنی ئینسانێ کە خۆش ویستن‌و پەرستن لای دەبنە خوو، نەك ئەرك. خۆش ویستن‌و پەرستن دەبنە دوو میکانیزم بۆ لەناوبردنی هەر ریشەیەك گەر بوونی هەبێ، ریشەی کەسێکی سەربەخۆ، گەر کەسی سەربەخۆ نەبوو هەمووشت لای دەبێتە خوو، چێژ، گوێڕایەڵی، عەشق، پەرستن، بەشداریکردنی سرووت (طقوس) کارکردن،.. هتد، ئنجا لەپاڵ کردنی ئەمانەدا بەخوو، گۆشەگیر کردنی خەڵکی لەیەکترو کوشتنی ڕۆحی هاوڕێیەتی‌و وەلەبنەڕەتیشدا نەبوونی شار بەمانا ئەرستۆییەکەی کە هەرهەموو ڕەچەتەن بۆ ستەمکارییەك کە نەمری بەدەست دەهێنێ.

لـه "نامـه فارسـيەكان"دا مۆنتسـيكيو وێنـەی سـەرامان بـۆ دەكێشـێ وەك كۆمەڵگايەكی داخراو كە تەنيا وەزيفەی ئەو كۆمەڵگايە تـەعزيم كردنـی يـەك پيـاوە، واتە سوڵتان، شا، يا والی، ئـەو شوێنەيە كـە تێيـدا هـەموو پياوەكـان خەسـێنراون، لـەپياوەتی كـەوتوون‌و كـوورت كراونەتـەوە بـۆ ئـەو بونەوەرانـەی كـە لەسـەر ئـەژنۆ بەچۆكدا هاتوون بۆ وەرگرتنی سەدەقەيەك، مەكرەمەيەك. پيـاو چاكـەكان‌و خـاوەن كەرامەت، بەهۆی ترس‌و توندوتيژی‌و هەڕەشەی ئەشـكەنجەوە تۆقێنراون. ژنـانيش شوێنی تاسـەن، بابـەتی عەشـق، بـەڵام لـەيادكراوو نەناسـراو. ژنـان دەتوانـن تـەنيا قوربانی بدەن بۆ يەك پياو كە هەقی ژيان‌و مەرگی بەدەستە. كرداری سێكسيش لای ژنان واتە بەخشينی چێژ بەكەسێ كە شايەنی خۆش ويستن نييە.

ئەو پەيوەندييـە سێكسييە قەسـابخانە ئاسـايەی نـاو سـەرا بـەردی بناغـەی حكومەتێكی ستەمكارە، لەئاسـيادا كۆيلايـەتی ناومـاڵ‌و سـتەمكاری حكومـەت يـەك دەستيان لەناودەستی يەكتردايە، حكومەتی ستەمكار رێدەگرێ لەبەهرەو تواناكـانی تاكەكانی كۆمەڵ، لەپياوە ناوازەكان كـە خـەو بـەكاری گـەورەوە دەبينـن، هـەروەك چۆن دەستەڵاتی پيـاوان رێدەگرێ لەبـەرهرەو توانـاو داهێنـانی ئافرەتـان. لێرەوە بەناچاری وەك لە "رۆحی ياساكان"دا دەيخوێنينەوە، "ستەمكاری ئيمپراتۆريەتێكـە لەسەر ئافرەتانەوە بيناكراوە". خێزان‌و پەيوەندييـە خـێزانی‌و كەسييەكان بنـەمای سياسەت پێك دەهێنن، ئەی لەم هاوكێشەيەدا چۆن دەسـتەڵات مەشقی پێدەكـرێ؟ لە "نامە فارسييەكان"دا مۆنتسيكيو ئاماژدە بۆ نوێنەرانی چەند چين‌و توێژو پيشـە (حرفـە)دەكـات، مـەلاكان، مـيرزا، لـەموقابيلی مامۆسـتاكانی زانكۆكـانی ئـەوروپا، دەروێشـەكان لەبەرانبـەر قەشـەكانی ئـەوروپا، پادشـاكانی خۆرهـەڵات بەرانبـەر نـەجيبزادەكانی ئـەوروپا، بـەڵام ئـەی ئـەو مەخلوقـە كێيـە كـە نـاوی نـاوە خەسـاو (eunuch)؟ بەباوەڕی من مەبەسـتی مۆنتسـيكيو لـەم كەسايەتييە دووشـتە، يەكـەم وەك دەلالەت كردن بۆ وەزيرو كاربەدەستانی سوڵتان، دووەم: جەوهەری سيستەمی ستەمكاری خۆرهەڵات. خەساوەكان ئەو پياوانەن كە خۆيان لەخۆياندا دەسـتەڵاتيان نييـە، بـەڵام مەشـق بەدەستەڵاتدەكەن بـەناوی ئاغاكانيانـەوە. وەك وەزيرەكـان، لەخێزانی كەم دەرامەت ياناچيزەوە دێـن، بـەڵام دواجـار سـامان بەدەسـت دەهێنـن لەڕێگای مل كەچ بوونيانەوە بۆ ئيرادەی سوڵتان. لـەزۆر شـوێنی نامـەكاندا هەسـت بەئيحباتی سێكسی خەسێنراوەكان دەكـەين، وەك ئـەوەی كـە مۆنتسـيكيو بيـەوێت پـەيوەندی نێـوان وەزيرەكـان‌و دۆسـتەكانيان وەك پەيوەندييـەكی بـێ عەشـق‌و ساردوسڕ وێنابكا، وەك ئەوەی بيەوێت بڵێت ئافرەتان روو لەم كەسايەتيانە دەكـەن

نەك لەبەر کەسایەتیو جوامێریان بەڵکو بەهۆی ئەو دەستەڵاتە سیاسییەوە کە هەیانە، لەبنەڕەتەوە ئافرەتان دەزانن کە ئەمانە لەرووی سێکسییەوە چالاك نین.

خەسێنراوەکان بەمانای ووشە پیاونین تەنیا چێژێك کە بەدەستی دەهێنن بریتییە لە سەرپەرشتی کردنی ژنانی حەرەم یا سەراو بردنیان بۆلای سوڵتان یامیر. کەواتە خەساوەکان کە سومبولی وەزیرو کاربەدەستەکانن، لەرووی سیاسییەوە مەوقعیان وا لەنێوان فەرمانڕەواو رەعیەتدا. لەیادمان بێت کە مۆنتسیکیو سەرجەم کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی بەیەك سەرای گەورە لە قەڵەم دەدا. گەر لەسیستەمی ریپەبلیکدا داموو دەستگای وەسیەت هەبن لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمانبەسەردراوەکاندا، ئەوا لەسەرای خۆرهەڵاتدا ئەم بوونەوەرە سەقەتە، داغان کراوە وا لەنێوان ئەو دوو بەرەیەداو ئەویش مانایەکی سیاسی قووڵی هەیە لەسیستەمی ستەمکاریدا "خەساوەکان" میتافۆرێکن بۆ روونکردنەوەی داینامیكو کاریگەری ستەمکاری، کاری خەساوەکان سەپاندنی بێدەنگییەکی یەك ڕەنگییە بەسەر سەرادا، بەسەر کۆمەڵگادا.

کۆمەڵگایەك کە تێیدا فەرمانڕەوا دیار نەبێت، داموو دەستگای میانجی لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمانبەسەردراودا بوونی نەبێت، میکانیزمێ نەبێت بۆ فەحسکردنو لێپرسینەوەی دەستەڵات، ئەو کۆمەڵگایە دیارە ناتوانێ جێگیر بێتو لێرەشەوە دەبینین مۆنتسیکیو لەرێگای نامەکانەوە وێنەیەکی کۆمەڵگا ئاسیاویەکانمان دەداتێ کە پڕیەتی لەئاشوبو تیرۆرکردنو توندوتیژی لەنێو سەرادا، لەنێوان خەساوەکاندا. مەبەستی سەرەکی مۆنتسیکیوش وەك ئامارەم پێکرد باسکردنی ستەمکاری خۆرهەڵاتی نییە بەڵکو لێدانی زەنگی مەترسییە بۆ هاولاتیانی فەرەنسیو ئەورووپیەکان کە گەر بێتو هۆشیار نەبن ئەوا مۆرنارکی، شاهەنشاهی فەرەنسیو ئەورووپی بەو چارەنوسە دەردناکە دەگا کە لەخۆرهەڵات هەیە، ئەو ئەگەرە تەنیا لەڕێگای فەحسکردنی بەردەوامی دەستەڵاتەوە لەناو دەچێ. گەر هۆشیار نەبنو هەمیشە دەستەڵات فەحس نەکەن ئەوا وڵات دەبێتە یەك سەرای گەورە کە تێیدا وەکو سەرای خۆرهەڵاتی "هەموو دەبنە یەك، هەموو دەبنە کۆیلە".

لەنامەی بیستو یەکەمدا کە ئۆزبەك بۆ یەکەم خەساوی سپی دەنێرێت، دەخوێنینەوە:

**ئێوە هیچ نین جگە لەئامڕاز، ئامرازێ کە دەیشکێنم**
**هەرکاتێ دڵم بخوازێ، ئێوە هەن تەنیا تا ئەوکاتەی کە**
**گوێڕایەڵن و لەجیهاندا هەن تا لەژێر یاساکانی مندا**
**بژین، یاخود بمرن کە هەرکات من فەرمانمدا. ئێوە**
**هەناسە دەدەن تا ئەوکاتەی بەختیاری من، عەشقی**

**من، بگره بەخیلی من داوا لە نەفسە حەقیرەکەی ئێوەدەکا، ئێوە هیچ چارەنوسێکتان نییە جگە لە چۆك دادان، رۆحی ئێوە تەنیا دەبێت ئیرادەی من بێت، ئومێدی ئێوە دەبێت ئەوەبێت کە من بەختیاربم.**

ئەوەی شوێنی مەترسییە، بەڕای ئێمـە، ئـەو وێنەیـە کـە هـەندێ جارو لەهـەندێ لەنامەکاندا مۆنتسیکیو دەیخاتە بەردەممان ئەویش وێنەیەکی سەرا کەتێیدا کەسانی ناوسەرا لەززەت لەکۆیلایەتی دەبینـن لەهـەندێ نامـەدا سـەرا وێنـادەکرێ نـەك وەك شوێنێکی ترسناك بەڵکو وەك شـوێنێك کـە پـڕە لـە میری تەمبـەڵو شـەهوانی، کـە تەمبەڵیو بێ باکیان کارێك دەکا کە سەرای خۆرهەڵاتی بێتە شوێنێکی زۆر خۆش بۆ ئەوانەی کە خودی سەرا بۆ ئەوە دروستکراوە کە سەرکوتیان بکـا. بەمانایـەکیی دی قوربانیانی سەرا لەززەت لەو کۆیلایەتیە دەبینن.

ژنێکی ئۆزبەك بۆ ئۆزبەك دەنووسـێ "ئۆزبـەك مـن ئیعـتراف دەکـەم کـە عاتیفـەو حەماس نەك تموح کارێکی کردوە کە من بمـەوێ لـەززەت بـەتۆبدەم" دانەیـەکی دی دەڵێ، ئەو (ئەو ژنە) "کۆیلەیە بەهۆی توندوتیژی عەشقەوە".

سەرا تـەمبەڵخانەیەکی گەورەیەو هەمیشەش تەمبەڵی لەززەتێکی تایبـەتی خۆیـی هەیە، بەناچاری ئەویش لەنەبوونی ئینسانی ئازادەوە سەرچاوەدەگرێ. ئازادی واتـە نەژیان لەژێر سایەی ئیرادەی کەسێکی دیدا، واتە پشت بەخۆ بەسـتنو کـارکردن بـۆ خۆ، لەیادمان بێت کە ستەمکاری چالاکی ئابوری بەسنورێکی زۆر نـزم دەگەیـەنێت، لەرووی سیاسیشەوە رێگا نادا کـە بـوار بـۆ تەقینـەوەی بـەهرەو تواناکـانی ئینسـان بڕەخسێ، ئیدی ئەمە دەبێتە مایـەی ئـەوەی کـە ئینسـانەکان کۆیلـە ئاسـا لـەززەت لەتەمبەڵی ببینن‌و بەو بارودۆخە سکوونە کە لەبێدەنگی مردوەکان دەچێ رازی بن.

وێنەکێشـانی سـەراو ستەمکاری وەك حاڵـەتێکی چێـژ بـەخش کـە لـە "نامـە فارسییەکان"دا رووبەڕوی دەبینەوە جیاوازە لەو وێنەیەی کە لە "رۆحی یاساکان"دا دەیبینینەوە لە مەڕ ستەمکارییەوە.

لـە "رۆحـی یاسـاکان"دا، دوای چـەند لاپـەڕەیـەك کـە دەنوسـێ تـرس پرنسـیپی ستەمکارییە، مۆنتسیکیو ئامـاژدە بـۆ پرنسـیپێکی تردەکات ئـەویش ئەوەیـە کـە ستەمکاری ئەو حەزە لەڕەعیـەتدا دەچێنـێ کـە سـەرقاڵی کۆکردنـەوەی سـامان بـن چونکی لەم حاڵەتەدا بیر لـەبواری مـەدەنی، کاروبـاری گشـتیو سیاسـی نەکەنـەوە، گۆشەگیرکردنی خەڵکییە لەم رێگایـەوە. سـەرقاڵ بـوون بـەژیانی تایبەتییـەوە ئنجـا

ترسیش لەئەشکەنجە دەبێتە مایەی ئەوەی کـە خـەڵکی سیاسـەت بـەجێ بهێڵن بۆ ستەمکار.

لە "نامە فارسییەکان"دا بەپێچەوانەوە وێنەیەکی درامـیو دەوڵەمـەند بـەئارەزوو کەڵکەڵە ئینسانییەکان دەبینینەوە لەمەڕ ستەمکارییەوە، وێنەیەك کە ترس، عەشق، پەرستن، بەخیلی، لەدەستدانی ئازادیو چێژ وەرگرتن لەم کۆیلایەتییـەو .. دەیـەها رەهەندی تری ئینسانی ترسناك، دەربارەی مەملەکەتی ستەمکاری.

# بەندی پێنجەم

## دیموكراسیو ئەگەری ستەمكارییەكی نەرمو نیان[1]

## خوێندنەوەیەكی كتێبەكەی ئەلكسیدی توكیوڤیلْ "دیموكراسی لەئەمریكا"

پێشەکی: توکیوفیلۆ سەبارەت بەنووسینی "دیموکراسی لەئەمریکا" بەم شێوەیە مەبەستی خۆی روون دەکاتەوە: "خستنە رووی زانستێکی سیاسی تەواو تازە بۆ جیهانێك کە خۆی تەواو تازەیە" میتۆدی توکیوفیلۆ بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلە سیاسییەکان بەلێکۆڵینەوەی هەلو مەرجی کۆمەلایەتی دەست پێدەکا، هەلو مەرجی کۆمەلایەتی وەکو هەلو مەرجی یەکسانی، عورف، خوو رەوشت، خووی عەقلیانەی هاونیشتمانیان، هۆکارێکە بۆ ئەوەی کە هەر رژێمە تایبەتمەندی خۆی هەبێت. هەلو مەرجی کۆمەلایەتی بیروڕاکان دادەتاشێ، کەلکەڵەو هەستەکان بەکەنالی تایبەتدا دەبا، ئامانجەکان دیاریدەکا، تایپ یاجۆری ئەو پیاوانەی کەدەبێت بەرز رابگیرێن، زمانی بەکارهاتوو، لەدواجاریشدا جۆری ئەو ئینسانانەی کە هەلو مەرجی کۆمەلایەتی‌و سیاسی دەیخولقێنێ‌و لەخۆی دەگرێ.

زانستی نوێ، لای تۆکیوفیلۆ، بۆ "جیهانێکی تەواو نوێ سەراپاگیرە لەبەرئەوەی لە ئەلتەرناتیڤێ دەگەرێ لەنێوان شێوازێکی تەواو موتلەقی ستەمکاری کە تائێستا جیهان بە ئەم یابەو شێوەیە دەستو پەنجەی لەگەلدا نەرم کردوە، لەبەرانبەر سیستەمێکدا کە ئەگەری ئازادی بۆ ئینسانەکان پێیە، ئەگەری خولقاندنی هەلو مەرجێ کە تێیدا بەهرەکانی ئینسان رێگای خۆیان بێ رێگەگرتن پەیدابکەن.

هەر لەسەرەتاوە تۆکیوفیلۆ بەراوردکارییەکی گشتی دەکا لەنێوان رژێمی کۆن (ancient regime) لەگەلۆ رێکخستنی دیموکراسیدا کە بەڕای ئەو دەشێ لەو باوەڕەدابین کە بەتەواوی شوێنی رژێمی کۆن دەگرێتەوە. رێکخستنی ئۆرستۆکراسی لەبنەڕەتدا لەسەر بنەمای یەك هێز بەندبوو بەلام کە هەیمەنەی ئەوانەی کە زۆر بەدەستەلات بوون یاسایی کراو رێوشوێنی بۆ دانرا (regularized)، و عورفو عادات چەند سنورێکی بۆ ئەو دەستەلاتە داناو جۆرە یاسایەکی دارشت لەنێو ئەو هێزەدا گەر ئۆرستۆکراتیەت فەزیلەی خۆی هەبووبێت وەکو ئیستقرار، بەهێزی، مەجدوشکۆ، ئەوا فەزیلەی دیموکراسی هەرچەندە لەخوارتریش بێت بەلام فەزیلەتێکی پتەوترە. تۆکیوفیلۆ لەپێشەکیەکەیدا بۆ کتێبی "دیموکراسی لە ئەمریکا" دەنوسێ:

**دیمەنەکە ئێستا گۆڕاوە،، جیاوازیەکانی مەرتەبەکان (rank) پووکاونەتەوە. بەربەستەکانی کەرۆژێك**

**خزمەتی مرۆڤایەتیان دەکرد کەوتن، موڵکایەتی دابەش دەکرێ، دەستەڵات لەلایەن ژمارەیەکی زۆرەوە دابەش دەکرێ، رووناکی عەقڵ پەخش دەبێتەوە، تواناکانی هەموو چینەکان رووەو یەکسانی تەکان دەخوا، کۆمەڵگا دەبێتە دیموکرات، ئیمپراتۆرییەتی دیموکراسی لەسەر خۆو بەئاشتی بەدام و دەستگاو عورف و عاەتەکان دەناسێنرێت. دەتوانم وێنای ئەو کۆمەڵگایە بکەم کەتیایدا هەموو ئینسانەکان وەك یەك یاساکانیان خۆش بوێ و رێزی ئەو یاسایانە بگرن کە خۆیان بەنووسەرەکانی دەزانن، کۆمەڵگایەك کە دەستەڵاتی حکومەت وەك شتێکی پێویست رێزی لێدەگیرێ، نەك وەك دەستەڵاتێکی ئیلاهی، کۆمەڵگایەك کە دڵسۆزی تابع (subject) بۆقازییەکان بەدوور دەبێت لەعاتیفەو حەماسەت، بەڵکو دڵسۆزیەك دەبێت لەسەر ئاستێکی ئارام و عەقلانی. کۆمەڵگایەك کە هەرتاکە کەسە خاوەنی مافەکان دەبێت، ئەو دڵنیا دەبێت کە چۆن بیانپارێزێ، بڕوایەکی پیاوانەو رێزێك لەنێوان هەموو چینەکاندا سەرهەڵدەدا، بەدوور لەغرور کۆیلایەتی .. هەرەوەزی هاونیشتمانیان رەنگە ئەوکاتە شوێنی دەستەڵاتی تاکییانەی نەجیب زادەکان بگرێتەوە، ئەوسا جڤات (community) دەپارێزرێ لەستەمکاری و بەرەڵایەتی (license) [٢]**

گریمانکاری سەرەکی لەو وێنەیەی سەرەوەدا دەربارەی کۆمەڵگای دیموکرات ئەو گریمانکارییەیە کە دەڵێ هاونیشتمانیانی دیموکرات دەتوانن هۆشیار بن و ببنە خاوەنی تێگەیشتنێکی رۆشنگەرانە دەربارەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانیان بەپلەیەك کە لەدڵیاندا شوێنی نامێنێت بۆ فەخرو غرور کە کارێك دەکا ئینسانەکان بەخیلی بەجێ و مەقامی ئەوانی دیکە ببەن گەرچی رەواش بێت. دەبێت لەیادمان بێت کە تۆکیوڤیل رەفزی ئەوە دەکا کە بچێتە پاڵ ئەوانەی هەوڵ

دەدەن دیموکراسی چاك بکەن و پاکی بکەنەوە لەڕێگای وا دارکردنی هاونیشتمانییە دیموکراتەکان بەبیرکردنەوە تەنیا لەبەرژەوەندییە خودییەکان (زاتییەکان).

وێنەکێشانی دیموکراسی وەك کۆمەڵگایەك کە تێیدا کەسانی هۆشیارو ڕۆشنگەر (enlightened) تەنیا وێڵی بەرژەوەندییە زاتییەکانیان و چاك بوون لەبواری ماتریالی، وێنەیەکە نەك واقیعی نییە بەڵکو زۆر ناشرینە. تۆکیوڤیڵ یەکێك بوو لەو فەیلەسوفە سیاسییانەی سەدەی نۆزدە کە ئومێدێکی زۆری بەڕۆشنگەری هەبوو کە سیستەمێکی سیاسی ئەوتۆ بخوڵقێنێ کەلەلایەکەوە بریتی بێت لە جێهێشتنی کۆت و زنجیرەکانی رابردوو بەلام لەگەڵ پاراستن و هەلگرتنی هەموو جوانی و فەزیلەکەتانی پێشوو، ئنجا دروست کردنی هاوسەنگی‌یەك لە نێوان پێداویستیە عەقلی و کلتوری و ڕۆحییەکانی ئینسان لەگەڵ پێداویستی‌یە مادی‌یەکان، هاوسەنگی‌یەك لەنێوان ئازادی تاکە کەسدا لە گەڵ پاراستنی زەمینە ڕۆحی‌یەکە کە جڤاتە.

مەبەستی توکیوڤێل لە" دیموکراسی لە ئەمریکا" نیشاندانی ئەو راستیەیە بە ئینسانەکان کە چۆن دەشێ لەیەك کاتدا ئازادبن و یەکسان، وئنجا نیشاندانی ئەو راستیەی کە گەر بێتو دیموکراسی یەکسان نەکرێت و نەناسرێتەوە لە رێگای بەستنەوەیەوە بە دام و دەسگاکان، حکومەتی خەلکی، حکومەتی نوێنەرایەتی(representatirve)، جیاکردنەوەی دەستەلاتەکان، بوونی بواری مەدەنی ئازادو بوونی بەردەوامی گفتوگۆی ئازادانە لەسەر کێشەکان، توکیوڤێل لەم حالەتەدا ترسی خۆی نیشان دەدا کە گەربێتوو دیموکراسی تەنیا پشت بە حەماسەتی یەکسانی ببەستێت ئەوا دیموکراسی گونجاو دەبێت لەگەڵ ستەمکاریدا، حالەتێك کەهەم ستەمکاری‌یەو هەم ئازادیش بەرکەماڵە. ئەو رای وابوو کە ستەمکاری دەشێ شان بەشانی ئەو دام و دەسگایانە بوونی هەبێت و بژی وا دەردەکەون کە دیموکراتین. بە پێچەوانەی کەسانی هاوسەردەمی خۆی کە باوەڕیان وابوو گەشەکردنی لەسەرخۆ بەرەو یەکسانی دەبێتە مایەی خاپوور کردنی ئەگەری ستەمکاری لەسەر گۆی زەوی.توکیوڤێل لەو باوەڕەدابوو کە گەر بێت و پرنسیپی دیموکراتی رێنومایی نەکردرێ، هەمیشەو هەمیشە لەژێر چاودێری عەقڵیدا نەبێت بەمانای هەڵسەنگاندنی فیکری، ئەوا قلێپ دەبێتەوە بەرەو ستەمکاری‌یەك کە مرۆڤایەتی تا ئێستا ئەزموونی نەکردووە.

لەم کتێبەدا تۆکیوڤیل رووردەکاتە رژێمی ئەمریکی لەسالانی ۱۸۳۰ دا نەك لەبەرئەوەی کە بەناچاری ئەو رژێمە بەرجەستە بووی پرنسیپەکانی چاکترین رژێمە، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو رژێمە خالی وەرچەرخاندنی گەشەکردنی مێژوویی بەرەو زیاد

بوونی یەکسانی. هەروەها ئەو دەڵێ بۆیە لە دیموکراسیەتی ئەمریکی توێژیوەتەوە تاکو "ئەو وانانە بدۆزێتەوە کە دەشێ لێوەی سوود وەربگرین". کەواتە ئەمریکا وانەی زۆرە تابیدات بەدەرەوە بەتایبەت بۆ فەڕەنسا، لەبەرئەوەی سەرچاوەی داهێنەرانەی یاساکانو عورف یەکێکە لەهەردوو وڵاتەکەدا، ئەمریکاو فەڕنسا. وەك چۆن لای مۆنتسیکیو دیمان کە باسکردنی ئەو بۆ ستەمکاری خۆرهەڵات بەئاگا هێنانەوەیەك بوو بۆ فەڕەنسیو ئەوروپییەکان، مەبەستێکی لەم جۆرەش لای تۆکیوڤیلْ دەبینینەوە. دەتوانین بڵێین کە تۆکیوڤیلْ بەڕاستی کتێبێکی نووسیوە بۆ فەرەنسییەکان، ئەو لەڕێگای باسکردنی ئەمریکاوە دەیەوێت لەهەلو مەرجی داهاتووی فەرەنسا بدوێ، مەبەستی ئەو دوو فاقەیە؛ لەلایەکەوە شیکردنەوەی ئەمریکاو لەلایەکی دیکەوە چاوبڕین لەگیروگرفتەکانی دیموکراسی داهاتووی ئەوروپا، هۆشیار بوون لەفەزیلەتەکانی دیموکراسی ئەمریکی بەڵام ئاگادار بوونیش لەئەگەرەکانی بوونە ستەمکاری ئەو سیستەمە. هەروەها ئەمریکا نمونەی دیموکراسیەتێکی تایبەتو ناوازە بەجودا لەوەی فەرەنسا، چونکی لەئەمریکادا بەدەگمەن توخمی دژە ـ دیموکرات بوونی هەیە. ئەو گیروگرفتانەی لەدیموکراسیەتی ئەوروپیدا هەبوون، لەسەردەمی تۆکیوڤیلْدا، لەئەمریکا نەبوون لەبەر دووهۆ:

یەکەم: ئەمریکا سەرزەمینی هەلە بێسنورەکانە بۆتاکە کەسو موبادەرەی تاکە کەس ئارەزووی بەردەوامو جێبەخۆنەگرتوی هانیشتمانییە دیموکراتەکان بۆ گەشەکردنی ـ خۆو چاککردنی بارودۆخیان راستەوخۆ نابێتە مایەی بەخیلیو بوغز لەئەڕانی دیکە وەك ئەوەی کە لەئەوروپادا روودەدات.

دووەم: ئەمریکا هەر لەسەرەتاوە حەماسەتێکی دیموکراتیانە باڵی بەسەردا دەکێشێ بێ کێشمەکێشی چینەکۆنەکانی دژ بەدیموکراسی زیاتر لە یادەوەرییەکی دووردا هەن نەك بەواقیع، ئەمە لەکاتێکدا کە لەفەرەنسا، لەسەردەمی تۆکیوڤیلْدا ئەوچینانە سەرگەرمی کێشمەکێش بوون.

کەواتە ئەمریکا ئەو شتەی کە بەدەستی هێناوە لەماوەیەکی کەمدا تاڕادەیەك پەیوەندی بە بەختەوە هەیە، بەڵام ئەوشتەی کە بەخت بۆ ئەمریکای دەکا، هونەرە نوێکەی تۆکیوڤیلْ، فەلسەفەی سیاسی یاسا دانەری نوێ، نیشانی فەرەنسای دەدا کە چۆن فەرەنسا یا ئەوروپا بگەیەنێتە ئەو حاڵەتە.

بەشێوەیەکی گشتی تۆکیوڤیلْ، لەم کتێبەدا، هەوڵی دەوڵەمەندکردنی دیموکراسیەت دەدا لەڕێگەی گونجاندنییەوە لەگەڵ ئازادی، لەڕێگای هێنانە دەرەوەو ئاشکرا کردنی ئەو بەها گرنگەی دیموکراسیەت کە پەنهانە ئەویش ئازادییە. لەجەوهەردا دیموکراسی بریتییە لەوێناکردنی هەرە بەدەستەڵاتی ئەم

پرنسیپە: "هەبونی مافی یەکسان بۆ هەموو ئینسانەکان بۆ ئازادی". لەکتێبەکـەیدا، "رژێمی کـۆن"، ئـەو کتێبـەی کـە لەسـاڵانی دوایـی ژیانیدا نوسـیویەتی، تۆکیوڤیـڵ بەئاشـکرایی‌و ئازایانـە تـەئکید لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە عیشـقی ئـازادی حەماسەتێکی لا عەقڵانییە، بـەڵام سـەرچاوەی هەمووشتێکی مەزنیشـە. دەربـارەی ئەو میللەتانەی کە ئازادیان لەدەستداوە دەڵێ:

**ئاسانە ئەوە ببینرێ کە ئەومیللەتانە لەشتێکیان کەمە**
**ئەویش عیشقێکی رەسەن بۆ ئازادی، ئەو تموحە نەجیبە،**
**کە من ئیعتراف دەکەم لەو دیو شیکردنەوەیە. چونکی**
**شتێکە کە مرۆڤ هەستی پێبکاو لۆژیك بەشێك نییە لێی.**
**ئەم عەشقەی ئازادی ئیمتیازێکی عەقڵە گەورەکانە کە**
**خوداوەند وای خەڵق کردوون بتوانن پێی بگەن،**
**وەکارێکی کردووە کە ئەوان بەپەرۆشەوە وێڵی بن، بەڵام**
**ئەوەش بڵێین بۆ رۆحەنزمەکان، ئەو رۆحانەی کە ئاگری**
**موقەدەس هێشتا بەریان نەکەوتووە، ئەوعیشقی ئازادییە**
**شایانی لێ تێگەیشتن نییە.** [٣]

هەر هەمان رۆحیەتە کە ئێمە لەدامو دەستگاکان‌و ژیانی ئـەمریکیدا دەیبینینـەوە بەڕای تۆکیوڤیل. بەڕای ئەو ئەمریکییـەکان تـەنیا لـەرێگای عیشـقیانەوە بـۆ ئـازادی دەجولێن‌و دێـن‌و دەڕۆن، حەماسـەتێکی قـووڵ کـەپڕ بەپێسـتی ئـەو دروشمەیـە کـە لەدەستووری گشتی ئەمریکیدا هاتوە: "ئازادی‌و وێڵ بوون بەدوای بەختیاریدا".

با دوای ئەم پێشەکییە سەرنجێکی خێرا بدەینـە بۆچوونـی تۆکیوڤیـڵ دەربـارەی دیموکراسی‌و بپرسین کە خاسیەتی سەرەکی کۆمەڵگای دیموکرات چییە؟

خاسیەتی ناسینەوەی کۆمـەڵگای دیموکـرات بریتییـە لـە ئـەتۆمیزم (atomism ـ الذرية) واتە پێکهاتنی کۆمەڵگا لە ئەتۆمـەکان (لێرەدا بـەمانای تاکـەکان). چۆنێتـی فەرمانڕەوایەتیکردنی چینـە فـەرمانڕەواکان بەسـەر خـەڵکیداو سـەیرکردنی خۆیـان وەکو شوان‌و خەڵکی وەکو مێ گەل کەدەبێت لێبخوردرێن، ئەم حاڵەتەو ئـەم جـۆرە فەرمانڕەوایەتیکردنـە وەلاوە نـراوەو لەلایـەن حاڵـەتێکی نـوێ‌و فەرمانڕەوایـەتی کردنێکی دیکەوە شوێنی گیراوەتە، کە بریتییە لەبازکردنی هەموو رێگاکان بۆ هەموو کەس بەرەو بەدەستهێنانی دەسەکەوتی کۆمەڵایەتی، عەقڵی‌و سیاسی. ئینسانەکان لەم هەل‌و مەرجە تازەیەدا رووبەڕوی یەکتر دەبنەوە وەك کەسانی یەکسان بەیەکتر، هەریەکە سەربەخۆو ئازاد. ئەوتاکە کەسـانەی کـە ئـەم کۆمەڵگایـە پێکدەهێنـن وەك

هاونیشتمانیان، ئیدی خاوەنی هیچ گرێیەکی سروشتی نین کەبەیەکیانەوە ببەستێتەوە، مادامە هەرکەسە یەکسانە بەهەرکەسێکی دی، هیچ کەس خاوەن ئەرك نییە بەرانبەر هیچ کەسێکی دی. بەڕای تۆکیوڤیلˇ، کلیلی ئەتۆمیستیکی یەکسانی سەردەمی دیموکرات وا لەبڵاوبوونەوەی "تاك گەرایی individualism"دا، وەك حەسمکردنێك، رەتکردنەوەیەکی هەر ئەرکێك (obligation)و سەیرکردنی هەر ئەرکێك وەك ئۆتۆرەتێتی (authoritative). لەم حاڵەتەدا هەرتاکەکەسە دەبێتە سێنتەری گەردوونێکی زۆر بچووکی تایبەت بەخۆی کەتەنیاپێك هاتووە لەخۆی. ئەو تاکە کەسانەی کەوێڵی بەرژەوەندییە خودییەکانو لەم کۆمەڵگایەدا خۆیان دەبیننەوە کە رزگاریان بووە لەهەموو گرێو بەندێکی کەنیسە، خێزان، چینو ئنجا جڤات، ئیدی ئازاد دەبن بچنە ناو جیهانی ئابووریو بازارەوە.

باوکی رۆحانی ئەم "ئایدیا نوێیە"بێگومان دیکارتە، کە فەلسەفەی ئەو و میتۆدە فەلسەفییەکەی ئەو نمونەکانی لەم جۆرە. فەراهەم دەکاو رەوایەتی دەبەخشێتە ملکەچ کردن بۆحوکمی کەسیو تایبەتی هەر ئینسانە بۆ خۆی، رەتکردنەوەی هەر جۆرە بیرو عەقیدەیەك کە لەدەرەوەی تاکە کەسەو دیموکراسی لەفەلسەفەی دیکارتدا یارو یاوەرێك دەبێتەوە بۆ رەتکردنەوەی باوەڕەتەقلیدییەکان. بەڵام هەر هەمان کە لکەڵەی تاکگەرایی فەلسەفەی دیکارتە کە دواجار دەبێتە گیروگرفتێکی دیموکراسی. چونکە سەرگەرم بوون بە بەدەستهێنانی دەستکەوتی مادیو غەم خواردن تەنیا لەچاکەی شەخسی لەسەر حیسابی خەڵکیو بێ حیساب بۆکردن بۆ بواری مەدەنیو گشتی، بێگومان دەبێتە مایەی هاتنەکایەوەی میانمایەیی (medicority) یا عادی بوون. هەروەها کاتێك ئینسانی دیموکرات تەنیا سەرقاڵی بەتەنگەوەهاتنە ماددییەکانی خۆی بێت لەسەر حیسابی مەدەنیو بواری سیاسی، ئەم حاڵەتە جۆرە سیستەمێك دەهێنێتە ئاراوە کە دەشێت ناوبنرێت بە "ستەمکاری نەرمو نیان". باپرسین ئەم حاڵەتە لەکوێوە سەرچاوە دەگرێ؟

لەرێگای خاپوور کردنی هەموو عاتیفە نەجیبەکانی ئینسانەوە ئەم حاڵەتە سەرچاوە دەگرێ، عاتیفەی بەتەنگەوە هاتن (care)، شەرەف، لەخۆبووردن، عەشقی فەزیلەت،و خۆتەرخانکردن بۆ چاکەی مەدەنی، گەشەکردنی خودپەرستی، و ئنجا رێنومایی کردنی خەڵکی تا سەرقاڵی چێژە حسییەکانیان بن.

نوسەرانی تری سەربە نەوەکەی تۆکیوڤیلˇ دەمیان لەترسی خود پەرستیو گۆشەگیرکردنی هاونیشتمانیان داوە، بۆ نمونە دەشێ بلێین کە شیعری بۆ دلێر پەرچە کردارێکە دژ بەم حاڵەتەو دەربڕینی ترسێکە لەوە دیهێنانی ئەو حاڵەتە، ترسی ئەوەی کە هەموو پەیوەندییەکانی تاکە کەسەکانو ئەو هێلانەی کە تاکەکان

پێکەوە دەبەستنەوە لەناو بچن‌و هەرەس بهێنن، لەشوێنی کۆمەڵگایەك سەرهەڵبدا کە هیچ نەبێت جگە لە "کۆمەڵێ مەنفای بچووك بچووك"[٤] سان سیمۆن بەشێوەیەکی تر ترسی خۆی نیشان دەدات، ئەو دەڵێت: "کۆمەڵگای ئەمڕۆ لەبەدترین ئاژاوەی ئەخلاقیدایە، خودپەرستی بەتوندی ڕەوت دەکات، هەموو شتێك بەرەو گۆشەگیری دەڕوات"[٥].

بابزانین تۆکیوڤیلّ چۆن لەم کێشەیە دەڕوانێت!

بەڕای تۆکیوڤیلّ "دیموکراسی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان شل دەکاتەوە"و "هاونیشتمانیان لێك جیادەکاتەوە". هەر ئەم کەڵکەڵەیەی کۆمەڵگای سەدەی نۆزدەم بۆ "لێك داپچڕاندنی هاونیشتمانیان لەیەکتر" کە بووە شوێنی غەمی تۆکیوڤیلّ پێناسەکردنی تاکگەرایی وەك پراکتیکی کشانەدواوە لەبواری گشتی‌و مەدەنی بۆ غەرق بوون لەبوونی تایبەتیدا، تۆکیوڤیلّ ئەم تاکگەراییە بەحوکمێکی هەڵە لەقەڵەم دەدا. هەرچەندە ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە تاکگەرایی جیاوازە لەخودپەرستی، بەڵام بەڕای ئەو لەماوەی درێژخایەندا هەردوو دەبنەیەك، هەروەك خودپەرستی، تاکگەرایی بەمروری زەمەن هەموو فەزیلەتێکی "ژیانی مەدەنی" تێك دەدات. بەڕای ئەو، ئەوانەی تەمجیدی تاکگەرایی دەکەن، ئەوانەی هاونیشتمانیان تەشویق دەکەن تاخۆیان جیابکەنەوە لەکاروباری گشتی‌و مەدەنی‌و سەرگەرمی کۆکردنەوەی سەروەت‌و سامان‌و سەرقاڵی چێژی تایبەتی بن، ئەوانەی بێ ئەوەی بزانن خەریکی پەروەردەکردنی ستەمکارییەکی نوێن، لەبەرئەوەی ئەوکاتەی تاکە کەسەکان مەیدانی گشتی چۆلّ دەکەن، حکومەتێکی خەفەقان سەرهەڵدەداو داوا دەکا کە هەرخۆی ئۆتۆرەتی بێت، داواش دەکا ئەو تاکە ئۆتۆرەتییە بێ پرسیار قبولّ بکرێ، لەجیاتی ئەمە تۆکیوڤیلّ گرنگی بە "تاکگەرایی تەندروست"دەدا، ئەو تاکگەراییەی کە لەئەنجامی غەرق بوونی تاکەوە لەدنیا بچووکەکەی خۆیدا نایەتەدی بەڵکو لەئەنجامی بەشداریکردنی لەگروپ یا جڤاتدا کە خاوەنی ئامانجی مەدەنی‌و گشتییە، لێرەوە ئەو تاکگەراییەتە تەندروستە دێتە دی. لەگروپێك یان جڤاتێکی لەوشێوەیەدا تاك باوەڕ - بەخۆ بەدەست دەهێنێ‌و دەستی بەزانست دەگا لە ڕێگای هەڵسوکەوت‌و نواندنی کردار لەگەلّ ئەوانی دیکەدا، لەسەرخۆ ئازایەتی‌و بوێری شەخسی خۆی گەشە پێدەدا چونکی ئەو ئازایەتیە پێویستە بۆ هەڵوێستی ئەخلاقی تاکانەو تاکەکەسی سەربەخۆو تاکەکەسی حەقیقی لەژیانی مەدەنیدا. تاکەکەسی ئازادو سەربەخۆ ئەو کەسەیە کە ئازایانە داکۆکی لەبیرو ڕاکانی خۆی دەکاو بوێرانە لەسەر کێشە مەدەنییەکان لەبواری گشتیدا بەرمەبنای عەقلّ، نەك نەزەوات، موجادەلە دەکا. بەش بەش کردنی کۆمەڵگاو گۆشەگیرکردنی تاکەکان، لێك

داپچڕاندنی پەیوەندییە کۆنەکان، ئاوابوونی خۆری مەدەنیو کەمبوون یا لەناوچوونی گفتوگۆ لەسەر کێشەمەدەنییەکان، هەرهەموو هەلو مەرجێکن، وەك لەدواجاردا دەیبینین، بۆستەمکارییەکی تەواو تازە.

دیموکراسی دەبێت ئارەزووی ئینسان بۆ چاك بوون (well - being) تێربکات، بەشێوەیەك کە کارێك بکا تەشویقی ئینسانەکان بکا کە بەشێك لەوزەیان تەرخان کەبن بۆ کۆشش‌و پێویستییەکانی تری جڤاتو نەتەوە، جگە لەپێویستییە شەخسییەکان. ئەم گیروگرفتە شایەنی چارەسەرکردنە یا لەرێگای دابینکردنی شمەکە ماددییەکان بەشێوەیەك کە هەر هەموو قانع بکا، تاکو هیچ قەلەقی نەبێت لەوەی کە رەنگە بەشی (حصەی) خۆی بەدەست نەهێنێ، یاخود لەڕێگای موعتدەلکردنی ئارەزووەکانەوە، لەم حاڵەتەدا ئینسانی دیموکرات لەرێگای تێگەیشتنێکی عەقڵییەوە خود بەخود ئارەزووەکانی موعتەدل دەکا. (لێرەدا سەرنجتان بۆ کۆمەڵگای بەرخۆری (استهلاکی) رادەکێشم کە لەسەر زاوزێ کردنی ئارەزووەکانەوە بیناکراوە، ئەو کۆمەڵگایە هەرەس دەهێنێ گەر ئەم تێگەیشتنە عەقڵییە بێتە ئاراوە، لێرەوە دەڵێم کۆمەڵگای ئیستهلاکی نامەعقولترین کۆمەڵگایەو پەیوەندی دیموکراسیو کۆمەڵگای ئیستهلاکی بابەتێکی زۆر گرنگە بۆ قسەکردن، ئایا دیموکراسی گونجاوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەدا؟).

لای تۆکیوڤیل، ئارەزوو خواستی ئینسانی دیموکرات بۆ گەیشتن بە بەختەوەری نەك تەنیا گونجاوە لەگەڵ ئەخلاقو رێکخستنی مەدەنیدا، بەڵکو ئەو ئارەزوو خواستانە رەنگە تێرنەبن بەبێ بواری مەدەنی. کەواتە، هەرچەندە دیموکراسی رەنگە پشت گوێ خستنی ئەو شتەی کە لەئینساندا مەزنە لەگەڵ خۆی بهێنێ، بەڵام بەلانی کەمەوە کێشەی بەختەوەرییەکی گونجاو بۆ زۆربەی خەڵکی چارەسەر دەکا.

گواستنەوە لەعەودال بوونی شمەكو ماتەریال، عەودال بوونێکی گونجاوو موعتەدیل، بۆ عەودال بوونێکی توندڕەو بەپلەیەك کە بەدەستهێنانی ماتەریال ببێتە ئامانج، ئەم گواستنەوەیە هاورێیە لەگەڵ سەرهەڵدانی رۆحی بسنسو بازرگانی، بسنس لەم هاوکێشەیەدا لەسەرتادا واسەیری دەکرێ کە رێگایەکی پڕ بەروبوومە بۆ رازی کردنو گەیشتن بە بەختیاری، بەڵام دواجار خۆی دەبێتە ئامانج لەم حاڵەتەدا بسنس بازرگانی، سادەترین ئارەزوو بۆ بەختەوەری دەگۆڕێتە سەر زنجیرەیەکی لەبن نەهاتووی ئارەزووەکانو توورِ هەڵدانی ئەو ئارەزووانە بۆ نێو گێژاوێك کە سەختە ئامانجە سەرەکیەکە تیایدا بناسرێتەوە. لەم سیناریۆیەدا بازرگانی دەبێتە کۆششێکی نەجیبو بەمەزنی سەیری دەکرێ، ئینسانە خاوەن بەهرەو توانا عەقڵییەکان لەسیاسەتو کاروباری عەقڵیو کایەکانی تری داهێنانەوە

راپێچ دەکرێن بەرەو بواری بازرگانی، واتە لەژیانی مەدەنییەوە بەرەو ژیانی تایبەت. لەبازرگانیدا ئەم ئینسانانە زەمینەیەکی گونجاو دەبیننەوە بۆ گەشەکردنی بەهرە جیاوازەکانیان، هەروەها ئەو کاتەی کە ژیانی سیاسی بە بازاڕی دەکرێت (vulgarized) ئەو ئینسانانە لەبازرگانیدا ئازادییەك دەبیننەوە، ئازاد بوون لە یەك بەرگی ژیانی سیاسیو بەبازاڕی بوونی ژیانی مەدەنیدا. لەڕاستیدا ئەگەری ئەوە بەهێزە کە ئەم ئینسانانە چینێکی نوێ پێك بهێنن (ئەمڕۆ ئەمە لەئەگەر دەرچووە، ئێستا چینێك دروست بووە کە پێی دەڵێن "سوپەر کلاس" ملیۆنەرو بلیۆنەرەکانی جیهان). لەجیهانێکدا کە هەمووشت بۆ فرۆشتنە، تاکگەراییو ماتەریالیزم، دوو خاسیەستی دیموکراسی، تەحریف دەبن بەپلەیەکی زۆر لەلایەن دابەزینی ئادابو سلوکی کۆمەڵایەتییەوەو کاڵ بوونەوەی ڕۆحی بەتەنگەوەهاتنی ئینسانەکانی دیکە.

تۆکیوفیلْ قەلەقی ئەوەبوو کە سامان لەم کۆمەڵگا بۆرژوازیەدا، وەك ئامانجێك خۆی لەخۆیدا، سەیربکرێ، نەك وەك ئامڕازێك بۆ گەیشتن بەژیانێکی چاك (لێرەدا تۆکیوفیلْ هاوڕایە لەگەڵ ئەرستۆدا). ئەو دەرکی بەوە کردبوو کە ژیانی بۆرژوازی تەشویقی خەڵکی دەکا بۆسەر گەرم بوون لەگەڵ چێژو بەختیارییە بچوکەکانو کردارە بەرژەوەندییە ـ خودییەکان، ژیانێك کە کارێك دەکا کە کەسانی خاوەن تواناو بەهرە زۆر زوو بە پەیمانەکانی خۆی هەڵبخەڵەتێنێ. لای زۆر کەسی نەوەکەی تۆکیوفیلْ ئەم ژیانە بۆرژوازییە گەرای کۆیلایەتییەکی نوێی پێیە.

قانع کردنی خەڵکی کە ئامانجی سەرەکی لەژیاندا بریتییە لە کەڵەکە کردنی سامانو عەودالْ بوونی خۆشی، ئەو کەسانەی کە لێپرسراون لەکاروباری سیاسی دەستەڵاتێکی زۆرتر بەدەست دەهێنن، دەستەڵات بەسەر ژیانی خەڵکیدا، ئەم حاڵەتەش هێواش هێواش کارێك دەکات کە دانیشتوان پاسیف بنو دواجاریش ملکەچ. گەر ئەم حاڵەتە زۆربوونی کەڵەکە بوونی سامانو غەرق بوون لەبەختیارییە بچووکەکانی جیهانە بچووکەکەدا، گەر ئەمە لەداهاتوودا بەردەوام بێت، ئینسانەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازی هەر جۆرە بەشداریکردنێك لەژیانی سیاسیدا لەدەست دەدەن، لەبەرئەوەی ئەوان تەنیا لەدنیا تایبەتییەکەی خۆیاندا گیر دەخۆنو ئەوەش دەبێتە مایەی لەبیرکردنو پشتگوێ خستنی بواری مەدەنیو غەمو کێشەکانی. لەبەرگی دووهەمی "دیموکراسی لەئەمریکا"، تۆکیوفیلْ بەم شێوەیە قەلەقی خۆی دەردەبڕێت:

**قۆناغێك هەیە لەمێژووی خەڵکی دیموکراتدا کە**
**بەڕاستی مەترسیدارە. ئەو کاتەی کە حەزو چێژ**
**بۆرازیکردنی فیزیکی لەنێوانیاندا زۆرتر گەشەدەکا**

**زیاتر لەپەروەردەبوونیان و ئەزمونیان بۆدام و دەستگای ئازاد، ئەوسا کاتێك دێ کەئینسانەکان کۆنترۆڵ لەدەست دەدەن، جڵەوگرتنەویان لاواز دەبێت لەبەردەم هەرشتێکی نوێدا کە خەریکە بەدەستی بهێنن. لەقەلەق بوونە گرژەکەیاندا بۆ بەدەست هێنانی شانسی، ئەوان بەرچاویان تەنگ دەبێت و ناتوانن ئەو پەیوەندییانە ببینن کە لەنێوان شانسی تایبەتی هەریەکەو گەشکردنی هەمواندا هەیە.. ئەرکە سیاسییەکان لای ئەوان دا دەردەکەوێ وەك رێگرێك لەبەردەم بسنس و پیشەکانیاندا. گەر داوایان لێبکردرێ کە لەهەڵبژاردندا بەشداری بکەن، کۆمەکی حکومەت بکەن لەرێگای خزمەتگوزاری تایبەتییەوە لەدانیشتنە مەدەنییەکاندا بەشداری بکەن لەو باوەڕەدان کە کاتیان نییە ئەوان ئامادەنین کاتە بەنرخەکەیان لەکاروباری بێسوودا بەفیڕۆبدەن.. ئەوان لەو باوەڕەدان کە بەدوای پرنسیپی بەرژەوەندی خۆدا کەوتوون: بەلام لەراستیدا ئەو پرنسیپەی ئەوان سەرگەرمی بوون زۆر خامە.. ئنجا تازیاتر ئەوان بەدوای کاروباری خۆیاندا برۆن، زیاتر کارە سەرەکییەکەیانپشت گوێ دەخەن، ئەویش مانەوە وەك سەروەری ژیانی خۆ[٦].**

لەدواقۆناغدا تەنیا راگرتنی توانای لەزەت وەرگرتن لەشتە تایبەتەکان دەبێتە مایەی لەدەستدانی توانای نواندنی کار لەبواری مەدەنیدا، خۆشی و لەززەتە بچووکەکان، زەوق و سەلیقەی نواندنی کاری قارەمانانە، یاخود کاری گەورەیی مێژوویی و ئامانجی نەتەوەیی لاواز دەکات. کاریگەری ئەم ئەخلاقی بەدەست هێنانە (اکتسابی ـ aquisitive) چییە لەسەر چالاکی سیاسی؟

تۆکیوڤیل موجادەلە دەکا کە سەرگەرم بوون بە کۆکردنەوەی سامانەوە دەبێتە مایەی لاواز بوونی ئازادی سیاسی، چونکی خودپەرستی و کۆششی تایبەتی بۆسامان بواری مەدەنی و گشتی تەسلیمی دەستەڵاتی چڕبووەوەی حکومەت دەکات. هاوونیشتمانیان دوورە پەرێزی دەکەن لەبواری مەدەنی و ئیدی گروپی خاوەن

بەرژەوەندی تایبەتی‌و حکومەت زیاتر چالاك دەبن‌و ئەو فەزایە داگیر دەکەن،و هەر خۆشیان دەبنە خاوەن بڕیارە سیاسییەکان. ئەوکاتەی غەمی کۆکردنەوەی سامان باڵی بەسەر نەتەوەدا کێشا، ئەوسا هاونیشتمانییەکان دەبنە بینەری بەڕێز، تاکەکان ئیدی بڕیاری سیاسی بەکاری خۆیان نازانن، بەپێچەوانەوە هەموو بوارە سیاسییەکان بەجێ دەهێڵن بۆ حکوومەت‌و ژمارەیەك کەس گوایا بەناو پسپۆڕو ئیدی سیاسەت یا وەك گەمەیەك"سەیردەکرێ که کەسانی بەشداری ناو ئەو گەمەیە هەریەکە هەوڵ دەدەن کە گەمەکە ببەنەوە، یاخود "، "درامایە" کەتیایدا هەموو کەس ئەکتەرن‌و ئەکتەرەکانی ناو ئەم درامایە تەنانەت مەبەستیان نییە کە شانۆنامەکە سەرکەوتووبێت بەڵکو ئەوان زیاتر سەرقاڵی ڕۆڵە تایبەتییەکەی خۆیان دەبن. سەرئەنجام هەرکەسە لەوی دی جیادەبێتەوەو گۆشەگیر، و هەر هەمووش لەبواری مەدەنی‌و گشتی دابڕاوو هەر هەمووش بێ دەستەڵات لەگۆڕینی هەرشتێکدا.

تۆکیوڤیل لەوباوەڕەدابوو کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەی سەلماند کە "چینی ناوەڕاست" دەتوانێ دەوڵەت بەڕێوەبەرێ. هەرچەندە ئەو گومانی هەبوو لەوەی کەچینی ناوەڕاست لەسەردەمی قەیران‌و لەکاتی روو بەڕوبوونەوەی سەختیدا بتوانێ ڕێنومایی چاکی حکومەت بکا، ئەو لەوباوەڕەدابوو کە ئەو چینە بۆ کاروباری عادی حکومەت لەبارە. وێڕای سۆزو عاتیفە بچوکەکانیان‌و پەروەردە پڕ لەکەم‌و کوڕییەکانیان، سلوکە بازاڕیەکانیان ئەندامانی ئەو چینە دەتوانن کاروباری سادەی حکومەت بەڕێوەبەرن. گیروگرفتێك کە دەێتەپێش ئەوەیە کە چینی ناوەڕاست واسەیری حکومەت دەکات وەك بسنسزێکی تایبەت، هەر ئەندامە تا ئەو شوێنە بیر لەکاروباری مەدەنی‌و گشتی دەکاتەوە تاکو چۆن کارێك بکرێ سوود لەوکاروبارانە وەربگیرێ، سوود بەمانا ماددییەکەی، هەر ئەندامە تەنیا چاو لەبەرژەوەندییە بچوکەکەی خۆی دەبڕێ‌و ئیدی خەڵکی‌و بورای مەدەنی لەبیردەکرێ. لای تۆکیوڤیل، هەروەك چۆن لای فەیلەسوفە سیاسییەکانی پێش خۆی جگە لە هۆبزولۆك، سیاسەت گەورەترە لەپرۆسەیەك کە گروپەکان لەرێگەوەی بەرژەوەندییە ئابورییەکانیان زیاد بکەن، سیاسەت دەبێ جەغد لەسەر پرنسیپەکان‌و راو بۆچوونەکان بکات لەمەڕ چاکەی گشتییەوە. ڕێکخستنێکی تەندروست‌و ئازاد دەبێت هەوڵی شتی گەورەتربدا وەك لەوەی ئارەزووە بچوك‌و بەرژەوەندییە خۆییەکانی ئەم یا ئەو تاکە کەسە تێربکا. ئەو واسەیری سەردەمەکەی خۆی دەکرد وەك سەردەمی داهێنانی شتەکان بەڵام لەهەمانکاتدا سەردەمی بەجێهێشتنی خەڵك، یا سەردەمی ڕێگەدان بەوەی کە خەڵك بچوك بن، خود پەرست بن، ئەو دەنوسێ:

**وادەردەکەویٚ کە سەرکردەکانی سەردەمی ئیٚمە تەنیا لەبیری ئەوەدا بن کە چۆن ئینسانەکان بەکار بهیٚنین بۆ دروستکردنی شتی مەزن، ئاوات دەخوازن کە کەمیٚك هەوڵی زیاتر بدەن لەپیٚناو خوڵقاندنی ئینسانە مەزنەکان، خۆزگە ئەوان کەمتر بەهایان دەدایە کارو زۆرترین بەهاش بەکریٚکار، خۆزگە ئەوان لەبیریان نەدەکرد کەنەتەوە ناتوانیٚ بەهیٚز بیٚت لەکاتیٚکدا ئینسانەکانی ناو ئەو نەتەوەیە هەریەکە بۆخۆی لاواز بیٚت ..[٧]**

تۆکیوڤیلْ لەوباوەڕەدابوو کە گەربیٚتو چینیٚکی تازەی ئورستۆکراسی سەرهەڵبدا، بەهۆی لاواز بوونی دیموکراسییەوە یاخود وەك بەرئەنجامیٚکی دیموکراسی، ئەوا ئەو چینە "ئۆرستۆکراسی مانیفاکتۆرەکان"، دلْڕەقترین چین لەمیٚژووی جیهاندا، ئۆرستۆکراسیەتیٚکی بازاڕیو فاسد، ئۆرستۆکراسیەك بیٚ بەش لە "هەستی بەرز".

تۆکیوڤیلْ نمونەی ولاتی چین دەهیٚنیٚتەوە وەك نمونەیەکی ئاشکرای کۆمەلگایەکی بیروکراتیو مەرکەزی (centralized)، وترسی خۆشی ناشاریٚتەوە لەئەگەری هاتنی ئەو رۆژەی کە ئەوروپا چاو لەو مۆدیٚلە ببڕیٚ یا بگات بەو حالەتە:

**وای دەبینم کەچین باشترین نموونەی ئەو جنسە بەختیارییەیە کە ئیدارەیەکی مەرکەزی رەنگە بۆ رەعیەتەکەی فەراهەم بکا. گەشتیارەکان دلْنیامان دەکەنەوە کەچینییەکان سکونو ئارامیان هەیە بیٚ بەختیاری، پیشەسازی بیٚ گەشەکردن، استقرار، بەلاْم بیٚهیٚزو توانا ریٚکخستنیٚکی مەدەنی بەلاْم بیٚ ئەخلاقی مەدەنی[٨]**

کەواتە گەر ستەمکارییەك لەئەوروپادا سەرهەڵبدا، گەر سەر هەڵبدا، نەك وەك بەرئەنجامی جەنگ یان شۆڕش، بەلْکو لەهەناوی ئەو هەلْپەیەوە دیٚتە دەریٚ، هەلْپەی چیٚژە تایبەتییەکانو شەخسییەکان کە بەرئەنجامی ئەتۆمایزەیشن (بەئەتۆمی کردن)ی کۆمەلگای بۆرژوازییە.

کەواتە ئەم خاسیەتانە، ماتەریالیزم، عادی بوون، گەورەکردنی بواری شەخسیو پووکانەوەی بواری مەدەنی، گۆشەگیری هاونیشتمانیان، کە مایەو قودرەت

لەئایدیای یەکسانیو تاکگەراییەوە وەردەگرن، کرۆکی وانەی تۆکیوفیلن دەربارەی دیموکراسی. بنەڕەتی ترین پارادۆکسی (تناقضی) دیموکراسی، لەدیدی تۆکیوفیلەوە بریتییە لەو حاڵەتەی کە یەکسانی هەلو مەرجەکان دەگونجیٚ چ لەگەڵ ستەمکاریداو چ لەگەڵ ئازادیدا.

جنسی یەکسان دەتوانیٚ هەڵ بکاو بژی لەگەڵ گەورەترین نایەکسانیدا، گەر دیموکراسی بەجیٚ بهێڵدریٚ بۆ تەڵەکانی خۆی، لەراستیدا سەرئەنجام بەدامەزراندنی ستەمکاری تەواو دەبێت، جا چ ستەمکاری یەکێك بەسەر هەمواندا، یا زۆربە بەسەر ژمارەیەکدا، یاخود ستەمکاری هەموو بەسەر هەمووانداا. گێروگرفتەکەش لای تۆکیوفیلٚ پەیوەندی بە ئارەزووی ئینسانی دیموکراتەوە هەیە بۆ یەکسانی، ئەم ئارەزووە دەست بەسەر هەموو هەستەکانی دیدا دەگریٚ، بگرە ئازادیش دەکاتە قوربانی خۆی. ئازادی کۆششو هەوڵو ئەرکی گەرەکە هەر بۆیەشە بەدەست هێنانی ئازادی سەختە، و زۆر بەئاسانیش لەدەست رادەکا گەر هەمیشە چاودێری نەکەیت، ئازادی موهمەی عومرە، نەخەڵاتە تاببەخشرێتو نەمافە تا لەرێگای بەیاننامەیەکەوە بتوانی بیدەیت بەخەڵك.

هەرچی پەیوەندی بەیەکسانییەوە هەیە، سودەکانو چێژەکانی یەکسانی راستەوخۆ هەستیان پێدەکریٚو هیچ پێویست بەخۆماندووکردن ناکا. ئەو سودانەش شوێنی دەست رەسی هەموولایەکن. هەروەك تۆکیوفیلٚ دەڵێت: "بۆ تامکردنی ئەو سودانەش هیچ هەوڵێك پێویست نییە تەنیا ئەوە نەبێت کەبژیت". حەماسەتی ئینسانەکانی ناو جڤاتە دیموکراتییەکان بۆ یەکسانی بریتییە لە "هەیەجان ئامێز، جیٚ بەخۆ نەگرتوو، .. ئەوان چاو لەیەکسانی ئازادی دەبڕن گەر نەیانتوانی بەدەستی بهێنن. ئەوا بەیەکسانی لەکۆیلایەتی بووندا رازی دەبن" عیشقی یەکسانی رەنگە لەدووشێوەدا خۆی بەیان بکا: شێوەی یەکەم: حەماسەتێکی پیاوانە یاسایانە بۆیەکسانی کە هەوڵدەدا هەر هەموو کەس بگەنە ئاستی مەزنی. شێوەکەی دی، فاسدترین تامو چێژ بۆیەکسانی کە هەوڵدەدا هەر هەمووکەس کورت بکاتەوە بۆ نزمترین مەقامی هاوبەش. بەلاّم ئەو هێزانەی کە کاردەکەن لەژێر سایەی هەلو مەرجی یەکسانیدا رێگانادەن بەگەشەکردنی ئومێدی شێوەی یەکەمی عیشقی یەکسانی، واتە حەماسەتێکی پیاوانە بۆیەکسانیو بەرزکردنەوەی هەرهەموو بۆئاستی مەزنی. ئەو هێزانە پالٚ بەئینسانەکانەوە دەنێن تا ئارەزووی ئەو شمەکانە بکەن کە بەدەستیان ناگات. یەکسانی ئەو ئومێدە دەدا بەهەمووان کە دەتوانن دەستیان بەهەموو ئەو شمەکانە بگا، بەلاّم مونافەسەکە لە بارێکدایە کە شانسێکی کەم هەیە بۆ ئەوەی هەر ئینسانە تموحەکانی بەدی بهێنیٚ، ئیدی سەرکەوتن تەنیا

بۆ ئەوانەیە کە هەلو مەرجی دیکە کۆمەکیان دەکا. کەواتە ئەو ئەگەرە لەباردەچیٚو ئەگەری دابەزاندنی هەر هەموو بۆ نزمترین مەقامی هاوبەش دیٚتە ئاراوە. دیموکراسی لەکاتیٚکدا هۆشیاری بەرانبەر مافی یەکسانی لەهەمووان‌دا بە خەبەر دەهیٚنیٚت، مافی یەکسانی لەسوودەکانی ئەم جیهانە، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا ئینسانەکان تووشی احباط دەکا چونکی هەر هەمووان ناتوانن دەستیان بەو سوودانە بگا. ئەم (احباط) دەبیٚتە مایەی ختوکەدانی هەستی بەخیلیو جیٚ گۆڕکیٚ کردنی ریٚز. بەم شیٚوەیە یەکسانی ئینسان ئامادە دەکا کە دەستبەرداری ئازادی بیٚت لەپیٚناو پاراستنی خودی یەکسانیدا. لەکۆمەلگایەکدا کە هەر هەموو یەکسانن، سەربەخۆ بەلاّم لاوازو بیٚ بەرو بووم، تەنیا یەك داموو دەستگا، ئەویش دەولّەت، بەبەهیٚزی دەمیٚنیٚتەوەو ئامادە دەکریٚ کە سەرپەرشتی کاریٚ بکات کە بڕیار نەبوو ئەو کارەبکا ئەویش سەرپەرشتی کردنی پرۆسەی تەسلیم بوونی ئازادی، واتە وازهیٚنانی خەلّك لەئازادی.
ئینسانە دیموکراتەکان واز لەئازادی خۆیان دەهیٚنن‌و دەیبەخشنە حکومەتی مەرکەزیو ئەم دەستەلاّتە مەزنە، لەموقابیلی چیدا؟ دەستبەردار بوونی ئازادی لەموقابل" ستەمکارییەکی نەرمو نیان "، "ستەمکارییەك کە ئاسایشیان مسۆگەر دەکا، پیٚویستییەکانیان دابین دەکا، چیٚژەکانیان بۆدابین دەکا، ئیدارەی غەمو نیازە سەرەکییەکانیان دەکا، سەرپەرشتی پیشەسازییەکانیان دەکا، دواجار هەر هەموویان "، "رزگار دەکا لەزەحمەتی بیرکردنەوەو سەختییەکانی ژیان"[٩]

تۆکیوڤیلٚ پیٚش بینی ئەوەی دەکرد کە حکومەتیٚ لەو جۆرە دژایەتی ناکات لەگەلٚ ئایدیای سەربەخۆیی باو (popular soverignty) کەواتە دیموکراسی دەبیٚتە مایەی لەدایك بوونی جۆریٚکی دی لەستەمکاری، ئەمجارە کۆمەلگا ستەمکاری بەسەر خۆیدا دەکا.

ستەمکاری لای تۆکیوڤیلٚ چەند رەهەندیٚکی هەیەو چەند ریٚگایەکیش کە گەر تەی بکریٚن ئەوا سیستەمی دیموکراسی دەگەیەنیٚتەوە سەر ستەمکاری، بابزانین چۆن؟ لەبەرگی دووی "دیموکراسی لەئەمریکا" و لە چاپتەریٚکدا لەژیٚر ناونیشانی "دەربارەی حەز بۆ بەختیاری فیزیکی لەئەمریکا". دەخویٚنینەوە:

**گەر بڕیار بوایە من لەوە بکۆلّمەوە کە کامە**
**حەماسەت کە زۆر سروشتییە بۆ ئینسانەکان ئەوا من**
**بیٚگومان هیچ حەماسەتیٚك زیاتر لەحەماسەتی**
**چاك ــ بوون‌و بەختەوەری فیزیکی نەمدەتوانی**
**کەشف بکەم. حەماسەت بۆخۆش بەختی فیزیکی لە**

**جەوهەردا حەماسەتی چینەکانی ناوەڕاستە. لەگەڵ ئەم چینانەدا ئەو حەماسەتە گەشەدەکاو بڵاودەبێتەوە.. هەر لە ئەم چینانەوە ئەم حەماسەتە دەگاتە پلە بەرزەکانی کۆمەڵگاو ئنجا جەماوەری خەڵك.**

دەتوانیین بەم شێوەیە مەبەستکەی تۆکیوڤیلْ شی بکەینەوە. ئەخلاقی بەدەست هێنان (acquisitive ethic) خەڵکی بەتوندی بەکاروبارو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان دەبەستێنەوەو بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ بەشداری کردنی لە ژیانی مەدەنیو گشتیدا. بەرئەنجامە راستەوخۆکەی ئەم سەرگەرمییە لەگەڵْ خۆش بەختی فیزیکیدا بریتییە لە بەتایبەتی کردن (privatization) یا بەشەخسی کردنی ژیان کەبەدەوری خۆی دەبێتە مایەی ئەو دیاردەیەی کە پێی دەگوترێت (indifference) بیْ باکی یان (apathy) بەرامبەر بەکاروبارو مەسەلە مەدەنیو گشتییەکانو بیْ باکی بەرامبەر بە بڕیارەکانی جەستەیا دامو دەستگا مەدەنییەکان. تۆکیوڤیلْ دەڵیْ "زۆربەی زۆری ئینسانەکانی هاو نەوەی من سەرگەرمی کاروبارە گچکەکانی خۆیانن". سەرگەرمی بەکاروباری بچوکەوە واتە ئیدی کەسیْ خەون بەدەستکەوتی سیاسی گەورەوە نابینیْ. هەرکەسە لەنێو جیهانە بچوکەکەی خۆیدا دەستو پەنجە لەگەڵْ خود پەرستییەکەی خۆی نەرم دەکا. بەواتایەکی دی ئینسان گەلێك دروست دەبن کە رەنگە راستگۆبن، لە جیهانەکەی خۆشیاندا رەنگە دەوڵەمەند بن ، بەلاّم هیچ نین جگە لەهاونیشتمانییەکی هەژار. ئەو کاتەی کە کۆمەڵگا ژیانی چاك بەوە لەقەڵەم بداو پێناسەی بکا کە ئەو ژیانەیە کە لێوانلێوە لەسەرگەرمی شەخسیو چێژی تایبەتی. ئەوکاتە خەڵك نەکاتیان دەبێتو نە تاسەی ئەوەش دەکەن کە کەمێك ووزە، مادده لەو ژیانە تایبەتییە بدەنە بواری مەدەنی واتە پوکانەوەی بواری گشتی کە بەدەوری خۆی بە کۆیلەیی هەمووان کۆتایی دێت.

هەروەك ئەرستۆ کە زاراوەو چەمکەکانی لای تۆکیوڤیلْ بەئاشکرایی دەبینرێتەوە، تۆکیوڤیلْ ئیدعادەکا کە لەوڵاتێکی ئازادو دیموکراتدا هاونیشتمانیان بەشداری فەزای مەدەنی شار دەکەن، ئەمە لەکاتێکدا کە ستەمکارەکان هەوڵدەدەن کە هاونیشتمانیان لە هاونیشتمان بوونەوە بکەنە رەعیەت یا تابع، ئەمەش لەرێگای غەرقکردنیان لەدنیای خسوسی خۆیاندا بەدەست دەهێنرێت. ئەوکاتەی کە تاکەکانی کۆمەلْ وا لەسیاسەتو کایەی سیاسی بروانن کە گوایە کایەیەکە تێیدا بەرژەوەندییە جیاوازەکان لەمونافەسەدان بۆ گەیشتن بە هۆیەك یان ئامرازێك بۆ تێرکردن، لەم حاڵەتەدا بواری مەدەنی دادەڕزیْ چونکی شتێك نامێنێتەوە بەناوی

چاکەی گشتی، شتێك نامێنێتەوە بەناوی جڤات. لێرەدا ئەو بۆشاییەی کە لەدنیای مەدەنیدا دروست دەبێت حکومەتی مەرکەزی داگیری دەکات. تۆکیوڤیلْ دەنوسێ:

**چ هێزو توانایەك دەتوانێ رای گشتی ببینێ لەکاتێکدا کەبیست کەس نابینێ کە پێکەوە گرێ درابن لەرێگای ئامانجێکی هاوبەشەوە، لەکاتێکدا نە ئینسانێك، نە خێزانێك، نەکۆمپانیایەك، نەچینێك، نە دام ودەستگایەکی ئازاد، دەستەلاتی ئەوەی نەبێت کە نوێنەرایەتی ئەو بۆچوونە بکات، لەکاتێکدا هاونیشتمانییەکان هەموو وەك یەك لاوازبن ، وەك یەك هەژاربن، وەك یەك گۆشەگیر بن، هەریەکێ لەمانە لەهەگبەکەیدا تەنیا لاوازییە کەسییەکەی خۆی هەبێت تا لەرێگایەوە دژ بە دەستەلاتە رێکخراوەی دەوڵەت بوەستێتەوە؟[10]**

ئەم حاڵەتە رەچەتەیەکە بۆ سەر هەڵدانی ستەمکاری، ستەمکارییەك کە لەسەر دوو کۆڵەکەوە بەنددەبێ: گۆشەگیرکردنی هاونیشتمانیان و بێ دەستەلات کردنیان. ئەم ستەمکارییە هیچ پێویستی بە بەکارهێنانی هێز نابێت چونکی لەبنەڕەتدا هاونیشتمانیان خۆیان دەستبەرداری مافی بەشداریکردنی دنیای سیاسی و مەدەنی بوون و سەرگەرمی دەست و پەنجە نەرم کردنن لەگەلْ دنیا شەخسییەکەیاندا.

**من هەولْ دەدەم کەریشەکانی خاسیەتە تازەکان بدۆزمەوە کە دەبنە مایەی ئەوە کە ستەمکاری لەجیهاندا سەرهەڵبدا. یەکەم شت کە شوێنی سەرنجدانە بریتییە لەوەی کەژمارەیەکی زۆری ئینسانەکان یەکسان و لەیەك چوو، بەردەوام سەرگەرمی بەدەستهێنانی چێژەبچوکەکان دەبن و ژیانیان لێوان لێو دەکەن لەو چێژانە، هەریەکەیان بەجیا دەژی، غەریبە چارەنووسی هەموو ئەوانەی دی، منداڵەکانی و هاورێکانی لای ئەو بریتین لەهەموو مرۆڤایەتی. هەرچی پەیوەندی بەهاولاتییەکانی دیکەوە هەبێت، ئەو نزیکە لێیانەوە، بەلام ئەو**

**نایانبینێ، ئەو دەستی بەریان دەکەوێت، بەڵام هەستیان پێناکات، ئەو تەنیا لەخۆیداو بۆخۆی دەژی.. لەسەرو ئەم پیاوانەوە دەستەڵاتێکی مەزن وەستاوە کە بەئەرکی خۆی دەزانێ کە قەناعەتی ئەوان مسۆگەر بکاتو ئنجا چاودێری چارەنوسیان بکات.. ئەو دەستەڵاتە موتڵەقە [١١].**

تەنها بەلەبەرچاو گرتنی ئەو خاڵەی سەرەوە دەتوانین لەمەبەستی تۆکیوڤیلێ لەبیرۆکەی "ستەمکاری زۆربە یا زۆرترایەتی" تێبگەینو لەوقسە بەناوبانگەش بگەین کە دەڵێت "ئازادی بیروڕا لەئەمریکادا بوونی نییە" مەبەستی تۆکیوڤیلێ لەبیرۆکەی "ستەمکاری زۆربە "بەدڵنیاییەوە ترس نییە لەدابەش بوونی جڤاتی ئەمریکی بەسەر کەمایەتیو زۆربەدا، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو لەنێو ئەمریکییەکانداو لەئەمریکادا ئیجماعێکی (رێکەوتن) دەبینییەوە. ئەو نەك بەتەنیا یەکسانی مافی سیاسی دەبینیەوە بەڵکو یەکسانی کۆمەڵایەتیش لای ئەو خاڵی بەرچاوبوو. بەڕای تۆکیوڤیلێ یەکسانی بەختیاریو استقراری بۆ ئەمریکییەکان هێناوەتە دی، بەڵام چەند بەرئەنجامێکی درێویشی لەگەڵێ خۆی هێناوەو لەوانە: یەکەم: مەسەلەی یەك بەرگی (uniformity)یەکە بەڕای ئەو وە لەدوای ئەویش تائەمڕۆ شوێنی مشتو مڕی ئەو رۆشنبیرانەی کە خێرێکیان تێدایە نەك عەقڵە بچوکەکان، یەك بەرگی رەهەندێکی بێ تامی ژیانی ئەمریکییە، ئەو پێی وابوو لەئەمریکایەك کۆمەڵە هەیە:

**دەشێ دەوڵەمەندبێ یا هەژار، متواضع یا زیرەك، سەرقاڵی بازرگانی یا کشتوکاڵ، بەڵام لەهەموو شوێنێکی ئەمریکادا لەهەمان توخم دروست بووە، لەهەموو شوێنێك رندەی شارستانێتی یەك بەرگی دەستی بەسەردا کێشاوە. ئەو پیاوەی تۆ لەنیویۆرك (Newyork) بەجێت هێشت تۆجارێکی دی دەیبینیتەوە لەهەمان تەنیایدا،و لەهەمان جل وبەرگدا، هەمان هەڵسو کەوتەوە، هەمان زمانو خوو هەمان چێژ.**

تۆکیوڤیلێ ئەم یەك بەرگییە عەجیبە دەگەڕێنێتەوە بۆ رۆحی یەکسانی کە ئەم رۆحیەتە یەك چەشنەییو یەك بەرگیو یەك رەنگییە تەنانەت بەخشیوەتە خووە ناوەکیەکانی ژیان لەئەمریکا. ئەو یەك بەرگییە لەگەڵێ خۆی زنجیرەیەك هەڵسو

کەوتو کەڵکەڵەی هێناوە کە لەدواجاردا کارێك دەکا کە ئەمریکا ستەمکارییەکی تایبەت بەخۆی بخولقێنێ کە بریتییە لەستەمکاری زۆربە.

هەروەها دەبێت لەیادمان بێت لەبیرۆکەی "ستەمکاری زۆربە"دا مەبەستێك دەربارەی ژمارە، زۆربەی خەڵك، لەئارادا نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ستەمکار لێرەدا هەر هەموو کۆمەڵگایە، کەوەزیفە دەکاو کردار دەنوێنێ بە بێ ئەوەی پێویستی بەیاسای سەرکوتکەرانە هەبێت. ستەمکاری زۆربە کێشەیەکی کلتوریو کۆمەڵایەتیو سیاسییە. سەرکوتکردن لەکۆمەڵگای دیموکراتدا مەرج نییە پێویستی بەدامو دەستگای سیاسی بێت بۆ ئەنجام دانی، خودی کۆمەڵگا بەم کارە هەڵدەستێت. هەروەها لە "ستەمکاری زۆربە" مەبەست لەوە نییە کە زۆربە حوکم دەکاو هەڕەمەکیانە لەئەمریکادا هێز بەکاردەهێنێ، چونکی کۆمەڵگای ئەمریکی بەشێوەیەك پێك هاتووە کە رێگا نادات زۆربەی خەڵك حکومەت بەکاربهێنێ لەپێناو ئامانجەکانی خۆیاندا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگایە جۆرێکە کە تەشویقی جۆرێك لەستەمکاری دەکا. ئەمەش لەرێگای رەخساندنی هەلومەرجێك کە وادەکا بەشداریکردن لەکاروباری سیاسیو حکومیدا بەکارێکی زۆر پێویست نەزانێ.

بەشداری نەکردنیش هەنگاوی یەکەمە بەرەو ستەمکاری. لەکاتێکدا کە یەك بەرگی لەوانەیە ژیانی جڤات مسۆگەر بکا، بەڵام ئەمە وادەکات کە جڤات پشت بەو یەك بەرگیو یەك دەنگیو یەك رەنگییە ببەستێت بۆ مانەوەی، لێرەوە هەموو جیاوازییەك مەرفوزە، هەموو بیردنەوەیەك بۆ دەرباز بوون لەو تەڵەیە "تکفیر"دەکرێ یان فڕێ دەدرێتە پەراوێزەوە. لەکاتێکدا گووم بوونی جیاوازی دەبێتە مایەی هێنانی هارمۆنی بۆ کۆمەڵگا، لەهەمانکاتدا لەناو جڤاتدا ئەو غەریزەیە پەروەردە دەکات، کە بەهیچ شێوەیەك رێگە نەدرێ جیاوازی بنەڕەتی سەر هەڵبدات، بەهیچ شێوەیەك رێگە نەدرێ بەسەرهەڵدانی دیدو بۆچوونو کەسی جیاواز.

یەك بەرگی ئەخلاقی، لەراستیدا، کارێك دەکا کە کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ترسناك تەسامحی لەپلەی سفردایە (zero tolerance) بەرامبەر بەهەمەچەشنەیی، تا ئەو رادەیەی کە کۆمەڵگایەکی دیموکراتی وەك ئەمریکا، کە بیروڕای گشتی رۆڵێکی گەورە دەبینێت، جڤات بتوانێ ئارەزووی بۆیەك بەرگی تێربکا بێئەوەی کە دەستەڵاتو زۆری حکومەت بۆ بەدی هێنانی بەکاربهێنرێت، بەپێچەوانەوە زۆرجار حکومەت رەنگە نەرمو نیانی نیشان بدات بەرامبەر بەهەمە چەشنەیی بەڵام جڤات رازی نابێت.

**دەستەڵاتی ئەخلاقی زۆربە بەشێوەیەکی جزئی پابەندە بەو بۆچوونەوە کە گوایە توانای عەقڵیو حیکمەت وا لەیەکێتی کۆمەڵیٚ ئینساندا زیاتر لەیەك ئینسان، ئەوەی کە ژمارە لەیاسادانەران گرنگترە لەچلۆنایەتی. بەم شێوەیە تیۆری یەکسانی تەنانەت بەسەر عەقڵی ئینسانەکانیشدا دەچەسپیٚ.. هەروەك هەموو دەستەڵاتەکانی دی بگرە لەوانەیە زیاتر لەدەستەڵاتەکانی دی، دەستەڵاتی زۆربە کاتیٚ پێویستە ئاوا دەربکەویٚ کەڕەوایە. لەسەرەتادا ملکەچی دەچەسپێنیٚ لەرێگای زۆرە ملیٚ (اکراه ـ اجبار)یەوەو یاساکان رێزیان لێناگیریٚ تاکو ئەوکاتەی زەمەنێك تێدەپەڕیٚ ئەو سا جێی خۆیان دەگرن.**

زۆربە نەك تەنها داوای ئەوە دەکا لە تاکەکان کە کردارێك بنوێنن، جۆریٚ بیربکەنەوە کە هاوتابێتەوە لەگەڵ زۆربەدا بەڵکو هەوڵ دەدات کە حاڵەتیٚ بخولقێنیٚ، کە هەلومەرجیٚ بهێنێتە ئاراوە کە تیایدا زەحمەت بیٚ بۆ تاکە کەسەکان لە دەرەوەی یەك بەرگی ئەلتەرناتیڤێکی دی بەدی بکەن. بوونی راو بۆچوونێك دەربارەی مەسەلەیەکی گرنگ دژ بەبۆچوونی زۆربە نەك بەتەنها کارێکی حەکیمانە نییەو گونجاونییە بەڵکو بەکارێکی نائینسانی لەقەڵەم دەدریٚ. ئەمەش هەروەك تۆکیوڤیل دەڵیٚ "راستە لەکۆمەڵگایەکی دیموکراتدا، وەك کۆمەڵگای ئەمریکی، کەتیایدا دەستەڵاتی زۆربە هێندە موتڵەقەو رەتنەکراوەیە تاکەکەس دەبێت دەستبەرداری مافەکانی خۆی بێت وەك هاونیشتمانییەك بەپلەیەك کەدەستبەرداری خاسیەتەکانی خۆی بێت وەك ئینسان گەر بیەویٚ لەو هێڵە لابدا کە بۆی دیاری کراوە"(١٣)

ستەمکاری زۆربە بەسەرئەو عەقلانەوە کە خاوەنی توانایەکی عەقڵی جیاوازن کارێك دەکا دیموکراسی تەنیا لەگەڵ میانمایەییو عادی بووندا هەڵ بکات. تۆکیوڤیل زیاتر لەهەمووشت لە "دەستەڵات ئەخلاقی" دەترسا، دەستەڵاتی ئەخلاقی رای گشتی لەئەمریکا، ئەو دەستەڵاتەی کە هەوڵ دەدا هەموو کردارەکانی ئینسانەکان بخاتە یەك چوارچێوەوە، رایەکی گشتی کەدەیەویٚ ئەوەدیاری بکا خەڵکی چۆن هەست بکەن، چۆن بیر بکەنەوە، رەنگە ئەوشتەی کە "رای گشتی" هەوڵی بۆدەدا ببێتە مایەی هێنانەکایەوەی هارمۆنیەك بەڵام بەها گرنگەکەی کە دەدرێت بریتییە

لەستەمكاری بەسەر عـەقڵ و دڵـی هـەمووانـدا، دیـارە سـتـەمكارییەكی اختیـاری. رای گشتی نەك بەتەنها دەتوانیٚ كردارەكان رام بكـا بـەڵكو دەیـەویٚ ئیرادەش رام بكـاو بیخاتە ژێر ركێفی خۆی.

**دەستەڵاتی شادەستەڵاتێكی فیزیكییەو كۆنترۆڵی كرداری ئینسانەكان دەكا بێئەوەی ئیرادەیان لەگەڕ بخات. بەڵام زۆربە ئەو دەستەڵاتەی هەیە كە دەستەلاتێكی فیزیكیو ئەخلاقییە لەهەمان كاتدا كە لەسەر ئیرادە كاردەكا هێندەی كار لەسەر كردارەكان دەكا، نەك هەموو تاقی كردنەوەیەك بەڵكو هەموو موجادەلەیەكیش سەركوت دەكات [١٤].**

لەئـەمریكا سـتـەمكاری لەسـەر عـەقڵ و ئـیرادە سروشـتی ئینسـانەكان دەگـۆڕیٚ بەشێوەیەك، چونكی سـەرچاوەی كۆنـترۆڵ وا دەردەكـەویٚ كـە كـاری تاكـە كەسـە، ئیدی ملكەچ دەبێت بەشێوەیەكی اختیاری. لـێرەوە سـتـەمكاری دەگاتـە قۆنـاغێكی تـازەی كـامڵ بـوون، مـادامێك سـتـەمدیدەو سـەركوتكراوەكان تـەعزیمی سـتـەمكارو ستەمكاری دەكەن و بەسەر سامییەوە لەستەمكارو سەركوتكەرەكان دەڕوانن. ئەگەر بەرێكەوت ئارەزوویان كرد كە یاخی بن، ستەمكارێك پـەیدا ناكـەی لـەهیچ شـوێنێك، هەر ئەندامەی ئـەو جڤاتـە، هـەم سـتـەمكارەو هـەم ستەمدیدە. ئـەو سـتـەمكارییەی دیموكراسی دروستی دەكا لەراستیدا یەك ستەمكاری دیاری كراو نییە تا ببینینـەوە بەڵكو هەر هەموو دەبنە ستەمكار.

ئەم كەڵكەڵانە بۆ ستەمكاری زۆربە كەمترلەكایەی سیاسیدا دەبینرێتەوە، زیـاترو بەپلـەی یەكـەم كێشـەیەكی كۆمەڵایەتییـە. لـەم رووەوە دەبێـت ئامـاژدە بـۆ قسـە بەناوبانگەكەی تۆكیوڤیل بكەین كە دەڵێت:

**من وڵاتێكی دی لەجیهاندا شك نابەم كە تیایدا كەمترین سەربەخۆیی عەقڵ و ئازادی گفتوگۆ هەبێت وەك ئەوەی كە لەئەمریكا دەیبینم.. لەئەمریكا زۆربە تەگەرەیەكی زۆر دەخاتە بەردەم ئازادی بیروڕا، لەنێو ئەم تەگەرانەدا نووسەرێك دەتوانیٚ چی حەزبكا بینوسیٚ، بەڵام واوەیلا بۆ ئەو ئەگەر بیەویٚ لەو ئەگەرانە تێپەڕیٚ.. ژیاننامەی سیاسی بۆ ئەبەد تەواو دەبێت**

**لەبەرئەوەی دەستەڵاتێکی ئیهانەکردوە کە تەنها ئەو دەستەڵاتە دەتوانیٚ ئەو تەگەرانە لاببات.. لەدوا قۆناغدا ناچار دەکریٚ بەخامۆشیو بێدەنگی، وەك ئەوەی کە گوایە پەشیمانە کە لەحەقیقەت دواوە[١٥].**

لەئەمریکا ئازادی گفتوگۆکردنی شکڵی شایەنی قبولٚ کردنەو زۆرباوە چونکی حکومەت هەرگیز مافی بەیان سەرکوت ناکا، بەلاّم لەگەلٚ ئەمەشدا یەك بەرگی عەقڵیو رۆحی ئەمریکی کارێك دەکا کە عەقڵی تاکە کەس بخاتە سەر هەمان ئاوازی گشتیو زهنیەتی سانسۆری تێدا بچێنیٚ.

ستەمکارەکانی پێشوو لەرێگای توندوتیژیو هێزەوە کۆنترۆڵی هەڵسو کەوتی رەعیەتەکانیان دەکرد بەلاّم فیکر یان چۆنیەتیی بیرکردنەوەیان، ئەم بوارەیان بۆ کۆنترۆلٚ نەدەکراو جێیان دەهێشت بۆخەڵکی، بەلاّم دیموکراسی، ستەمکاری بەحاڵەتی کەمال دەگەیەنیٚ، لەم بارەیەوە تۆکیوڤیلٚ دەنوسیٚ:

**لەژێر سایەی دەستەلاّتی موتڵەقی یەك ئینساندا جەستە پەلاماردەدرا تا رۆح تەسلیم ببیٚ، بەلاّم رۆح لەو گورزانە رزگاری دەبوو کە رووبەڕوی دەکرایەوەو بەفەخرەوە هەڵدەستایەوە. ئەمە ئەوریٚو رەسمە نییە کە لەلایەن ستەمکاری لەکۆمارە دیموکراتەکاندا پەیڕەوی دەکریٚ، لەوێدا جەستە بەجیٚ دەهێڵدریٚ تا ئازادبێت ئەوە رۆحە کە دەکرێتە کۆیلە سەرووەر ئیدی نالێ: "تۆ یا وەك من بیردەکەیتەوە یاخود دەمریت" بەڵکو دەڵێ: "تۆ ئازادی چۆن بیردەکەیتەوە،و دەتوانی خاوەنی ژیانی خۆت بیت خاوەنی مومتەلەکاتی خۆت و هەرچیيەك کە هەتە، بەلاّم تۆ لەمەودوا غەریبیت بەو خەڵکەی کە لەناویدا دەژیت، تۆ دەتوانی مافە مەدەنییەکانت بپارێزی بەلاّم ئەوانە زۆر بیٚ سوودە دەبن بۆ تۆ، چونکە تۆ هەرگیز هەڵنابژێردرێیت لەلایەن خەڵکەوە گەر داوای دەنگیان بکەیت.. تۆ لەنێو ئینسانەکاندا دەمێنیتەوە، بەلاّم لەمافەکانی مرۆڤایەتی دادەبڕێیت. هاولاّتیان دوورە**

**پەرێزیت لێدەکەن وەك ئەوەی تۆ تووشی گولی بوویت، تەنانەت ئەوانەشی کە لەو باوەڕەدان تۆ بێگوناهی پشتت تێدەکەن، گەر ئەوانیش بێزیان نەیەتەوە لێت، مَن ژیانم بێ بەخشیتەوە بەڵام بوونێکە زۆر لەمەرگ خراپترە(١٦).**

تۆکیوڤیل لەبەرامبەر ئەم حاڵەتە سیاسیو کلتوریو کۆمەڵایەتییە تازەیەدا هەست بە دەستەوەستانی دەکا لەوەی کە ناوی بنێ چی، ئەوەتا ئەو دەڵێ:

**لەوباوەڕەدام کە جنسی سەرکوتکردن کەلەرێگاوەی میللەتە دیموکراتەکان هەڕەشەدەکەن لەهیچ شتێك ناچێ کە تائێستا لەجیهاندا بوونی هەبووە؛ هاوچەرخەکانمان وێنەی نابیننەوە لەیادەوەریاندا. من بێهودە بەدوای عیبارەتێکدا دەگەڕێم کە ئەو مانایە بگەیەنێ بەدروستی کە من مەبەستمە. ووشە کۆنەکانی وەك ( tyranny despotism )گونجاونین ، ئەو شتە زۆر تازەیە، چونکی ناتوانم ناوی بنێم دەبێ هەوڵ بدەم تەعریفی بکەم(١٧).**

تۆکیوڤیل ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر بەوەی کە رۆژنامەیەك دەتوانێ بیرۆکەیەك لەیەك کاتدا فڕێ بداتە ناو هەزاران عەقڵەوە، لێرەوە ئەو زەنگی مەترسی لێدەدا کە گەر بێتو نەتەوەیەك تەنیا پشت بەیەك یا دوو سەرچاوەی مەعلومات ببەستێ یان شارێك تەنیا یەك رۆژنامەی هەبێت کە هیچ نییە جگە لە بەمەرکەزی کردن، لەم حاڵەتەدا ئازادی بیروڕا دەبێتە وەهم، چونکی لەم سیناریۆیەدا بیروڕا ئازادانە لەلایەن تاکەکانەوە هەڵنابژێردرێن بەڵکو دادەتاشرێن بۆیان لەلایەن ئەو دەستەڵاتانەوە کە ئەمان هیچ کۆنترۆڵێکیان بەسەریاندا نییە، ئەمەش ستەمکارییەکە نەك سلوکی مەدەنی کۆنترۆڵ دەکا بەڵکو بیروڕای تایبەتیو شێوازی بیرکردنەوەش کۆنترۆڵ دەکا. لەم سیناریۆیەدا ناتوانین لەدەستی ئەم ستەمکارییە هەڵبێین بەوەی کە دەرگای ماڵەکانمان دابخەین چونکی ئەوپێش ئێمە لەژوورەوەیە (دەبێ تۆکیوڤیل سەبارەت بە تەلەفزیۆن چی بڵێ!) ئەم ستەمکارییە نوێیە بیروڕا

کەسیەکانیشمان کۆنترۆڵ دەکا، لەهەمان کاتدا وەهمی ئەوەشمان پێدەبەخشێ کە وابزانین ئێمە خاوەنی بیروڕای خۆمانین.

تائێرە ئاماژەمان بۆ چەند پرنسیپێك كرد، لەوانە: گۆشەگیرکردنی هاونیشتمانیان، بێ دەستەڵاتکردنیان، ستەمکاری زۆربە، ئەگەرێکی دی کەستەمکاری نەرمو نیان دروست دەکا بریتییە لە "بەمەرکەزیکردن" واتە خڕکردنەوەی دەستەڵات لەحکومەتی مەکەزیدا. هەر لەسەرتاوە دەبێت بڵێین کە بەمەرکەزی کردن دەبێتە مایەی لەناوبردنی هاونیشتمانێتی (citizenship). لای تۆکیوڤیل بەمەرکەزی کردنی دەستەڵات ئەنجامێکی حەتمیو لۆژیکییە، بەرمەبنای پرنسیپو میکانیزمەکانی دی چۆن؟ گۆشەگیرکردنی تاکە کەسەکان، سەرگەرمی هەر تاکە بەکەڵەکە بوونی سامانو غەرق بوون لەنێو چێژو بەختیارییە بچووکەکانی خۆیدا، کە بەدەوری خۆی دەبێتە مایەی ئاوابوونی خۆری مەدەنی (public)و لێرەشەوە لەناوچوونی جەستەمیانجییەکان، کەواتە ئەوەی دەمێنێتەوە کە لەسیاسەتدا چالاك بێت تەنیا میرییە. لاوازبوونی خێزانو جڤاتەکانو توێژەکان کە ناوچە یا هەرێم (local) پێك دەهێنن، هەموو ئەمانە کارێك دەکەن کە تاکە کەسەکان هەست بەتەنیاییو بێ دەستەڵاتی بکەن، ئیدی چارەیەك نامێنێتەوە بۆ بەدەست هێنانی یارمەتی یا کۆمەك بەتەنیا ئەوە نەبێت کە تاکەکان چاو لەمیری ببڕن (دەوڵەتی ڕەفاه welfare state) نمونەی ئەم حاڵەتەیە کەتیایدا تاك دەست بەرداری سەربەخۆییو ئیرادەی تاکە کەسیو ئازادی خۆی دەبێت تا دەوڵەت بیژێنێت.

**هەروەك لەقۆناغەکانی یەکسانیدا هیچ کەس**
**مەجبور نییە کە کۆمەکی کەس بکا،و هیچ کەسیش**
**مافی نییە تەوەقعی ئەوەبکا کە کۆمەك بکرێ لەلایەن**
**کەسانی دییەوە، هەموو کەس لەیەککاتدا سەربەخۆن و**
**بێ دەستەڵاتیش. ئەم دوو هەلو مەرجەکە نابێت**
**بەجیایی سەیریان بکردرێو ناشبێت تێکەڵ بکرێن.**
**ئەم دووهەلو مەرجە ئیلهام بەهاونیشتمانیانی وڵاتە**
**دیموکراتەکان دەبەخشێ لەگەڵ کەڵکەڵەی دژبەیەك.**
**سەربەخۆبوونی ئەوکارێك دەکا کە ئەو هەستی باوەڕ**
**بەخۆبوونو غرور تێدا بەهێز بێت لەنێوان کەسانی تردا**
**کە وەکو ئەو یەکسانن، لەلایەکی دیکەشەوە بێ**
**توانایی ئەو کارێك دەکا کە ناو بەناو پێویستی**
**بەکۆمەکی دەرەکی هەبێت، کە ناتوانێ لەهیچ کەس**

**ئەو تەوقعەی هەبێت، چونکە هەر هەموو وەك ئەو**
**لاوازن و بێ رەحم لەم حاڵەتەدا سروشتییە کە ئەو چاو**
**لەو دەستەڵاتە ببڕێت کە تەنیا ئەو دەتوانێ بەرزبێتەوە**
**بۆ سەرو ئاستی گەردوونی لاوازی**[١٨] **.**

ئەو کاتەی کە دەوڵەت داوای لێبکردرێت بەردەوام کۆمەکی زیاترو زیاتر بکا، ئیدی لەگەڵ بەخشینی هەر کۆمەکێکدا زیاترو زیاتر گەورەتر دەبێت. لەئەنجامدا ئەم حاڵەتە کارێك دەکات کە ئەندامانی جڤات بەردەوام مافی خۆیان بدەنە یان تەسلیمی دەستەڵاتی مەرکەزی بکەن، دەستەڵاتێك کە وادیارە تەنیا ئەو دەستەڵاتە بتوانێ خەڵکی و مومتەلەکاتەکانیان بپارێزێ.

تۆکیوڤیل ئەوەش لەیادناکا کە بەپیشەسازیکردن (industrialization) هۆیەکی تره بۆ بەمەرکەزی کردنی دەستەڵات، پیشەسازییەکان پێویستیان بەدەست تێوەردانی دەوڵەت هەیە تاکو ڕێکخستنێك بێتەدی. بەتایبەت چینە مانیفا کتۆرییەکان زیاتر داوای دەست تێوەردان و ڕێکخستن دەکەن، لێرەدا سروشتییەکە دەستەڵاتی دەوڵەت زیاتر بێت لەگەڵ زیادبوونی دەستەڵاتی ئەو چینە. بەرئەنجامی ئەم حاڵەتە لەرووی سیاسییەوە دەردناکە، بەشداریکردنە دیموکراتیەکان، کە جەوهەری دیموکراسین، وەلا دەنرێن، حکومەت دەبێتە پاسەوانی ئابووری، نەتەوە دەبێتە ماشێنێك بۆ بەرهەم هێنان. تۆکیوڤیل لەنامەیەکدا دەنووسێ:

**بوغزێکی زۆر، عەشقێکی پڕ هەیەجان،**
**ئومێدەمەزنەکان، قەناعەتی بەهێز هەر هەموو پێویستن**
**بۆ جوڵاندنی عەقڵی مرۆڤ، لەئێستادا، خەڵکی**
**بەتووندی باوەڕیان بەهیچ نییە، عیشقیان بەرامبەر**
**بەهیچ نییە، رقیان لەهیچ نابێتەوە خەون بەهیچەوە**
**نابینن جگە لەسوود وەرگرتن لەبۆرسە**
**(stock exchange)**[١٩] **.**

ئەمەش ئەو ستەمکارییە نوێیەیە کە لەسەر کۆیلایەتییەوە دامەزراوە، کۆیلایەتیەکی "شیرین". ئەم ستەمکارییە لەسەر توندوتیژی دانەمەزراوە بەڵکو لەسەر چێژو خۆشی بینینی ماتریالیستییەوە دامەزراوە. کۆیلایەتییەکە کە چێژ بەخشە. ئەوەش ئەو حاڵەتەیە کە دوای تێپەڕ بوونی سەدساڵ بەسەر نووسینی "دیموکراسی لەئەمریکا" کۆژێف ناوی دەنێت بە "بەئاژەڵی بوونەوەی مرۆڤ"

(re – animalization of man) گۆڕینــی ئینسـان لەبوونـەوەرێکی (کـائن) چـالاكو مێژوو دروستکەرەوە بۆ ئاژەڵێکی قانع. تۆکیوڤیلْ دەنووسێ:

**دەستەڵاتێك لەو جۆرە، خاپوورکاری ناکا، بەڵام رێ لەبوون دەگرێ، ستەمکاری ناکا بەڵام بەکاری پەستاوتن، لاوازکردن، دامرکاندنەوەو ئنجا بە ئەحمەق کردنی خەڵکی هەڵدەستێ، تاکو هەرنەتەوەیەك کورت دەکرێتەوە بۆشتێك کە چاکترنییەو هیچ نییە جگە لەمێ گەلێکی ترسنۆك و کۆمەڵێ ئاژەڵی سەناعی، حاڵەتێك کە تیایدا حکومەت شوانەکەیە.**[٢٠]

رەنگە سیمای سەرەکی ئەم ستەمکارییە نوێیـە بریتـی بێـت لەقسـەکردن بـەناوی ئازادییـەوە، سـتەمکاریْنوێ کۆیلایەتییـەك دروسـت دەكـا لەگـەلْ وەهمـی ئـازادیدا. هەڵبژاردن (انتخابات) میکانیزمێکە کە ئەم وەهمە تۆخ دەکاتەوە، وەهمی ئەوەی کە خەڵك هەست دەکەن کۆنترۆڵیان هەیە بەسەر ژیانی خۆیانو سیاسەتدا.

گەر بیر لەپەیداکردنی چارەسەرێك بکەینەوە بۆ گیروگرفتی دیموکراسی ئـەوا ئـەو چارەسـەرە حەتمـەن دەبێـت لـە نـاوخودی دیموکراسـیدا بـۆی بگـەڕێین، واتـە ئـەو چارەسەرە دەبێـت بگونجێـت لەگـەلْ پرنسـیپەکانی دیموکراسـیدا وەکـو یەکسـانیو ئـازادی. هـەر هـەوڵێك بۆچـاککردنی دیموکراسـی یـا بارگـاوی کردنـی بـە پرنسـیپو پراکتیکێ کە خوازراوبێت لەرژێمێکی ترو غەریب لـەخودی دیموکراسـی بـێ بێگومـان نـەك رووبـەڕوی شکسـت دەبێتـەوە بـەڵکو مەحاڵـە. تۆکیوڤیـلْ انزارمـان دەکـا کـە موهیمەکـە دامەزراندنـەوەی کۆمەڵگایـەکی ئۆرستۆکراسـی نـوێ نییـە، بـەڵکو تاکـە ئەڵتـەرناتیڤ جەغدکردنـە لەسـەر ئـازادیو کردنـی کـارێ کـە ئـازادی لەکۆمـەڵگا دیموکراتییـەکاندا کـاری خـۆی بکـاو ئنجـا کردنـی کـارێ تـاکو "جنسـی گـەورەییو بەختیاری" بگونجێ لەگەلْ یەکسانیدا.

گەر تاکگەرایی لێپرسراوبێت لەئەتۆمیزمی کۆمەڵگای دیموکرات، ئەوە ئازادییە کە دەتوانێ جارێکی دی جەغدبکاتەوە سەر مانای پشت بەسـتنو ئیعتمـاد کردنـە سـەر یـەکتری سیاسـی (political interdependency) لـەرێگای بڵاوکردنـەوەی ئـەو هۆشیارییەی کە هەر هاونیشتمانییە پشت بە ئەوی دیکـە دەبەسـتێت بـۆ پاراسـتنی ئازادیو کەرامەتی ئینسانی خۆی. حەماسەتی سروشتی بۆ ئازادی دەبێت مووتوربـە بکردرێت لەرێگای هونەری سیاسییەوە.

بەڕای تۆکیوڤیلّ، داموو دەستگای ئازاد، بەتایبەت ئەوانەی کە لەسەر ئاستی هەرێم (local) هەن، بڵاوکراوەی ئازاد، مەحکەمەی سەربەخۆ، بەشداری بوونی هەمیشەیی لەکاروباری (public جڤات) کە هەر هەموو هونەری سیاسی پێك دەهێنن دەتوانن تاکە کەس خودپەرست بکەنە هاونیشتمانی، هاونیشتمانییەك کە یەکەم غەمی چاکەی مەدەنیو گشتییە. لەنێو هەموو ئامرازە دیموکراتییەکاندا، ئازادی کۆڕو کۆبوونەوەو کۆمەڵ دروستکردن پرنسیپێکە کە دیموکراسی لەو ئەگەری بەستەمکاری بوونە رزگار دەکات. تۆکیوڤیلّ لەوباوەڕەدایە کە کۆمەڵەکان (ASSOCIATIONS) مافەکانی کەمایەتییەکان لەدیموکراسیدا دەپارێزن دژ بەهەڕەشەی ستەمکاری زۆربە. مادامێك هەرتاکەکەسە لەدیموکراسیدا سەربەخۆیەو لەهەمان کاتیشدا لاواز، تەنیا لەرێگای خۆ تێکەڵ کردنییەوەو بوونی بەئەندام لەکۆمەڵەیەکدا یان چەند کۆمەڵەیەکدا ئەو دەتوانێ رای خۆی دەربڕێو لەسەر رای زۆربە موجادەلە بکات. کۆمەڵەکان جەوهەرین بۆچاك ـــ بوونو بەختەوەری ئینسانەکان لەکۆمەڵگای دیموکراتدا، لەنێو ئەم کۆمەڵانەدا تاکە کەسەکان فێردەبن چۆن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئامانجی هاوبەشدا، بەشداریکردن لەگروپی سیاسیدا (حەتمەن تەنها مەبەست لەحیزب نییە)، دەبێتە مایەی گەشەکردنی زەوقو سەلیقە بۆ خۆتێقورداندن لەئامانجە سیاسییەکان، فەرهەنگییەکان،و پەروەردەییەکان. بەواتایەکی تر فێربوونی چۆن تێکەڵ ببیت هەنگاوی یەکەمە بۆ پاراستنی شارستانێتی.

خەڵکێك کە لەناویاندا تاکە کەسەکان دەستەڵاتی بەدەست هێنانی کاری مەزنیان لەدەستدابێ، هەریەکە لای خۆیەوە، بێ ئەوەی ئەو ئامرازە لەئارادا بێت کە لێوەی کە بەکۆمەڵ ئەو کارە مەزنانە بەدەست بهێنن، ئەو خەڵکە هەر زۆر زوو شۆڕدەبێتەوە بۆ ناو بەربەریزم[٢١].

# بەندی شەشەم:

## ئایدیۆلۆژیا هەڵگری تۆوی ستەمکاری

### "تەفسیکرێکی هانا ئارێنتی بۆ تۆتالیتاریانیزم"

**پێشەکی:**

چیرۆکی تۆتالیتاریانیزم، وەك ئەوەی هانائارێنت لێی تێگەیشتووە، ئەزموونێکی سیاسی نوێی بەیانکرد لەبەرئەوە تێگەیشتنی تازەشی گەرەك بوو. هەروەك ئەو دەڵێ، کرداری نوێنراوو تاوانەکانی رژێمە تۆتالیتاریەکان "ئەو ئەڵتەرناتیڤەی هەڵوەشاندەوە کە هەموو پێناسەکانی جەوهەری حکومەتەکانی لەفەلسەفەی سیاسیدا لەسەر بیناکرابوو، واتە ئەڵتەرناتیڤی لەنێوان حکومەتی یاساو حکومەتی لەیاسابەدەر، یا بێ یاسا لەنێوان دەستەڵاتی هەڕەمەکیو دەستەڵاتی رەوا"[1].

ئارێنت هەوڵیدەدا کە بەڵگە بۆ ئەو بۆچوونانەی خۆی بهێنێتەوە لەلێکۆڵینەوەکەیدا لەسەر تۆتالیتاریانیزم (الكليانيه، الشمولية) لەکتێبی، ئەسڵەکانی توتالیتاریانیزم،دا ئارێنت بەدوو ئەرکەوە سەرگەرمە، یەکەم/ دروستکردنی کاتەلۆگێ، فەهرەستێ بۆ خاسیەتە تایبەتەکانی فەرمانڕەوایەتی تۆتالیتاری؛ دووەم/ بەخشینی یان دانەدەستی وێنەیەك لەمەڕ ریشە فەرهەنگیو عەقڵییەکانی ئەم شێوەیە لەرێکخراوی سیاسیو رێکخستنی سیاسی. وێڕای یەکنەگرتنەوەی ئارێنت بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ مێژوو نووسەکان کە پەیوەندی سەبەبی (causal) دەبیننەوە لەنێوان رووداوەکانی رابردوو لەگەڵ رووداوەکانی ئێستادا، بەشێکی زۆری کتێبی ئەسڵەکان، تەرخانە بۆ بەستنەوەی تۆتالیتاریانیزم بەگەشەکردنەکانی پێشووەوە لەوانە بۆ نمونە گەشەکردنی ئەنتی - سیمیتیێزم (دژایەتی - سامی)، ناسیۆنالیزم، رەگەز پەرستی،و ئیمپریالیزم لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەو نۆزدەدا. ئەو موهتەم بوو بە مەغزاو مانای تۆتالیتاریانیزم وەك رووداوێکی مێژوویی. دەیویست لەوە تێبگات کەچی رویدا لەئەڵمانیاو لەیەکێتی سۆڤیەتداو ئەوشتە یاشتانە چی بوون کە رێگایاندا تۆتالیتاریانیزم لەم دوو وڵاتە سەرهەڵبدەن، لەکتێبی ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزمدا ئەو دەیەوێت بزانێ "چی رویدا؟ بۆ رویدا؟ چۆن توانرا کە رویدا؟".

تۆتالیتاریانیزم، بۆ ئارێنت، تەنیا دیاردەیەکی سیاسی نوێ نەبوو،و رژێمە تۆتالیتاریەکان تەنیا شێوەی تازەی دەوڵەت نەبوون تاکو بیانخەینە سەر لیستی دیکتاتۆریو ستەمکارییەکان. تۆتالیتاریانیزم زریانێك بوو لەژیانی خۆرئاوادا،

نیشانەیەك بوو لەمەڕ كۆدەتای جەماوەر (masses)و سەرەولێژبوونەوەی كۆمەڵگای جەماوەری، ماندوبونی سەرجەم كلتورێكی سیاسیو كۆمەڵایەتی.

هەرچەندە كتێبی "ئەسڵەكانی تۆتالیتاریانیزم" جەغدكردنە لەهەوڵدان بۆ تەفسیركردنو تێگەیشتن لەسەرهەڵدانی هەردوو رژێمی هیتلەرو ستالین، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم كتێبە هەر زۆر زوو بوە كتێبێكی كلاسیكو كاریگەری خۆی لەسەر ئەو كەسانە دانا كە لەهەوڵداندا بوون بۆ پێناسەكردنی چەمكی تۆتالیتاریانیزم بەنیازی بەراوردكاریو تێگەیشتن لەرژێمەكانی دی كە نزیك بوونو نزیكن لەو دوو رژێمەوە. ئەم كتێبە بووە كتێبێكی سەرەكی لەو بوارەدا. ئەمە لەكاتێكدا كە تەنیا لەبەشی سێیەمدا ئارێنت لەوە دەدوێ كە تۆتالیتاریانیزمی چییەو ئەو خاسیەتانەی رژێمە تۆتالیترییەكان كامانەن. دوو بەشەكەی دی باس لەئەركیۆلۆژیای ئەو ئایدیاو گریمانكاریانە دەكا كە ریشەكانی تۆتالیتاریانیزم پێك دەهێنن، لەوانە رەگەز پەرستیو ئیمپریالیزم.

بەڵام پێش ئەوەی كە باس لەو بەشەی كتێبی "ئەسڵەكانی تۆتالیتاریانیزم" بكەین كە لەچەمكی تۆتالیتاریانیزم دەدوێ، پێویستە سەرنجێكی خێرا لەكتێبێكی تری هەرە گرنگی ئارێنت بدەین بەناوی (هەلو مەرجی ئینسان ـ The Human Condition) چونكە لەم كتێبەدایە كە ئێمە زیاتر ئاشنادەبین بە بۆچوونی ئەو دەربارەی فینۆمینۆلۆژیای چالاكییەكانی مرۆڤ،و فەلسەفەی سیاسی ئەو، ئنجا ئەو چەمكانەش كە ئارێنت لەم كتێبەدا دەیانخاتە روو كۆمەكمان دەكەن كە لەكێشەی تۆتالیتاریانیزم بگەین. دەبێت ئەوەبڵێم كە ئەوكتێبە كورت ناكرێتەوەو هەر هەوڵێكیش بۆ كورت كردنەوەی كارێكی نابەجێیە، من تا ئەو شوێنەی كە پەیوەندی بەباسەكەمانەوە هەبێت ئاماژە بۆ یەك دوو لایەنی ئەو كتێبەو چەند چەمكێكی ئەو كتێبە دەكەم.

ئارێنت لەجیاتی قسەكردن لەسەر سروشتی یا جەوهەری ئینسان لە "هەلو مەرجی ئینسان"دەدوێ. ئەم دووشتەش زۆر لەیەك جیاوازن. مەبەست لە "هەلو مەرجی ئینسان" بریتییە لەكۆی چالاكییەكانی ئینسانو تواناكانی ئینسان. هەلومەرجی ئینسان شایانی زانینەو پێناسەكردن لەبەرئەوەی پێكهاتووە لە تواناكانو كارەكانو خاسیەتەكان كە ئینسانەكان پێكەوە چاندویانە، هێناویانەتە بەرهەم بۆ دروستكردنی بوونێكی ئینسانی. لێرەوە هەرشتێ بێتە ناو دنیای ئینسانەوە لەرێگای هەولو كۆششەوە دەبێتە بەشێك لەهەلومەرجی ئینسان. بەمانایەكی دی، هەلو مەرجی ئینسانی، بەپێچەوانەی سروشتی ئینسانەوە، شتێك نییە هەولبدا تاخۆی لەرێگای جەوهەرێكی نەگۆڕەوە پێناسەبكا. هەلومەرجی

ئینسان کۆی سەرجەم چالاکییەکانی ئینسانە کە ژینگەی ئینسان دروست دەکەن. مێژوو، لەراستیدا، باشترین بەڵگەی کۆنکرێتییە بۆ توانای ئینسان لەدروستکردنی جیهاندا. دروستکردنی جیهان دەشێ بدرێتە پاڵ چەند توانایەك، لەوانە کە ئارێنت جەغدیان لەسەر دەکات ئەمانەن: رەنج (labour)، کار (work)،و کردار (action)[٢].

کەواتە ئارێنت جەغد دەکاتە سەر سێ توانای ئینسان: رەنج (ئەرك)و کاروکردار. بیرکردنەوە بەهەمان شێوە بەشێکی دانەبڕاوە لەهەلومەرجی ئینسان، بەڵام ئارێنت ئەوە هەڵدەبژێرێ کە لەباسەکەی بیرکردنەوە بخاتە دەرەوە، لەجیاتی ئەوە جەغد دەکاتە سەر ئەوشتەی کە ئەو ناوی دەبا بە (vita activa) کە توخمە سەرەکییەکانی بریتین لەرەنج (ئەرك‌و) کارو کردار. لێرەدا ئارێنت داموودەستگای چەمکی (conceptual apparatus) ئەرستۆتالیستی بەکاردەهێنێ بۆ نیشاندانی مەبەستەکەی خۆی. گونجاندنی چەمکە ئەرستۆییەکان‌و دابەشکردنە ئەرستۆییەکان بونیادی تیۆرییەکەی ئارێنت لەمەڕ کردارەوە پێك دەهێنن، چوارچێوەی داڕشتنی (vita activa). لێرەوە کاریگەری ئەرستۆکلیلێکە بۆتێگەیشتن لە هەوڵی ئارێنتی بۆ کرداری سیاسی رووت (pure). کەواتە پێویستە چەند سەرنجێك بدەینە ئەرستۆ.

لەکتێبی "سیاسەت"دا ئەرستۆ جیاوازی دەخاتە نێوان مەملەکەتی مەدەنی‌و گشتی (public )و مەملەکەتی تایبەت یا شەخسی (private)، جیاوازی نێوان چالاکییەکان‌و پەیوەندیەکانی کە گونجاون بۆ هەریەکێکیان، مەملەکەتی تایبەتی خێزان (oikia) ئابووری‌و چالاکییەکانی بەرهەمهێنان لەخۆدەگرێ کە ئامانجی پاراستنی ژیان خۆیەتی[٣]. مەملەکەتی خێزان، تایبەت، کە کارێك دەکا ژیانی ماتەریاڵی مسۆگەرو شیاوبێت، پێچەوانەی مەملەکەتی سیاسییە، (polis) واتە شار کە کارێك دەکا ئەوشتەی ئەرستۆ پێی دەڵێ "ژیانی چاك" شیاوو مسۆگەر بێت. ژیانی چاك بریتییە لەژیان‌و کرداری عادل‌و نەجیب، فەزیلەتی ئەخلاقی‌و عەقڵی. کۆمەڵەی سیاسی کارێك دەکا کە ئەو ژیانە شیاوو مسۆگەر بێت لەرێگای دابینکردنی ئازادی‌و یەکسانییەوە بۆ ئەندامەکانی. تەنیا لەرێگای بوون بەئەندامی جڤاتەوەیە کە کەس توانا ئەخلاقی‌و عەقڵییەکانی گەشە پێدەداو تەنیا لەم رێگایەشەوە کە بەماناو وشە دەبێتە ئینسان. تاکەکەس پێویستە کە رۆژانە لەگەڵ هاونیشتمانییەکانی تردا لەگفتوگۆدابێت سەبارەت بەو کێشانەی کە مەغزاکانیان لەودیو مەسەلەی ئامراز تێرکردنی ئەم یا ئەو پێویستییەوەیە، گەر ئەو بیەوێ تواناکانی بۆ عەقڵاندن‌و گوتارو عەدالەت پەرەپێ بدا ئەو دەرگیرییە لەگەڵ کەسانی دی جەوهەرییە. بەڵێ تەنیا لەدەرگیری‌و تێکەڵ بوون‌و گفتوگۆی سیاسیانەدایە کە تواناکانی هەڵبژاردن، حوکم (judgment)،و کردار گەشەدەکەن‌و مەشقیان پێدەکرێ، تەنیا لەم

مەملەکەتەشدایە کـە ئـازادی بەشـێوەیەکی کۆنکرێتـی دێتـەدی، بـەبێ شـارو بـواری مەدەنی تاکە کەس ناتوانێ ئازادی ئینسان بناسێ و تامی ئەو ئازادییە بکات.

ئامانجـەکانی خـێزان و کۆمەڵـەی سیاسـی، لای ئەرسـتۆ جیـاوازن بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشدا پێکەوە گرێدراون. ئەرستۆ پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوان ئەم دووکایەیەدا دەدۆزێتەوە: خێزان دەبێت وەك هۆکارێك سەیر بکرێ، ئنجا مەرجێکیش، بـۆ بوونـی شار. ئەرستۆ ئەم پەیوەندییە لـەناو مەسـەلەیەکی ئامـانجدارێتیدا ( teleological — تیلۆلۆجی)دادەرێـژێ، ئـەو کاتـەی دەڵێـن هـەموو شـێوە پێـش سیاسـییەکان وەکـو خێزان و قەبیلەو لادێ ئامانجە سروشتییەکانیان دا لەناو شاردا، یا چاو لەشار دەبڕن بۆ کامڵ بوون.

لەپرۆسەی سروشتی گەشەکردنی ئینساندا شار یـان مەملەکـەتی سیاسـی رەنگـە دواهەمین بێت لەزنجیرەی هەبوون - Becoming - دا

کتێبەکەی ئارێنت "هەلومـەرجی ئینسـان" بـە لەبـەرچاوگرتنی ئـەو جیاوازییـەی نێوان خێزان و شار دەست پێدەکات کە بەڕای ئـارێنت بنـەمای هـەموو جیاوازییـەکی گرنگە لەنێوان بواری مەدەنی و گشتی (public) و بواری تایبەتیدا (private). وانەیـەك کەدەشێ لەیۆنانی کۆن و لەیۆنانییەکانەوە فێربین ئەوەیە کە جیاوازی نێوان بـواری مەدەنی و بـواری تایبـەتی موقـابیلی ئـەو جیاوازییـە لـەنێوان ئـازادی و ناچـاری یا پێویستیدا. ئینسانەکان لەرێگای پێداویستییەکانیانەوە بە مەملەکەتی خێزان و بگرە ژیانەوە بەستراونەتەوە. لێرەوە جڤـاتی خـێزان لەئـەنجامی ناچـاریدا لـەدایك بـووە، ناچـاریی حوکـم بەسـەر چالاکییـەکانیدا دەکـا[٤]. لـەموقابیلدا شـار (The polis)، مەملەکەتی ئازادییەو گەر پەیوەندییەکیش هەبێت لەنێوان ئەم دوو بوارەدا، ئەوا ئەو پەیوەندییە کە "کۆنترۆڵ کردن و هێنانـە ژێـر رکێفـی پێویسـتییەکانی خـێزان هـەل و مەرج بووە بۆ ئازادی شار". خێزان یا بوونی شەخسـی (تایبـەتی) کـارێك دەکـا کـە سیاسەت شیاوو مسۆگەربێت، کەواتە لەخزمەتی سیاسەتدایە، نەك بەپێچەوانەوە.

تێگەیشتنی یۆنانی، و لێرەدا بەتایبەت ئەرستۆیی، ئەوەمان لێ قەدەغە دەکا کەوا سەیری رێکخستنی سیاسی بکـەین وەك ئـامرازێك بـۆ رێکخسـتنی کۆمەڵایـەتی، وەك ئەوەی کە سیاسەت غەمی سەرەکی بریتی بێـت لەپاراسـتنی ژیـان وەك ئـەوەی لای هوبز دەیبینینەوە، وەك ئەوەی کاری سیاسەت پاراستنی مۆڵکداری و موڵك بـێ وەك ئـەوەی کـەلای جـۆن لـۆك دەیبینینـەوە، وەك ئـەوەی کـاری سیاسـەت بریـتی بێـت لەتەشـویقکردن و هـەوڵدان بـۆ بـەختیاری هـەمووان وەك ئـەوەی لای میـل (Mill) دەیبینینەوە.

ئارێنت بەرمەبنای تێگەیشتنە یۆنانییەکە لەو باوەڕەدایە کە سیاسەت خۆی ئامانجە نەك ئامراز یا هۆکار. بۆ ئەم مەبەستە جیاوازیو هەرەمی مەدەنیو تایبەتی دەبێت بەهەر شێوەیەك بووە بپارێزرێ. ئەمە لەکاتێکدا ئەم جیاوازییە کە هەرەشەی لێدەکرێ لەلایەن ئەوشتەوە کە ئارێنت ناوی دەبا بە "سەرهەڵدانی مۆدێرنانەی کۆمەڵایەتی" دیاردەیەك کە ریشە جینیالۆجییەکانی دەشێ لەنێو بێ بەهاکردنی (vita activa)ی مەسیحیەتو بیردا بدۆزینەوە.

جڤاتی ئینسانی رۆژ بەرۆژ لەنێو قەوارە کۆمەڵایەتیەکاندا توند دەکرێن، واتە مەملەکەتی خێزان، تایبەتی، چالاکییەکانی، گیروگرفتەکانی، ئامرەزەکانی، مەکرەکانی، لەسەرخۆ دزە دەکەنە ناو بواری مەدەنیو گشتییەوە. بەرئەنجامی ئەم سەرهەڵدانی کۆمەڵایەتییە ئەوەیە کە ئێمەی مۆدێرن دەستەوەستانین لەوەی کە بەشێوەیەکی گونجاوو لەبار جیاوازی بخەینە نێو بواری مەدەنیو گشتی لەلایەكو بواری تایبەتی لەلایەکی دیکەوە. لەنێوان کایەی سیاسیو کایەی پێش سیاسی، ئیدی وەك ئارێنت دەڵێ ئێمە "جەستەی خەڵکەکانو جڤاتە سیاسییەکان وەك وێنەی خێزانێك دەبینینەوە کە کاروباری رۆژانەی دەبێت لەلایەن ئیدارە داموو دەستگایەکی گەورەی نەتەوەیی بۆ رێکخستنی خێزان ئیدارەو بکردرێت"[٥].

کۆمەڵگا ئەوکاتە سەرهەڵدەدا کە چالاکییەکانی خێزان دەبنە بابەتی غەمی گشتی. سەرهەڵدانی رێکخستنی کاروباری ناوماڵیو گیروگرفتەکانی، چالاکییەکانیو گواستنەوەیان لەحاڵەتی کێشەی خێزان بۆ بوونیان بە بەشێك لەبواری گشتی نەك سنوورەکۆنەکانی نێوان تایبەتیو گشتیو سیاسی هەڵوەشان، وەك ئارێنت دەڵێ، بەڵکو مانای دوو زاراوەشی بۆ هەمیشەیی گۆڕی، ژیانی تاکە کەسو هاونیشتمانی بوون. هاونیشتمانی جێی لەلایەن فەرمانبەرەکانەوە گیرایەوەو سیاسەت لەم حاڵەتەدا ئیدی دەبێتە خزمەتکاری پاراستنی کۆمەڵگا، جا ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگای ئیماندارەکان بێت وەك ئەوەی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوون، یا کۆمەڵگای خاوەن موڵکەکان وەك ئەوەی لای لۆك دەیبینینەوە،یا کۆمەڵگایەك کە هەمیشە سەرگەرمی پرۆسەی بەدەست هێنانە وەك کۆمەڵگای هۆبز، یا کۆمەڵگای بەرهەمێنەرەکان وەك ئەوەی مارکس وێنای دەکردو یاخود کۆمەڵگای بەکارەکان، خاوەن وەزیفەکان وەکو کۆمەڵگای هاوچەرخی خۆرئاوا، هیچ فەرقێك ناکات، ئەوشتەی کە هاوبەشە لەنێوان وەسفی ئەو کۆمەڵگا یانەدا، بەڕای ئارێنت، بریتییە لەو راستییەی کە لەهەموو ئەوشێوانەدا، ئازادی بواری مەدەنی بۆتە گروگان (رەهینە)، ئازادی قوربانییە سەرەکییەکەیە، ئەو کاتەی سیاسەت دەکرێتە قوربانی بەرژەوەندی باڵادەست، ئەو کۆمەڵگایە ستەم دەکا بەرامبەر بەسیاسەت.

دوو چەمكی دیكەی ئەرستۆ كەلای ئارێنت سەرەكین بریتییە لەو جیاوازییەی كە ئەرستۆ دەیخاتە نێوان عەمەلی (praxis ـ كردار)و چالاكی بەرهەمهێن (poiesis). جیاوازی نێوان چالاكی بەرهەمهێن‌و كرداری بەرهەمهێنان لەم خاڵەدایە: چالاكی بەرهەمهێن ئەو چالاكی‌یەیە كەچاو لەبەدەست هێنانی بەرئەنجامێك دەبڕێ، بۆ نمونە، ساختمانێك كە لەلایەن ئەندازیاری میعمارییەوە دروستدەكرێ، چالاكی بەرهەمهێنی ئەندازیارەكە خۆی لەدوابەرئەنجامدا دەبینێتەوە كە تەواو بوونی ساختمانەكەیە، ساختمانەكە ئامانجەكەیە، كەواتە بەرهەمهێنان ئامانجێكی هەیە لەدەرەوەی خۆی. بەڵام پراكسیس یا كردار بەپێچەوانەوەیە. بەڕای ئەرستۆ كرداری چاك خۆی لەخۆیدا ئامانجە، هۆكارنییە بۆ ئامانجێكی دی. هەر ئەم خاسیەتە دەروونییەی پراكسیسی‌و سروشتە ناتەواوەكەی بەرهەمهێنان (poiesis) بوو كەوای كرد ئەرستۆبڵێ "پراكسیس (كردار) بریتی نییە لە بەرهەم هێنان‌و بەرهەمهێنانیش كردار نییە"[٦].

لەكتێبی "هەل‌ومەرجی ئینسان"دا جیاوازی نێوان كردارو دروستكردن (- praxis poiesis) موتڵەقەن مەركەزی ترین خاڵی بەرچاوە. لۆژیكی بەرهەمهێنان زەمینە خۆش دەكات بۆ تێگەیشتن، بۆ بەیانكردن، شتەكان ئەوكاتە مانایان هەیە یا وەك ئامراز یا وەك ئامانج. لەگەڵ ئەم بەئامرازی كردنە (Instrumen talization)ی جیهاندا، بەڕای ئارێنت، بەكەڵكی‌و بەكارهێنان (utility) وەك دوو ستاندارد، داوپێنك خۆیان دەچەسپێنن چ لەژیانداو چ لەجیهانی ئینسانەكاندا. لێرەوە هەموو شتەكان لەدواجاردا لەبەهایان كەم دەكرێتەوەو كورت دەكرێنەوە بۆ بوون بەئامراز، هۆكار، بەم شێوەیە هەر بەهایەكی سەربەخۆ یا مانایەكی جەوهەری تریان هەبێت لەدەستی دەدەن. یەكەمین ئەنجامیش ئەوەیە كە هیچ چالاكییەك، بەدڵنیاییەوە هیچ چالاكییەكی سیاسی، ناتوانرێ واسەیری بكردرێت كە سەربەخۆیەو ئامانج‌و بەهاكەی وا لەناو خۆیدا.

كرداری سیاسی كە خۆی لەخۆیدا ئامانجە، دەبێتە ئامراز بۆ بەدەست هێنانی كەڵكێكی دی. لێرەوە سیاسەت دەبێتە خزمەتكاری ئەو سەرەوەرانەی كە لەبنەڕەتدا لەخوار ئەوەوەن وەكو ئابوری. لەو سیناریۆیەدا بەرهەمهێنان (poiesis ) دەبێتە پارادایم، مۆدێلی چالاكی ئازادانە، ئیدی كرادرو دروستكردن بەسەریەكدا دەشێوێنرێن. كە دروستكردنیش تێكەڵ بەكردار كرا، هەنگاوێك لەمەبەولاوە دەشێ ئەم مۆدیلە هۆكارو ئامانج‌و دەستەڵاتی ئەو كاتیگۆرییە درێژ بكاتەوە تاكو بواری مەدەنی‌و سیاسەتیش بگرێتەوە. بەم شێوەیە زەیینی دروستكردن بواری گشتی‌و مەدەنی داگیردەكات تا ئەو شوێنەی كە هەرهەموو بێ ئاگایانە وا مەسەلەكە دەبینن

کە کردار (praxis) بگرە زیاتر لەدروست کردن لەلایەن کاتیگۆری هۆکـارو ئامانجـەوە (means and ends) دیاری دەکریّ.

بابگەڕێینەوە سەر چەمکەکانی رەنج (labour)و کار (work). بەڕای ئارێنت، رەنج ئەو بەشەی ژیانی ئینسان دەگرێتەوە کە تەرخانە بۆ مانـەوەو بەرهەمهێنانـەوە، بۆ تێرکردنی پێویستییە بایۆلۆژییەکان کە پێویستن بـۆ مانـەوەی تاکـە کـەس و جنسـی بەشەری. لـەموقابل چـالاکی کـاردا (work) کـە لەسـەر سروشـتەوە کـار دەکـا تـاکو جیهانی ئینسان دروستبکرێت، رەنج بەتەواوی بەشێکە لەرێکخستنی سروشت. لەنێو چالاکییەکانی ئینساندا رەنج کەمتر شوێنی ئارەزووە، رەنج بەڕای ئارێنت بریتییە لە "تاریکی بوون"، یاخود ئازاری زیندوو بوون. مـادامێك رەنـج هەل‌ومـەرجێکی دراوی (given)بوونـی ئینسـانییە، هەڵەیـەکی گەورەیـە کـە بـیر لـەریفۆرمی سیاسـییانە بکەینەوە دەربارەی ئەم چالاکییە. هەربۆیەشە ئارێنت رەخنە لەمارکس دەگریّ لـەو خاڵەدا کە مارکس رەنج‌و چالاکی ئیشی کردبوە بناغە بۆ تیۆرییەکەی لەمەڕ رزگـاری ئینسانەوە.

لای ئارێنت پرۆسەی رەنج هەمیشە دووبارەبوەوەی بەرهەمـهێنان‌و بەکارهێنانـە، کە لەجەوهەردا پرۆسەیەکە بەدوور لەداهێنان چونکـی ئەوشـتەی بەرهـەم دەهێـنریّ خاوەنی بوونێکی زۆر تەمـەن کورتـە، واتـە مـادامێك بەکارهێنانی مسۆگەرە، رەنـج ئینسـانەکان لـەناو سروشـتدا دەتوێنێتـەوە،و سروشـتیش ئـەو مەملەکەتەیـە کـە سـەرەتاو کۆتـایی رەسـەنی نییـە. لـە "هەل‌ومـەرجی ئینسـان"دا لاپـەڕە (٩٨)دا دەخوێنینەوە:

**هەموو ئەو چالاکییانەی ئینسان کە لەناچارییەوە**
**سەرهەڵبدەن، مامەڵەکردن لەتەکیاندا بەناچاری**
**مامەڵەکردنە لەگەڵ دووبارەبوونەوەی سووڕی سروشت.**
**ئەمانەش خۆیان لەخۆیاندا سەرەتاو کۆتاییان نییە؛**
**بەپێچەوانەی کارکردنەوە (work) کە کۆتاییەکەی ئەو**
**کاتەدیّ کەبابەتەکە تەواو دەبێت‌و ئامادەدەبێت**
**تابخرێتە سەر جیهانی شتەکان، رەنج هەمیشە لەیەك**
**بازنەدا دەخولێتەوە کە لەلایەن پرۆسەی بایۆلۆژی**
**ئۆرگانیزمی زیندووەوە دیاری کراوە، کۆتاییەکەشی**
**ئەوکاتە دیّ کاتێك ئەو ئۆرگانیزمە بمریّ.**

ئارێنت پۆرترەیتێکمان بۆ دەکێشێ لەمەڕ کۆمەڵگا دیموکراتییە خۆرئاواییەکان وەك کۆمەڵگای رەنجدەرەکان. کۆمەڵگایەك کە لەرێگای بەرخۆری (استهلاك ـــ Consumerism)و رێز نەگرتن بۆ ترادسیۆن و کولتور، بێهودەیی ئەم ئاژەڵە رەنجدەرەمان بۆ دەخاتە روو. رەنجدان بۆ مەبەستی تێربون و ئنجا بەکارهێنانی بەرهەمی بەرهەم هاتوو ئنجا جارێکی دی رەنج.. تەنها شتێکی نوێ دروستکردنی ئەو ئارەزوە تازانەن بۆ شمەکی تازە دروست بوو کە خۆیان لەبنەڕەتدا هەر پێویستنین.. بەسەیرکردنی غەمە سەرەکییەکانی ئینسانی مۆدێرن، بەدەستهێنان، رەفاهی کۆمەڵایەتی، و هتد، دەتوانین بگەینە ئەو بەرئەنجامەی، هەروەك چۆن ئارێنت گەیشت، کە ئینسانەکان و هەر هەمووومان، ئیدی نازانین چۆن کرداری نەجیب لەکرداری حەقیر جیابکەینەوە، جوانی لەناشرینی جیابکەینەوە، حەکیم لەجادوگەر، جاهل لەمنەوەر، سیاسەتمەداری راستەقینە لەدیماگۆگو درۆزن.. هتد. ئارێنت دەڵێ:

**هەتا ئەو کاتەی ئەم ئاژەڵە رەنجدەرە دەست بەسەر بواری گشتی (مەدەنی)دا بگرێ بواری مەدەنی حەقیقی وجودی نابێت. بەڵکو تەنیا چالاکییە شەخسییەکان کەلە فەزایەکی کراوەدا نیشان دەدرێن.**[٧]

بەم شێوەیە رەنج ئاژەڵیترین چالاکی ئینسانە،و کار ئازادترین چالاکی ئینسانە. کار (work) بەپێچەوانەی رەنجەوە چالاکییەکی تایبەتی ئینسانە، خاسیەتی سەرەکی کار بریتییە لە هەبوونی ئامانج، هەرکارێك چاو لەداهێنانی بەرهەمێکی تەمەن درێژ دەخایەنێت، لەبەرئەوە ئاراستەو رێنومایی لەخۆدەگرێ، کارشتەکان دادەهێنێ، لەئامرازەوە بۆ هونەر. پرۆسەی دروستکردن خۆی لەلایەن کاتیگۆرییەکانی هۆکارو ئامانجە وە دیاری دەکرێ. بەدەستهێنانی، بەرئەنجامێك، ئامانجێك، کار لەپرۆسەی بازنە ئاسای ئیش جیادەکاتەوە. زیاتر لەمە، ئەوەی کە کار لەرەنج (ئیش) جیادەکاتەوە بریتییە لەساپاندنی کارەکتەری ئامانج کە بەدەستی دەهێنێ بەسەر پرۆسەکەدا. بۆ نمونە، ئەم ئامانجە، دروستکردنی مێزێك، لەلایەن سروشتەوە دیاری ناکرێت بەڵکو بەسەریدا دەسەپێنرێت. لەبەرئەوە کار یا دروستکردن لەبەر ئەم هۆیە بەناچاری پرۆسەیەکی توندوتیژە. ئارێنت دەڵێ: "توندوتیژی لەهەموو دروستکردنێکدا ئامادەیی هەیەو ئاژەڵی دروستکەر (homofaber) داهێنەری دنیای ئینسان، هەمیشە وێرانکەری سروشت بوە".[٨]

لەکاتێکدا ئـاژەڵی رەنجدەر تـەنیا وێرانکـەری جیـهان بـووە، ئاژەڵی دروسـتکەر (homofaber) جیـهان دروسـتکەرە. بەپێچەوانـەی ئـاژەڵی رەنجدەرەوە کـە بابـەتی پێویستییەکانی ژیانی خۆیەتی، لەبەرئەوە تەنیا دەتوانێ بونی هەبێ بونێکـی کۆیلـە ئاسا کەپشت بەسووڕی سروشـت دەبەسـتێ، ئـاژەڵی دروسـتکەر سـەروەری خـۆیو سـەروەری ئەوشـتەیە کـە دروسـتی دەکـا. ئـەوەی جیـهان دروسـت دەکـا ئـاژەڵی دروستکەرە، ئینسان وەك هونەرمەند، نەك ئینسان وەك ئاژەڵی رەنجدەر. مانای کار لەدواقۆناغدا لەئینسانەوە دێت وەکو بکەر. لای ئارێنت ژیانێك کە بێ گوتار (عەقل)و بێکردارە ژیانێکی مردوە لەجیهاندا، هەرچەندە لەبیرمان بێت کە ژیانێکیش بێ رەنج واتە مەرگ. لێرەدا حیساب کردنێکمان هەیە بۆ کار (work) کە خۆی دەخاتـە نێـوان رەنجو کردارەوە (actian). ناچاریبوونی رەنج واتا خاڵی بوونی لـە مانـا، لـەکاتێکدا هەیمەنەی بێ پرسیاری ئامانج یاخود بەرهەم لەکاردا، ئەم چالاکییە بێ بـەش دەکـا لەبەهای سەربەخۆ، پرۆسەی بەرهەمـهێنان تـەنیا هۆکارێکە بـۆ بەرهەمـهێنانی ئـەم ئامانجە. تەنیا کردارە، ئارێنت دەڵێ، دوای ئەوەی کە پەیڕەوی ئەرستۆ دەکا، تەنیا کردارە کە دەتوانێ ئیدعای خاوەنێتی مانـای جەوهـەری بکـا، خۆبـەخۆیی بـوون، و ئنجا ئیدعای ئـازادی بکـا، لای ئـارێنت کـرداری سیاسـیو گوتـاری هاونیشـتمانەکان پـارادایمێکن، مۆدێلێکـن، بـۆ چـالاکی سـەربەخۆو ئازادانـە. ئەمانـە بـەمانای وشـەو بەپلەی ئیمتیاز چالاکی ئینسانین. ئارێنت بەم شێوەیەی خـوارەوە ئـەم خاڵـە روون دەکاتـەوە:

**ئینسانەکان بەچاکی دەتوانن بێ رەنج بژین، دەتوانن، خەڵکانی دی ناچار بکەن ئیشیان بۆبکەن، زۆر بەچاکی دەتوانن بڕیاربدەن کە جیهانی شتەکان بەکاربهێنن و چێژیان لێوەربگرن بێ ئەوەی خۆیان یەك شتی بەسوود چییە ئیزافەی بکەنە سەر ئەو جیهانە، ژیانی کەسێکی سوود جوو یاخاوەنی کۆیلەو ژیانی کەسێکی مشەخۆر رەنگە عادلانە نەبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە ژیانێکی ئینسانیە، ژیانێکی بێگوتارو بێ کردار لەلایەکی دیکەوە.. بەمانای حەرفی ژیانێکی مردووە بۆ جیهان، لەوە کەوتوە کە ژیانێکی ئینسانی بێت لەبەرئەوەی ئیدی لەنێو ئینسانەکاندا ناژی.**[٩]

کەواتە تـەنیا ژیانی سیاسی، ژیانی کردارو عەقڵە کە ئازادە، تـەنیا ژیانی سیاسییە کە ژیانێکی ئینسانییە. بوونە ئینسان واتە بوونە هاونیشتمانی بوونە هاونیشتمانیش

واته توانای کرداری سیاسیو گوتاری سیاسی، گفتوگۆکردن لەگەڵ هاولاتیانی تردا، توانای نواندنی کرداری سیاسیو بیرکردنەوە لەمەڕ کێشە سیاسییەکان. هەر جۆرە یا شێوەیەك لەسیاسەت کە هەوڵ بدا شوێنی وەزیفەی خێزان بگرێتەوە لەسیاسەت دەکەوێ، چونکە بەم کارەی زوڵمو زۆرو هێزی ناچاری دەسەپێنێت بەسەر مەملەکەتی ئازادیدا. هەرکاتێك کردار لەرێگای بەرئەنجامەکانیەوە ناسرایەوە، لە رێگای سەرکەوتن یاشکستییەوە دیاری کرا، ئیدی لەوە دەکەوێ کە بەرەسەنی کردارێکی سیاسی بێت. لای ئارێنت، نە سەیتەرەکردنو نەرزگاری بەکرداری سیاسی رەسەن ناژمێردرێن، بەهەمان موجادەلە، نەئیدارە کردنو نەنوێنەرایەتی کردن ناشێ بەکاری سیاسی لەقەڵەم بدرێن. کەواتە لەبنەڕەتدا ئیدارەکردنی باش، یاحکومکردنی باش، بیروکراسیەت ئەمانە هەر هەموو لەگەمەی سیاسی دەبێ بکرێنەدەرەوە. بەڵام ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کە دوا بەرهەمی ئەم دروشمەیە: بەرێوەبردنی چاك (Good Goverence).

سەیتەرەکردن مەسەلەیەکی سیاسی نییە چونکە مۆنۆپۆل (احتکار) دەخاتە سەر کردارو گووتار، احتکارێ کە هەمە چەشنەیی دەکوژێ، لەم حاڵەتەدا شتێك بوونی نابێت بەناوی هاونیشتمانییەوە بەڵکو تەنیا رەعیەتو سەروەرو پاراستنو مانەوەی ژیانو ئنجا دەستەڵاتی فەرمانرەوایان تەنیا ئامانجی ئەو کۆمەڵەیە دەبن. سیاسەت وەك سەیتەرەکردن هەموو جۆرەکردارێك رێگە پێدەدا کە چاو لەپێویستییەکانو نایەکسانی دەبرێ.

ئیدارەکردن (adminitration) ناشێ وەك کرداری سیاسی لێی بڕوانین لەبەرئەوەی کارەکەی وەك ماکس ڤیبەر سەرنجیدا، لەچوارچێوەی هۆکارو ئامانجدا خۆی دەبینێتەوە. حکومەت گەر وەکو ئیدارە یا (mangement) سەیری بکەین ئەوا ئەو جەستەیە دەبێت کە سەرگەرمی پرۆسەی ژیانی کۆمەڵگایە. مادامێکیش کارەکەیان (بیسنزەکەیان) لەلایەن پێویستییەکانەوە دیاری دەکرێ کە لەجەوهەردا هیچ نین جگە لەپرۆسەی ئابوری، ئیدی لێرەوە ئیدارەکردن لەوە دەکەوێ کە کایەیەکی سیاسی بێت. ئەوکاتەی کە سیاسەت کورت کرایەوە بۆ ئیدارەکردنی نەتەوە، خێزان یاخود نەتەوە لەشێوەی خێزانێکدا، لەوحاڵەتەدا ئەستەمە کە کرداری سیاسیو هەمە چەشنەیی بوونی هەبێت.

سەبارەت بەنوێنەرایەتی کردن (representation) وەکو کارێکی ناسیاسی دەتوانین بڵێین کە بەکارهێنانی نوێنەر (representative) بەناچاری بریتییە لەپاشەکەوت کردنی ئیش. بوون بەنوێنەر واتە نوێنەرایەتی کردنی ئیرادەو بەرژەوەندی جمهوری ناخبین لەمەیدانی گشتیدا. ئامادەبوونی نوێنەر لەناو حکومەتدا کارێك دەکا کە

ئەركی ئامادەبوونی جمهوری ناخبین لەبواری گشتیو مەدەنیدا لەسەر شانیان لابەرێت. (بەواتایەكی دی كاتێك خەڵك كەسێك دەكەنە نوێنەری خۆیان مەبەستیانە بڵێن، گوێ بگرە ئێمە سەرقاڵی ئیشینو بوارمان نییە لەدونیای مەدەنیو گشتیدا ئامادەبین، تۆ هەڵدەبژێرین لەجیاتی ئێمە قسەبكە،و كردار بنوێنە). نوێنەرایەتی كردنی رەسەن تەنیا ئەوكاتە شیاوە كە لەسەر بەرژەوەندی ئاشكراو سنوردارو كۆنكرێتی گروپ بیناكرابێت. بۆ نمونە گەر ئێوە من بكەن بەنوێنەرو بڵێن تۆ لەدانیشتنی پەبلیكی (public) فلانەرۆژدا نوێنەری ئێمەیتو ئەمە رای ئێمەیە: تۆ لەودانیشتنەدا دەڵێیت كە ئێمە لەگەڵ دروستكردنی ئەو ئاوەڕۆیەداین، لەمە بەولاوە من ناتوانم هیچی دیكە بكەم، گەر بێتو ئەو دانیشتنە لەدروستكردن یا نەكردنی ئاوەڕۆ لابداو بووبە دروستكردنی سەدێك كە ئیدی دەبێتە كێشەیەكی ژینگە، ئەوە لەنوێنەرایەتی دەكەوێ.

بەڵام لەوشوێنەدا كەسیستەمی نوێنەرایەتی وەزیفەی خۆی بەچاكی دەبینێت، ئەوكاتە، دووبارە بواریمەدەنیو گشتی دەبێتە ئامرازێك بەدەست بواری تایبەتییەوە، لێرەوە سیاسەت دەبێتە ئامرازێك بۆ ژیان. ئەنجامیش ئەوە دەبێت كە وەك ئارێنت دەڵێ "حكومەت دادەرزێو دەبێتە تەنیا. ئیدارەیەك"و لەم حاڵەتەشدا "مەملەكەتی مەدەنی (گشتی) بزر دەبێت".[10]

ئەو سیناریۆیەی سەرەوە باشترین وێنەیە، بەڵام گەربێتو سیستەمی نوێنەرایەتی كردن بەچاكی وەزیفەی خۆی نەبینێت ئەوا گەشەدەكاو دەبێتە ئۆلیگارشی. ئارێنت دەڵێ، "ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ بەدیموكراسی ناوی دەبەین بریتییە لەوشێوە حكومەتەی كە تێیدا ژمارەیەك حوكم دەكەن، بەلانی كەمەوە بۆ بەرژەوەندی ژمارەیەكی زۆر تر".[11] بەواتایەكی دی، ئەو جۆرە حكومەتانە لەراستیدا دیمكراسی نین بەڵكو ئۆلیگارشین. لای ئارێنت كرداری رەسەنی سیاسی هیچ نییە جگە لەجۆری قسەكردن، لەگوتار، چەشنەكانی گفتوگۆكردن یاخود موجادەلە دەربارەی كێشە گشتیو مەدەنییەكان. لای ئەرستۆو ئارێنت گوتار ئەوشتەیە كە ئینسان دەكاتە ئاژەڵێكی سیاسی.

بەشێوەیەكی گشتی، بەپێچەوانەی كتێبی "ئەسڵەكانی توتالیتاریانیزم" كە لەداینامیكی رژێمە تۆتالیتارەكان دەدوێ، كتێبی "هەلو مەرجی ئینسان" لەهێزە وێرانكەرەكانی دی، هێزە خاپوركەرەكانی جیهان كە سەردەمی مۆدێرن خولقاندونی دەدوێت. لەنێو ئەو هێزانەدا گەشەكردنی هیولایی هێزەكانی بەرهەمهێنانو بەكارهێنان (consumption)كە لەلایەن سەرهەڵدانی كاپیتالیزمەوە هێنرانە بوون. ئەم گەشەكردنە، هاوڕێ لەگەڵ هەیمەنەی غەمە ئابورییەكان، یا سەرگەرمی

ئابورییەکان کە هەر ئەم گەشەکردنە دروستیکردن، هەڕەشەی قوتدانی هەموو کایە تاڕادەیەك سەربەخۆکانی تری چالاکی ئینسانی دەکا. هەردوو تۆتالیتارینیزمی سەرمایەداری تەکنۆلۆژی مۆدێرن لەگەڵ گۆڕینی ئینسانداو کردنی تەنیا بەئاژەڵێکی ئیشکەر، هەوڵ دەدەن کە ئەم پرۆسەیە زیاتر لەزۆنگاوی بەرهەم هێنان‌و بەرهەمهێنانەوە، سووڕێکی بێ کۆتایدا غەرق بکەن.

ئارێنت وەبیرمان دەهێنێتەوە کە دەبێت جیاوازییەکانی نێوان، کردارو کارو رەنج لەبەرچاو بگرین تا ئەو مەترسییە بەچاکی ببینین کە گەربێت‌و ئەوە لەبیربکەین کە ژیانی تاکەکەس تا ئەوشوێنە ئینسانییە کە توانای هەبێت،و ئەو ئەگەرەی لێ قەدەغە نەکرێت، ئەگەری بەرزبوونەوە لەئاستی پرۆسەی سروشتی بەرای ئارێنت، کردارو گووتار لەمەملەکەتی مەدەنی‌و گشتیدا ئەو هۆکارەن کە لەرێگەوەی ئێمە دەتوانین ئەو بەرزبوونەوە سنووردارە بەدەست بهێنین‌و لێرەشەوە ببینە خاوەنی شوناسی ئینسانی تایبەتی خۆمان.

**دواقۆناغی کۆمەڵگای رەنج، کۆمەڵگای خاوەن رەنجەکان، داواکاری تەنیا وەزیفەی ئۆتۆماتیکی سەرفە لەئەندامەکانی، وەك ئەوەی کە گوایە ژیانی تاکەکەس ئیدی بوویێتە بەشێکی پرۆسەی گشتی ژیانی جنسی بەشەری، و تاکە بڕیارێکی چالاکانە کە مابێتەوە تاکەکەس پێویست بێ بیدات دەست بەردار بوونە لەتاکایەتی خۆی[١٢].**

لێرەدا ئارێنت لەجۆرێك تۆتالیتاریانیزم دەدوێ کە دەشێ ناوڕیزی بکەین بە "تۆتالیتاریتزمی نەرم‌و نیان". لە دواجاردا جیاوازی چییە لەنێوان تۆتالیتاریانیزم‌و سێبەرە کاپیتالیستی تەکنۆلۆژییەکەی، لەکاتێکدا کە ئەنجام لەهەردوو حاڵەتەکەدا یەك شت بێت ئەویش "خاپوورکردنی جیهانی هابەش"، ئاوابوونی خۆری ئازادی کە خۆی لەکردارو گوتاردا لەمەملەکەتی مەدەنی‌و گشتیدا دەبینێتەوە، دواجار جۆرێکی دی توانەوەی ئینسان لەنێو سروشتداو لەنێو دنیای ناچاریدا. دنیای مۆدێرن غوربەت‌و تەنیاییەکی بێ وێنەی خوڵقاندوە، ئەزمونی تەنیایی‌و بێ ڕەگ‌و ریشەیی خەڵکی نەك بێ بەش دەکا لە "شوێنێك، فەزایەك لەجیهاندا" بەڵکو بێ‌بەشیشیان دەکا لەهەستکردن بەشوناس‌و هەستکردن بەجیهان. ئەوکاتەی ئینسان لەئینسانەکانی دی دادەبڕێ‌و پردەکان هەرەس دەهێنن، پردی نێوان ئینسانەکان‌و ئینسانەکان‌و واقیع، ئەوکاتە تاکەکەس هەردوو توانای بیرکردنەوەو ئەزمونکردن

لەدەستدەدا. لەحاڵەتێکی ئاواشدا ئەگەری ئەوە زۆرە کە تاکەکانی کۆمەڵ رووبکەنە ئایدیۆلۆژیا بۆ بەدەستهێنانی شەرح و تەفسیری رابردوو، ئێستاو داهاتوو "لەرێگای داتاشینەوە لەیەك موقەدیمەوە، یەك پرنسیپەوە کە ئایدیۆلۆژیا لەسەریەوە هەناسە دەدات. بۆ نمونە: "مێژووی جیهان بریتییە لەمێژووی ململانێی چینەکان"، لێرەدا تاکەکەس توانای تەسامحی بۆ ئەفسانەکان گەشەدەکا، هەرئەوەندەی بەئەفسانەیەك رازی بوویت ئیدی دەرگای رازی بوون بۆ ئەفسانەکانی دی دەکرێتە سەرپشت، ئەفسانەی چین (طبقة)، رەگەز، نەتەوەو .. هتد.

بەم مانایەیە کەدەشێ بڵێین تۆتالیتاریانیزم پێیەکی وا لەسەربێ جیهانی (worldless ness) کە میراتی تەنیایی و گۆشەگیرییە، لەسەر ئەزموونی سەربەجیهان نەبوون بەشێوەیەکی تەواو، ئەزمونێکی زۆر رادیکاڵ و نائومێدکەری ئینسانە. ئیدی ئێمە لەم حاڵەتەدا ناتوانین بیربکەینەوە لەوەی کە دەیکەین، ئەوکاتەی کەسیاسەت بواری مەدەنی و داواکاری عەدالەت دەکەینە نۆکەری تەکنۆلۆژیاو نەتەوە دەکەینە یەك خێزانی گەورەو دواجاریش هەموو جیهان لەو پرۆسەیەوە دەگلێنین.

ئارێنت پێی وابوو کە سەرهەڵدانی کۆمەڵگای جەماوەر (mass society) لەدنیای مۆدێرندا گرنگترین گەشەکردنی مێژووییە کە رێگای خۆشکردبێت بۆ دیاردەی تۆتالیتاریانیزم؛ گەشەکردنێك، کۆمەڵگایەك کە بەبێ ئەو ئایدیۆلۆژیایە نەیدەتوانی سەر هەڵبداو نەرۆڵی خۆشی ببینێت لەنێو ئەم دیاردەیەدا، تۆتالیتاریانیزم. بالێرەوە سەرنجێك بدەینە کتێبی ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزم.

ئارێنت بەدڵنیاییەوە زۆرمان بۆ دەهێنێ کە جارێکی دی مانا ئەسڵییەکانی وشەکانی وەکو ستەمکاری (Tyranny)، ستەمکار (despot)، دیکتاتۆری،و ئۆتۆرەتی (authority) بخەینەوە بەردیدی رەخنەییانەو ئیمتیحانیان بکەینەوە. وەك کەسێکی شارەزای کلاسیك، ئارێنت واسەیری تۆتالیتاریانیزم دەکا وەك شێوەیەکی تەواو نوێی حکومەت، شێوەیەکی تەواو جیاواز لەدیکتاتۆری و ستەمکاری. هەرچەندە دوای ئارێنت کۆمەڵێ نووسەر وشەی تۆتالیتاریان (شمولی) بەکارهێناوەو دەهێنن بۆ وەسفکردنی هەر سیستەمێکی ستەمکاری و بەتایبەت وڵاتە کۆمۆنیستەکان، بەڵام ئارێنت ئاگادارمان دەکاتەوە کە دەبێت بەهۆشیارییەوە ئەم زاراوەیە بەکار بهێنین. لای ئەو ئەم زاراوەیە، ئەم وەسفە تەنیا بەسەر دووسیستەمدا دەچەسپێ. ئەو پێی وایە تائێستا ئێمە دوو شێوەی رەسەنی سەیتەرەی تۆتالیتاری دەناسینەوە: دیکتاتۆریەتی سۆشیالیزمی نەتەوەیی لەدوای (١٩٣٨)ەوە لەئەڵمانیاو دیکتاتۆریەتی بۆلشەفیزم لەدوای (١٩٣٠)ەوە ئەم دوو فۆرمەی سەیتەرەکردن جیاوازن لەشێوەکانی تری دیکتاتۆری یا حوکمی ستەمکاری. سەیتەرەی سەراپاگیری

لەچۆنیەتیدا جیاوازە لەگەڵ سەیتەرەی ستەمکاری، فەرمانڕەوایەتی کردن لەرێگای تیرۆرەوە لەجەوهەردا جیاوازە لەحوکمێك بەرمەبنای ترس. ئەوشتە چییە کە تۆتالیتاریانیزم دەکات بەدیاردە؟ دەتوانین پەنجە بخەینە سەر سێ خاسیەت: تەنیایی و گۆشەگیرکردنی ئینسانەکان، تیرۆر، و ئایدیۆلۆژیا. لای مۆنتسیکیو دیمان کەترس و تۆقاندن خزمەتی بەرژەوەندی ستەمکاردەکا، بەگۆشەگیرکردنی رادیکالانەی رەعیەتی ئەو سیستەمە، دەرگیرکردنیان لەگەڵ قەلەقیکی کوشندە کە لەئەنجامی تەنیاییەوە دێتە کایەوە. حوکم کردن لەرێگای ترسەوە دەبێتە مایەی کردنی بواری مەدەنی بە یەك بیابانی بەرەهووت، بیابانێك کە تاکەکان تێیدا دەستو پەنجە لەگەڵ خەساوی خۆیان و بێ قودرەتی خۆیان نەرم دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کردار (action) ئەگەرێکە، بۆ نمونە کردار دەشێ وەك پەرچەکرداری خۆی بنوێنێ ئەویش بەخۆ دورخستنەوە لەهەر بوارو کێشەیەك ئەمەش بەش بەحاڵی خۆی مانەوە مسۆگەر دەکا. بەڵام حوکم کردن لەرێگای تیرۆرەوە کە خاسیەتی سیستەمی تۆتالیتاریستییە ئەم ئەگەرە دەکوژێ. حوکمی تیرۆر تەنیا بەوە رازی نابێت کە ئینسانەکان گۆشەگیربن و توانای هیچ کارێکیان نەبێت، تەنیا بەوە رازی نابێت کە ئینسانەکان لەبواری مەدەنی دابڕێ و بواری مەدەنیش تیرۆربکا، بەڵکو حوکمی تیرۆر هەوڵدەدا کە بوونی ئینسان بگۆڕێ، تەنیا ئازادی مەدەنی لەناونابات بەڵکو خودی ئازادیش لەناو بەرێت، ئەمەش لەرێگای خاپورکردنی سنوورە یاساییەکانی کەمەدەنی، گشت لەتایبەت، جیادەکاتەوە، بەواتایەکی دی وێرانکردنی ماوەو شوێن و فەزایەك کە پێویستە بۆ مرۆڤ بوون و تاك بوون و بگرە بۆ هەر جۆرە کردارێکیش.

لەکاتێکدا هەموو سیستەمە ستەمکارییەکان هێزیان بەکارهێنانەوە بۆ گۆشەگیرکردنی رەعیەت تاکو کۆنترۆڵکردنیان مسۆگەر بێت، توتالیتاریانیزم ئەوکاتە هاتە جیهانەوە کە لەگەڵ سەرەولێژبوونەوەی جڤاتەکان و کۆمەڵەکان و خێزانەکاندا تەنیایی بووە ئەزمونی رۆژانەی جەماوەری هەمیشە لەگەشەکردوودا. ئیدی ئەزمونی ئەم تەنیاییە لەجیهاندا کە تازەیە، تۆتالیتاریانیزم شانی قورسی لەسەر ئەم تەنیاییە دەدانێ، لەسەر ئەزموونی هەست نەکردن بەئینتیما (انتماء) بۆجیهان، هەست نەکردن بەوەی کە سەربەجیهانیت رادیکاڵترین و ترسناکترین ئەزموونەو زەمینەیەکە کە گەرای هەموو نەخۆشی و پەتایەك، لەوانە ئایدیۆلۆژیا، لەسەریەوە گەشەدەکا. "تەنیایی و گۆشەگیری کارێك دەکا کە ئینسانەکان زوو تەسلیمی ئایدیۆلۆژیاو تیرۆربن" [١٣] ئارێنت لەوباوەڕەدابوو کە لەتۆتالیتاریانیزمدا ئەو رژێمێکی کەشفکردوە کە پرنسیپەکەی بریتییە لەتیرۆر. ئەو ئینکاری ئەوە ناکا کە رژێمەکانی

دیکەش، جۆری حکومەتەکانی دیکەش، تیرۆریان بەکارهێناوە لەرابردوودا، بەڵام هیچ کامیان، ئەمەش خاڵەکەی ئارێنت، تیرۆریان نەکردۆتە پرنسیپی رێکخستن. تۆتالیتاریانیزم تەواو تازەیە چونکی تیرۆر جەوهەری ئەو حکومەتە پێك دەهێنێ. لەو کاتەدا کە ستەمکارییەکانی دی وەحشیانە توندوتیژیان بەکارهێناوە دژ بەنەیارەکانی خۆیان، تۆتالیتاریانیزم یا حکومەتی تۆتالیتاری تیرۆر بەکاردەهێنێ بگرەو بەتایبەتیش دوای ئەوەی کە نارەزایی سیاسی بەتەواوی سەر بەنیست دەکرێ. تیرۆرو کامپەکانی مەرگ دوو خاسیەتی حکومەتی تۆتالیتارین، گەر بێ یاسایی جەوهەری ستەمکاری پێکبهێنێ، ئەوا تیرۆر جەوهەری تۆتالیتاریانیزم پێك دەهێنێ، گەر ستەمکارییەکان هەوڵیاندابێ کە سنورێك بۆ ئازادی ئینسان دابنێن، تۆتالیتاریانیزم لەرێگای تیرۆرو ئایدیۆلۆژیاوە، نیشانە لە "هەڵوەشاندنەوەی ئازادی دەگرێتەوە، بگرە نیشانە لەعەفەویەتی ئینسان دەگرێتەوە بەنیازی لەناوبردنی".

تۆتالیتاریانیزم، یا رژێمە تۆتالیتارییەکان تیرۆر بەکار دەهێنن بۆ تەنفیزکردنی ئەو شتەی کە ئایدیۆلۆژیەکانیان بەحوکم (Judgment)ی سروشتو مێژوو لەقەڵەمی دەدەن. تیرۆر وەك ئامرازێکی بێ وێنە بەکاردەهێنرێت بۆ خێراکردنی یاسا پرسیارلێنەکراوەکانی جوڵەی سروشتو مێژوو. چینەکانی سەرپێخەفی مەرگو "رەگەزە نزمو حەقیرەکان" ئەو تاکەکەسانەی کە گونجاونینو ناگونجێ بژین، لەدیدی تۆتالیتاریانیزمەوە هەر هەموو چارەنووسیان ئەوەیە کە ببنە سووتەمەنی مێژوو. کەواتە ئامانجی تیرۆر بریتییە لەجێبەجێکردنی حوکمی مەرگ کە سروشتو مێژوو دەریانکردوە بۆ ئەوکەسو چینو رەگەزانە، جێ بەجێکردنێکی زۆر خێرا بەڵام رێکخراو، ئەمەش بۆ ئەوەی هەموو کۆسپو تەگەرەکان لەبەردەم چارەنووسی سروشتو مێژوو زولا بچن، ئەو چارەنوسەی مێژوو کە کۆمۆنیزم لە نەهێشتنی چینەکاندا دەبینێتەوە، ئەو چارەنووسەی سرووشت کە نازییەکان لەپاککردنەوەی زەوی لەرەگەزە پیسەکانو سەرکەوتنی ئەبەدی ئارییەکاندا دەیبینیەوە. بەرای ئارێنت بەپلەیەك تیرۆر جەوهەری سیستەمی تۆتالیتارییەکە رەنگە هەندێك کەس بگەیەنێتە ئەو باوەرەی کە تیرۆر هۆکارێکە بۆ گەیشتن بەئامانجێك، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە ئەم سەیرکردنە بەهەڵەدا چوونە. تیرۆر لەسیستەمی تۆتالیتاریدا وەکو سیستەمی کۆمۆنیزمو نازیزم، هۆکار نەبوو بۆ ئامانجێك، بەڵکو راستییەکەی ئەوەیە کە یا ئەوەتا هاوکێشەی هۆکارو ئامانج لەم سیستەمەدا کار ناکا "تیرۆر وا دەردەکەوێ کە بێ ئامانجە"[١٤]، یاخود تیرۆر خۆی دەبێتە ئامانج، تیرۆر لەپێناو تیرۆردا. تیرۆر دەبێتە ئەو ئامانجەی کە ملیۆنەها دەبنە قوربانی

لەپێناویدا، بگرە رژێمیش و حیزب و ئنجا لەدواجاریشدا نەتەوە خۆی هەرهەموو دەبنە قوربانی ئەو ئامانجە لەپرۆسەیەکی وێرانکردنی بێ کۆتاییدا.

لەرێگای تیرۆرەوە واقیع ملکەچی پێدەکرێ بۆ بەڵگە نەویستێکی لۆژیکی یەك ئایدیا (وەك مێژووی مرۆڤایەتی بریتییە لەمێژووی صراعی طبقی، یاخود پرۆسەی سروشتی وەك گەشەکردن و کامڵ بوونی جنسی بەشەری). کەواتە تۆتالیتاریانیزم ئەو شێوەیەیە لەحکومەت کە تێیدا مانیفێستی تیرۆر تیایدا قسە لەئامراز یا هۆکار ناکا بەڵکو تیرۆر خۆی ئامانجەکەیە، ئارێنت لەو باوەڕەدایە کە ترس دەبێتە سەرەکیترین پاڵنەرو مۆتیف لەم رژێمە ستەمکاریەدا کە پێی دەوترێت تۆتالیتاریانیزم.

**هیچ کەس بگرە جەللادەکانیش ئازادنین لەدەستی**
**ترس، گومانی ئاڵ و گۆڕ لەنێوان هاوڕێکاندا**
**سەیرکردنی دراوسێ وەکو جاسوس، ترس لەوەی کە**
**ئەندامێکی خێزان بووبێتە جاسوس کە ئەوەش**
**دەبێتەمایەی قوڕوقەپ کردن بگرە لەناو ماڵیشدا، ئەمە**
**ئەو ئاوو هەوایەیە کەتۆتالیتاریانیزم دروستی دەکا**
**لێرەوە ئەم بەئەتۆمی کردنە (ئەتۆمایزەیشن)**
**رادەگیرێ و چڕدەبێتەوە لەرێگای هەمیشەو لەهەموو**
**شوێنێ ئامادەبوونی جاسوس. جاسوسێ کە**
**لەرووی حەرفییەوە ئامادەیی هەمیشەیی هەیە**
**لەبەرئەوەی ئیدی ئەو جاسوسێکی رەسمی نییە**
**کە بۆ پۆلیس بەپارە کار بکا بەڵکو ئەو**
**لەرووی بوون بەهێزەوە، ئەو هەرکەسێکە کەئێمە**
**رۆژانە لەتەکیدا مامەڵە دەکەین.**[١٥]

بەڵام هەقمانە بڵێین کە ئەم حاڵەتە حاڵەتێکی تازە نییە لەمێژوودا بەتایبەت بە لەبەرچاوگرتنی ئەزموونی ستەمکاری لەسەدەکانی پێشودا. بەپێی تەفسیرەکەی ئارێنت ئەوەی تازەیەو جودایە لەو وێنەیەی سەرەوەداو لەسیستەمی تۆتالیتارییەکاندا بریتییە لەبەکارهێنانی دەستەڵاتی پۆلیس و تیرۆر لەکاتێکدا کە ئەو تیرۆرە ئیدی پێویست نییەو زیادە. بەواتایەکی دی لەکاتێکدا دانیشتووان گوێ رایەڵن و ملکەچ کەچی بەکارهێنانی تیرۆر هەر بەردەوامە. تیرۆری تۆتالیتاری تازەیە لەبەرئەوەی رژێم بەتەنیا دژ بەنەیارانی بەکاری ناهێنێ، بەڵکو ئەوکاتەش بەردەوام

دەبێت لەبەکارهێنانی تیرۆر کە نەیاران‌و دژایەتی بەتەواوی لەبەین چوون، ئەو دەڵێت:

**جیاوازی بنەڕەتی لەنێوان دیکتاتۆریەتی مۆدێرن‌و هەموو ستەمکارییەکانی رابردوو لەوەدایە کە تیرۆر ئیدی وەکو هۆکارێك بەکار ناهێنرێت بۆ سەربەنیست کردن یا شەڕکردن لەگەڵ نەیاران، بەڵکو وەك ئامڕازێك بۆ حوکم کردنی جەماوەری خەڵك کە بەتەواوی ملکەچن‌و گوێ رایەڵ.. قوربانییەکانی ئەم تیرۆرە تەنانەت جەللادەکانیشی بێ گوناهن [16]**

لێکۆڵینەوەکەی ئارێنت خۆی لەخۆیدا رەخنەیەکە لەچەند نوسەرێك لەوانە ماکس ڤیبەر. ماکس ڤیبەر لەو باوەڕەدابوو کە رژێمە ستەمکارو توندوتیژەکان لەسەرخۆ موعتەدیل دەبن دوای رووبەڕوبونەوەی رۆژانەیان لەگەڵ کێشەی ئیدارەکردن‌و بەرهەمهێنانی ئابوری. بەڵام ئارێنت بەپێچەوانەوە لەو باوەڕەدابوو کە وەحشیەتی تیرۆری تۆتالیتاری لەوەدایە کە زیاد دەبێت لەگەڵ هەر سەرکەوتنێکدا بەسەرنەیارەکانیدا، دوای تەفروتوناکردنی نەیارەکانیش هەر لەزیادبوونە. ئەمەش وایە چونکە رژێمی تۆتالیتاری تیرۆر بەکار ناهێنێ تەنیا بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی سیاسی بەڵکو بەکاری دەهێنێ بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی ئایدیۆلۆژی‌و بۆسەلماندنی راستی بوونی ئایدیۆلۆژی.

لەموقابیل هەموو ستەمکارییەکانی پێشوودا، لەبەرچاوگرتنی سیاسی نا، سەربازی نا بەڵکو لەبەرچاوگرتنی ئایدیۆلۆژییە کە دوژمن دیاری دەکا لەژێر سایەی ئەم سیستەمە تۆلیتاریەدا. بەپێچەوانەی توندوتیژی ستەمکارییەکانی پێشوو، تیرۆری ئایدیۆلۆژی تۆتالیتاریانیزم ئامانجێکی نییە، چونکی هەمیشە پێویستە دوژمنی تازە بخوڵقێنرێت تاکو مەحف بکرێنەوە، و دوژمنی تازە پێویستە تاکو ئەم بزوتنەوە تۆتالیتارییە بتوانێ وەك بزوتنەوە پایەدار بمێنێتەوە.

تۆتالیتاریانیزم لەمێژوودا بێ پێشینەیەو لەهەمان کاتیشدا بێ گومان دیاردەیەکە مۆدێرن‌و منداڵی مۆدێرنتییە. مۆدێرن بەو مانا قووڵەی کە تەعبیر لەخاڵێکی جەوهەری رۆحی مۆدێرن دەکا، ئەویش ئەو باوەڕهێنانە دێوانەییەیە بەبێ سنوری سروشتی دەستەڵاتی ئینسان. لای ئارێنت، سەردەمی مۆدێرن سەردەمی بێسنوری تەئکید کردنی زاتییە کە لەوبوغزەوە سەرچاوەی گرتوە کە هەلومەرجی ئینسان دەکاتە نیشانەی خۆی، بوغز لە هەرسنورێك کە بوونی ئینسان دیاریدەکا.

ئامادەنەبوون بەقبوڵکردنی هەرشتێ کە خۆی دروستی نەکردبێت، ئینسانی مۆدێرن واقیع دەگۆڕێ لەڕێگای زانستی مۆدێرن‌و تەکنۆلۆژیاوە، واقیع جارێکی دی دروست دەکاتەوە. ئەو شتەی ئارێنت پێی دەڵێ "سەرکەوتنی مۆدێرنانەی ئاژەڵی دروستکەر (homofaber)" لە "هەلومەرجی ئینسان"دا ئەم سەرکەوتنە دەبێتە مایەی لەدایك بوونی ئەو عەقیدە مۆدێرنە کە دەڵێ "هەمووشت ڕەوایە، هەمووشت دەشێ"، ئەو عەقیدەیەی کە دەڵێ سنورێك نییە بۆ توانای مرۆڤایەتی بۆ تەسخیرکردن‌و بەکارهێنانی پرۆسەی سروشتی، ئیدی لێرەوە سنورێك نییە بۆ داڕشتنەوەی واقیع سەرلەوێ. هەر ئەم عەقیدەیەی "هەمووشت ڕەوایە"ی ئینسانی مۆدێرن کە تەعبیری خۆی لە نێو پرۆژەی تۆتالیتاری "دروستکردنی مرۆڤایەتی"دا دەبینێتەوە. هەرئەم شیکردنەوەیەیە ترسەکەی ئەفلاتونمان دەهێنێتەوە یاد، ترسی ئەوەی کە گەر بێت‌و ئەو عەدەمیەتەی کە لەنێو موجادەلەو فیکری سۆفستائییەکاندا خۆی مەڵاس دابوو، جڵەوی بۆ خۆش بکرێت لەجیهاندا، ئەوا هەمووشت دەڕوا، هەموو شت ڕەوا دەبێت، گۆلاك، کەمپەکانی مەرگ، کێڵگەکانی مەرگ، هۆڵەکۆست، ئەنفال‌و.. هتد، ئنجا بەئاژەڵ بوونەوەی مرۆڤیش. هەر ئەو عەدەمیەتەیە کە کارێك دەکا کە نازییەکان‌و کۆمەنیستەکان لابرا تۆری، تاقیگای تیرۆر دروست بکەن تاکو ببینن ئینسانەکان چی لەتوانایاندا هەیە بیکەن، تا نیشانی بدەن کە بەڵێ هەمووشت دەشێ‌و شیاوە. ئەوەی کەنازییەکان‌و کۆمەنیستەکانی پێکەوە گرێدەدا ئەو بۆچوونە عەدەمییە بوو کە دەڵێ بەڵێ ئینسان کائینێکی لەڕادەبەدەر بەتوانایە، ئەو قەناعەتە بوو کە هەمووشت شیاوە، بگرە داڕشتنەوەی سەر لەنوێی دنیاش شیاوە. پڕچەك بوو بەزانست‌و تەکنۆلۆژیاو ڕێنومایی کراو لەلایەن فەنتازیا کێوییەکانەوە، چ نازییەکان‌و چ کۆمەنیستەکان سەرگەرمی کەشفکردنی ئەو شتانەبوون کە دەشێن. ئەوان هەموو توخمەکانی کە لەمێژوودا بەکارهاتبوون، بەکاریان هێنان، لەناوبردنی دانیشتوان، خاپورکردنی شار، گواستنەوەی نەتەوەیەك بەکاملی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی (نمونە: چیچنییەکان، کوردەکان، قەوقازییەکان)، کامپەکانی مەرگ، ترس، سەیتەرەکردن، کوشتن، دادگایی کردنی چەند دەقیقەیی، هەر هەموو ئەو توخمانەیان بەکارهێناو گەشەپێداو داهێنانی نوێیان خستە سەر ئەو توخمانە، هەر هەموو لەسەر ئەو پرنسیپە عەدەمییەوە کە دەڵێ: "هەمووشت ڕەوایە، هەمووشت شیاوە" ئەوپرنسیپەی بۆ یەکەمین جار سۆفستائییەکانی یۆنان بە چاکی تەعبیریان لێکردو لەوڕۆژەوە مۆتەکەیەکە بەسەر ڕۆحی مرۆڤایەتییەوە، نازییەکان‌و کۆمەنیستەکان نەوەی کالیکلیسن نەك ئەفلاتۆن وەك ئەوەی کە پۆپەر لەڕقە ئەبەدییەکەیەوە

لەفەلسەفە دەیویست پێمان بڵێ[١٨]. کامپەکانو گۆلاگ ئەو تاقیکردنەوانە بوون بۆ بینینو زانینی ئەوەی کە تاچەندە دەتوانین سروشتی ئینسان بگۆڕین. ئەوانە موختەبەرەکانی مۆدێرنتی بوون کە تیایاندا گۆڕان لەسروشتی ئینساندا تاقیدەکرانەوە. رژێمە تۆتالیتارییەکان ئەوەیان نیشاندابن کەچی رودەدا ئەو کاتەی ئینسانەکان تەسلیمی ئەو وەسوەسەیە دەبن، وەسوەسەی "کڕینی دەسەڵاتێکی بێسنور لەسەر حیسابی تەسلیم بوون بەهێزە نائینسانییەکانو کۆمەك کردن بەپێویستی تەسلیم بوون بەیاسایەکی رەگەز پەرستی" یاسای سروشتی، یاخود تەسلیم بوون بەیاسا مێژوویەکانی جوڵە کە نەك بەتەنیا پێشبینی لەناوچوونی کاپیتاڵیزم دەکەن بەڵکو لەناوچوونی دوژمنەکانی پرۆلیتاریاش، ئەو رژێمانە ئەوەیان نیشاندابن کە تەسلیم بوون بەوەسوەسەی سۆفستائی، ئەو وەسوەسە ستەمکارییەی کە دەڵێ "ئینسان مقیاسی هەموو شتێکە"، بەرئەنجامی ئەو وەسوەسە عەدەمییە کەمپەکانی مەرگو گۆلاکو ئەنفالە.

بۆئەوەی کە سەیتەرەی تەواو ببێتە واقیع، سێ هەنگاو لەناو پرۆسەیەکدا پێویستن: هەڵوەشاندنەوەی دەستگای قەزائی لەرێگای ئینکارکردنی مافەکانو هاونیشتمانێتییەوە، بەدواییدا خاپورکردنی حسی ئەخلاقیو کەسایەتی ئەخلاقی لەرێگای دروستکردنی هەلو مەرجێکەوە کە ئیدی تێیدا ویژدان ناتوانێ وەزیفەی خۆی ببینێ، ئنجا وێرانکردنی تاکایەتی هەر تاکە کەسە، بەپلەیەك کە تاکە کەس دەبێتە بوونەوەرێك کەهەموو شتێکە جگە لەخۆی. ئەمەشە خاسیەتی دەسەڵاتی تۆتالیتاریانیزم، کە دەسەڵاتێکە لەجیاتی چاوبڕین لە "حوکمێکی ستەمکارانە بەسەر ئینسانەکانەوە، وەك ئارێنت دەڵێ: چاو لەسیستەمێك دەبڕێ کەتیایدا ئینسانەکان دەبنە سپڵی لاورگ"[١٩]. بەهۆی تیرۆرەوە ئینسانەکان دەبنە ماتەریاڵی خام، کە ناتوانن بەرگرییەك نیشان بدەن دژ بەیاساکانی جوڵەی سروشتو مێژوو، ناتوانن رێبگرن لەهەڵگرانی ئەو ئایدیۆلۆژیا تووڕەو عەسەبیانە کە سەرقاڵی پرۆسەی داڕشتنەوەی ئینسانەکان، پرۆسەی لەتاکایەتی خستنی تاکەکانو لەئینسانیەت خستنی ئینسانەکانە.

گوتمان لەپاڵ تیرۆردا ئایدۆلۆژیا خاڵێکی تری ناسینەوەی خاسیەتێکی تری تۆتالیتاریانیزمە، ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی کە ئیدیعا دەکەن هەموو نهێنییەکانی پرۆسەی مێژوویی دەزانن، نهێنییەکانی رابردوو، ئاڵۆزییەکانی ئێستا، نادڵنیاییەکانی داهاتوو، ئەمەش لەبەرئەو لۆژیکەی کە لەنێو ئایدیاکانیاندا هەیە.

لەکاتێکدا کەستەمکارییەکان هەیمەنەی خۆیان بەسەر تاکە کەسەکاندا دەسەپێنن بەڵام دەست بۆ بیرکردنەوەی تایبەتی نابەن، بەڵام ئایدیۆلۆژیا بەهاوکاری تیرۆر

ژیانی تایبەتی کەسەکان داگیر دەکا، هەستی هاوبەش خاپووردەکا،و تەسخیری بیرکردنەوەیان دەکا، کەسەکان ئیدی نەك ناتوانن بیربکەنەوە بەڵکو دەبنە توتی بۆ دووبارە کردنەوەی گریمانکاریەکانی ئایدیۆلۆژیا. بەڕای ئارێنت پرکردنەوەی ئایدیۆلۆژیانە هەموو پەیوەندییەکان بەواقیعەوە خاپوور دەکا، ئیدی ئینسانەکان هەم توانای بیرکردنەوە لەدەست دەدەن‌و هەم توانای ئەزمون کردن. پێش ئەوەی درێژە بەم باسەبدەین‌و باسی رۆڵی ئایدیۆلۆژیا لەنێو ئەم سیستەمە نوێیە دابکەین‌و بزانین ئارێنت چۆن لەرۆڵی ئایدیۆلۆژیا دەڕوانێ، بەپێویستی دەزانم کورتەیەك لەسەر چەمکی ئایدیۆلۆژیاو تێگەیشتنەکانی پێش ئارێنت بۆ ئایدیۆلۆژیا بدوێم.

## ئایدیۆلۆژیاو کێشەی سنورەکان:

یەکێك لەرێگرە سەرەکییەکانی گەشەکردنی تێگەیشتنێکی دروست لەچەمکی ئایدیۆلۆژیا بەباوەڕی من بریتییە لەشکستی ئەوانەی کە ئەم چەمکە بەکاردەهێنن، بەکارهێنانێکی یا هەمەڕەکی یا ئاڵۆز، شکستی ئەوانەی کە نەیانتوانیوە ئەم چەمکە جیابکەنەوە لەدیاردە کلتورییەکانی دی. لەزۆر چەمکاندن (conceptualization)دا ئایدیۆلۆژیا هێندە سەراپاگیرییەکە شێوە ڕەمزییەکانی دی هەر هەموو لەخۆ دەگرێ ئەو کاتەش کەئایدیۆلۆژیا سەراپا گیر بوو دەستەلاتی جودا خوازی لەدەست دەدا، دەسەلاتی جیاکردنەوەی لەدیاردەو لەچەمکەکانی دی، ئیدی بەم شێوەیە شکست دەهێنێ لەوەی کە پەیوەندی ئیمبریکی (emprical relevance) بەدەست بهێنێ بەمانایەکی دی چونکی هەموو شت دەگرێتەوەو هیچیش ناگرێتەوە، دەبێتە چەمکێکی بێفەڕو بێ سود. لێرەدا خستنەروویەکی چەند نمونەیەك لە ئەدەبیاتی فیکریدا لەسەر ئایدیۆلۆژیا رەنگە مەبەستەکەی من روون بکاتەوە دەربارەی کێشەی سنورەکان، بەمانای سنوری ئەم چەمکە لەگەڵ چەمکەکانی دی. رەنگە زیادەڕۆیی نەبێت گەر بڵێین کارل مارکس گەورەترین کاریگەری بەردەوامی لەسەر چەمکی ئایدیۆلۆژیا هەبووە لەسەدەی بیستەمدا. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو یەکەم کەس نەبووە کە لەئایدیۆلۆژیای کۆڵیبێتەوە، وە ئەویش نەبووە کە ئەو زاراوەیەی داهێنابێت. فرانسیس باکۆن (١٥٦١ ـ ١٦٢٦) دەشێ بگوترێت کە یەکەم کەس بێت کە بۆ یەکەمینجار لەئایدیۆلۆژیا کۆڵیبێتەوە لە لێتوێژینەوەیەکدا بۆ بتەکان (idols) ئەو بتانەی کە رێگرن لەبەردەم مەشقکردنی میتۆدی زانستیدا، لەوبتانەی (مەبەست لەبت هەڵەو حوکمی پێش وەخت‌و لایەنگرییە.. هتد). بتی قەبیلە، بتی ئەشکەوت، بتی بازاڕ، بتی شانۆ.. هتد.

بەڵام وەك زاراوەیەكی جیاوازو ئاشكرا ئایدیۆلۆژیا بەرهەمی چەند تیۆریسینێكی فەرەنسی دوای رۆشنگەرییەكە پێیان دەگوترا ئایدیۆلۆگەكان (ideologues) ئەوانەی كە تیۆریەكیان گەشە پێدا لەمەڕ ئایدیاكانەوە لەسەرمەبنای چەند پرنسیپێكی حسی فەلسەفییەوە. دوای شۆڕشی ١٧٨٩ ئەوكاتەی كە هێشتا فەرەنسا هەر كۆمارێكی دیموكراتی بوو، ئایدیۆلۆگەكان كە زۆربەیان ئەندامی ئینیستیوتی نیشتمانی بوون، لەهەوڵی ئەوەدا بوون كە عەقیدەیەك (doctrine) گەشە پێبدەن كە شوێنی گریمانكارییە فەلسەفیو سیۆلۆجییەكانی پێشوو بگرێتەوە ئەو گریمانكاریو تەسەوراتانەی كە رژێمی كۆن لەسەرییەوە دامەزرابوون میتۆدیك كە ئایدیۆلۆگەكان گەشەیان پێدا كە تا بەم كارە هەڵبستێ بریتی بوو لە "زانستی ئایدیاكان" (science of ideas) كە ناویان نا "ئایدیۆلۆژی"و لەرێگەی ئەم زانستەوە هەوڵیاندا كە زەمینەیەك بۆ عەقڵ بڕەخسێنن لەرێگای كورتكردنەوەی هەموو ئایدیاكان بۆ ریشەكانیان لەئیحساسدا.

ئایدیۆلۆگەكان واسەیری ئایدیۆلۆژییان دەكرد وەك زانستی ئایدیا، لێرەدا ئایدیۆلۆژیا ئاماژەدە كردن نەبوو بۆ چلۆنایەتی یان جۆری هەرفیكرەیەك، بەڵكو ئاماژەكردن بوو بەتەكنیك، تەكنیكێ بۆ كەشفكردنی حەقیقەتو لەناوبردن یا توانەوەی وەهمەكان. بەڵام ماركس مانای ئایدیۆلۆژیای گۆڕیو ئیدی ئایدیۆلۆژیامانا مۆدێرنەكەی ئەمرۆی لەخۆگرت. دیارە تێگەیشتنی ماركس بۆ ئایدیۆلۆژیا لەژێر كاریگەری گەشەكردنی ئایدیالیزمی ئەڵمانیادابوو، لەوانە فەلسەفەی هیگڵو فیورباخ. لای ماركس ئایدیۆلۆژیا لەجیاتی ئەوەی كە میتۆدێ بێت بۆ كەشفكردنی حەقیقەت، تیۆری ماركس بۆ ئایدیۆلۆژیا باس لەچلۆنایەتی بیردەكا، بەتایبەتی بیری كۆمەڵایەتی، بەواتایەكی دی ئەوبیرە كە وەهمییەو شێواو. بەكارهێنانی چەمكی ئایدیۆلۆژیا بەم شێوەیە، ماركس بۆ یەكەمینجار دەستو پەنجەی لەگەڵ گیروگرفتی سنوردار بووندا نەرمكرد. گەر ئایدیۆلۆژیا ئاماژە بۆ تایپێك یا چلۆنایەتی فیكرەیەك بكا، كەواتە سنورەكانی (boundaries) ئایدیۆلۆژیا كامانەنو پەیوەندییەكانی ئایدیۆلۆژیا بەدیاردە پەیوەندی دارەكانەوە كامانەن؟ دیارە تیۆری ماركس بۆ ئایدیۆلۆژیا بەشێوەیەكی قانع كەر روبەڕوی ئەم كێشەیە نابێتەوە، چونكە خودی ماركس دووبارە ئەم چەمكە زۆر بەشێوەیەكی گشتی بەكاردەهێنێ بەشێوەیەك كەوا دەردەكەوێ هەموو دیاردە كلتورییەكان لەخۆ بگرێ، بەوشێوەیەی ئەو ئایدیۆلۆژیا دەبینێ ئایدیۆلۆژیا هەموو هەڵەو وێنا زهنییەكان لەخۆ دەگرێ كە سەرجەم شكستی تاكەكان پێك دەهێنن لەتێگەیشتنیان لەپەیوەندییە ئیغترابییەكانی دەوروبەریانو ئنجا تێنەگەیشتنیان لەو پەیوەندیانە بەگەشەكردنی گشتی مێژووەوە[٢٠] هەروەها

لەتیۆری مارکسدا ئەوە ئاشکرانییە کە تاچ پلەیەك ئەم بەهەڵە لێ تێگەیشتنانە یەکسانن لەگەڵ خودی هۆشیاری. دیارە مارکس جەغدی دەکردە سەر ئەوخاڵەی کە لەکاپیتالیزمی پیشەسازیو کۆمەڵگای بۆرژوازیدا سەرجەم "سەرخانی کلتووری" ئایدیۆلۆژییە بەڕای ئەو ئەوسەرخانە کلتورییەش، سیاسیو ئاینیو جوانناسیو فەلسەفەی هەر هەموو پێکەوە دەگرێتەوە. بەڕای مارکس تەنیا تیۆری کۆمەڵایەتی مارکسیستی لەسەر تێگەیشتنێکی دروستی مێژووەوە بیناکراوە،و ئەو تیۆرییەیە بەدوورە لەشێواندنی ئایدیۆلۆژی ئەمەش خودی ئیشکالیەتەکەیە لەمارکسیزمدا هەروەها گیروگرفتی سنورەکان لەدارشتنی چەمکی ئایدیۆلۆژیدا لەبەرهەمی کارڵ مانهایم (karl Mannheim)دا دووبارەدەبێتەوە، لەوێدا مانای زاڵی ئایدیۆلۆژیا ئەمەیە: "ئایدیۆلۆژیا بریتییە لەسەرجەم بۆچوونی گروپێکی کۆمەڵایەتی"[21].

ئایدیۆلۆژیا بەڕای مانهیم سەرجەم جیهانبینی گروپە کە لەروی سۆسیۆلۆژییەوە لەلایەن بۆچوونی سیاسی ئەو گروپەوە دیاری کراوە، هەلو مەرجی بۆدانراوە، ئنجا لەڕوی زەمەنیشەوە پرۆسەی مێژووی کاریگەری خۆی لەسەر ئەو جیهان بینیە داناوەو دادەنێ. مانهیم ئایدیۆلۆژیا بەگەردونی دەکا (universalize)و خودی مارکسیزمیش بەئایدیۆلۆژیا لەقەڵەم دەدا. ئایدیۆلۆژیاکان بەڕای ئەو دووجۆرن: لەلایەکەوە ئەو ئایدیۆلۆژیانەی خوو رەوشتو رێساکانی رابردوو دەمج دەکەن لەگەڵ ئەمرۆداو هەوڵ دەدەن کە بارودۆخی ئێستا (status quo) بپارێزنو بەمانە دەگوترێت "ئایدیۆلۆژیاکان". لەلایەکی دیکەوە بیر دەشێ پێی بگوترێت یۆتۆپیایی (utopian) گەر بێتو پشت بەتوخمە ترانسێندێنتەکان ببەستێ، ئەو توخمانە وەك ئەو دەڵێ "گەر بێتو بەسلوك بگەن، هەوڵدەدەن بەشێوەیەکی جوزئی یا کولی، رێکخستنی شتەکان هەڵ وەشێنن".

ئەدەبیاتی بەناو قوتابخانەی"کۆتایی ئایدیۆلۆژیا" کە لەپەنجاکانو شەستەکانی سەدەی رابردوودا گەشەی کرد بەهەمان شێوە گیروگرفتی نێوان ئایدیۆلۆژیاو دیاردەکانی دی لەبەرچاو نەگرت، بۆ نمونە کتێبەکەی "کۆتایی ئایدیۆلۆژیا ـ the end of ideology"ی دانیاڵ بێل، ساڵی ١٩٦٥ . یەك رەخنەگر لەوباوەڕەدایە کە ئەندامانی ئەم بزوتنەوەیە لەسەر ئەوە هاوڕان کە ئایدیۆلۆژیا وەك "یۆتۆپیای موتڵەق" سەیربکەن.[22]

دەتوانین دەیەها نمونەی تر بهێنینەوە بۆ نیشاندانی ئەوکێشەیەی کە من پێی دەڵێم کێشەی سنورەکان لەوێناکردنو بەچەمککردنی ئایدیۆلۆژیادا، ئەو کێشەیە لەو شکستەوە سەردەر دەهێنێ کەبریتییە لەشکستی رانەگرتنی جیاوازییەکانی نێوان

ئایدیۆلۆژیاو دیارده كۆمەڵایەتییەكانی دی، بەڵام تائێره ئەم كورتەیە بەسەو با بگەڕێینەوه سەردیدی ئارێنت لەمەڕ رۆڵی ئایدیۆلۆژیا لەسیستەمی تۆتالیتاریدا.

بەڕای ئارێنت كلیلی تێگەیشتنی ئەوەی چۆن نازیزمو بۆلشەفیزم لەشێوەی یەك جۆر حوكم كردندا بەیەك گەیشتنەوه بریتییە لەوەی بڕوانینە نەك ناوەڕۆكی ئایدیۆلۆژیاكانیان بەڵكو بڕوانینە فۆڕمی ئەو ئایدیۆلۆژیایانه. كەواتە ئێمە لەجیاتی ئەوەی بزانین ئایدیۆلۆژیای نازیزم یا كۆمۆنیزم دەڵێ چی، پێویستە لەسلوكی دەربڕینی موجادەلەكانیان (arguments) بڕوانین. ئایدیۆلۆژیا بەڕای ئارێنت بریتییە لەزنجیرەیەك ئایدیا كە بەنیازه تەفسیرێكی شمولی گەشەكردنی مێژوویی‌و كۆمەڵایەتی بدا بەدەستەوه. ئایدیۆلۆژیاكان بەو شێوەیە كاردەكەن، بەجیاكردنەوەی گوایە یا بەناو چەند حەقیقەتێك دەربارەی ژیانی ئینسان، دەربارەی سروشت، یا كۆمەڵگاو بەرزكردنەوەیان بۆ ئەو ئاستەی كە ئیدی تەحدیدی حەقیقەتەكانی دی بكەن، ئەوه دیاری بكەن كە ئێمە لەكوێوه هاتوین‌و بەرەو كوێ دەڕۆین. وەك ئارێنت دەڵێ:

**ئایدیۆلۆژیا لەڕوی حەرفیەوه ئەو شتەیە كە ناوەكەی دەیڵێت یا دیاری دەكا: بریتییە لە لۆژیكی ئایدیایەك. بابەتەكەی بریتییە لەمێژوو، كە ئایدیاكە بەسەریدا دەچەسپێ، بەرئەنجامی ئەم چەسپاندنەش بریتی نییە لەجەستەیەك یا زنجیرەیەك گوزاره (statements) دەربارەی شتێك، بەڵكو دەربارەی پرۆسەیەكی بەردەوامە كە هەمیشە لەگۆڕاندایه.**[٢٣]

بۆ نمونە بۆلشەفیزم كە لەماركسیزمەوه سەرچاوه دەگرێ ئیدعای دەكرد كە مێژووی مرۆڤایەتی دەشێ وابناسرێتەوه كە مێژووی ململانێی چینەكانە، یاخود نازیزم كە پێی وابوو كە كێشمەكێشی نێوان رەگەزەكان مۆتۆڕی مێژووه. جیاكردنەوەی رەهەندێكی بوونی ئینسان‌و كردنی بەو كلیلەی كە ئەوه دیاری دەكا چۆن هەموو شتێكی دی گەشە دەكا. هەموو ئایدیۆلۆژیاكان لەم پرۆسەی بەجەوهەری كردنەدا بەشدارن. زیاتر لەمە ئایدیۆلۆژیا بریتییە لەسیستەمێكی داخراوی بیر، ئایدیۆلۆژیاكان بەچەند بەناو حەقیقەتێ لەمەڕ هەرشتێكەوه، بڵێ سروشتی ئینسان، بۆ نمونە، دەست پێدەكەن‌و ئنجا شەرحی هەموو رەهەندو حەقیقەتەكانی دیی دەكەن، لەرێگای ئاماژده بۆكردنەوه بۆ پرنسیپ یا حەقیقەتی كەشفكراو لەسەر ئەم گریمان كارییەوه كار دەكا: كە مەعریفەی حەقیقەتی ئەلف

خۆی دەبێتە مایەی حەقیقەتی بیّ،و دال، زانینی ئەلف ئەو مەعریفەیە بەکەس دەدا کە مەعریفەیە دەربارەی هەموو حەقیقەتەکانی دی، چونکی هەموو حەقیقەتەکانی دی لەحەقیقەتی یەکەمەوە کە کەشفکراوەو زانراون هاتوون. بۆ نمونە کاتێك کە کۆمۆنیزم دەیگوت ململانێی چینەکان حەقیقەتە (fact) ئەمە دەبووە پرنسیپ، ئەوکاتەش کە وەك حەقیقەت چەسپێنرا ئیدی بۆزانینی ئەو دوای واقیع، و هەموو شتەکانی دی تۆ تەنیا ئەوەت لەسەرە کە بگەڕێیتەوە بۆ سەر ئەو حەقیقەتە. گەر بمانەوێت بزانین بۆ فلانەکەس بەو شێوەیە رەفتاری کرد نەك بەشێوەیەکی دی، ئەوە تەنیا ئەوەمان لەسەرە کە بگەڕێینەوە بۆ ئەوفاکتە واتە ململانێی چینایەتی‌و شوێنی ئەوکەسە لەو ململانێیەدا. ئیدی لێرەوە نەك ئەو بەڵکو هەموو دیاردەیەکی دی تەفسیر دەکریّ، هەموو کایە مەعریفییەکان لەم رێگایەوە لێیان دەڕواندریّ.

لێرەدا هەبوونی ئایدیۆلۆژیا کارێك دەکا کەسەرفەنەزەر بکەین لەعەقڵ‌و عەقلانییەت،و بگرە سەرفەنەزەر بکەین لەبوونی‌فیکریش، فیکر لەم گەمەیەدا دەبێتە شتێکی زیادو ناپێویست. مادامێك هەموو فاکتەکان لەرێگای چەسپاندی فاکتە ئەسڵییەکەوە دەشێت بناسرێنەوە، ئەوەی دەمێنێتەوە بریتییە لەئیستیدلال (استدلال ـ deduction). لێرەوە جیهان دەبێتە کۆمەڵێ فاکت‌و لۆژیکی ئەم ئیستدلالەش هەرهەموویمان بۆ دەردەخات. هەموو مێژوو لەلایەن فاکتی ئەلفەوە دیاری دەکریّ، زانینی ئەم فاکتە سیحری مێژووەو هەر لێرەشەوە دەرککردن بەهەموو دیاردەکان‌و بوارەکان‌و رەهەندەکان مەیسەر دەبێت. ئەمەش لەڕاستیدا هیچ نییە جگە لەدەستبەردار بوون لەئازادی‌و توانای بیرکردنەوە. ئەو کەسەی دەبێتە پەیڕەوی کەری هەر ئایدیۆلۆژیایەك دەستبەرداری توانای عەقڵی خۆی‌و ئازادی خۆی دەبێت، بیّ ئازادیش تاك کورت دەبێتەوە بۆ پەیڕەوی کەرێك یائەندامێکی (species) جنسی بەشەری، بیّ عەقڵیش،و تاك کورت دەبێتەوە بۆ بەئاژەڵ بوون. باوەڕهێنان بەئایدیۆلۆژیا دەستبەردار بوونە لەفەرد بوون. فەرد ئەو بونەوەرەیە کە بۆچوونی هەیە، ئەولەویات‌و ئەفزەڵیەتی شتەکانی خۆی هەیە،لەگەڵ بیرکردنەوە کە نیشانەی خودێتی ئەوە، باوەڕهێنان بەئایدیۆلۆژیا دەستبەرداربوونی ئەم تاکایەتییەیە. باوەڕهێنان بەئایدیۆلۆژیا ملکەچ کردنە بۆ داواکاری یەك بەرگی‌و وەك یەك بوون‌و وەك یەك بیرکردنەوە. هەر بۆیەشە ئارێنت دەنوسیّ:

**ئایدیۆلۆژیاکان، ئەو بۆچوونە بێزیانانەن،**
**نارەخنەیی‌و هەرەمەك تا ئەو کاتەی کە بەجدی**
**وەرناگیرێن، بەڵام ئەو کاتەی ئیدعاکانیان بۆ راستی**
**بوونی بەموتڵەقیان بەشێوەی حەرفی وەربگیریّ ئەوا**

**دەبنە سیستەمی لۆژیکی کە تیایاندا هەموو شتەکان**
**لەخۆدەگرن گەربێت و موقەدیمەی یەکەم قبولّ کرا.**
**دێوانەیی سیستەمیّ لەو جۆرە لە موقەدیمەی یەکەمدا**
**نییە بەڵکو لەسەر جەم لۆژیکی ئەو سیستەمەدایە.**
**لۆژیکی بوونی عەجیبی هەموو "ئیزمەکان** isms"،
**سادە لەو حیان و باوەڕیان بە بەهای رزگاری**
(salvation) **خاوەن باوەڕەکان بیّ لەبەرچاوگرتنی**
**تایبەتمەندێتی و هەمەچەشنەیی، ئائەمە یەکەم گەرای**
**بوغزی تۆتالیتارییە لەواقیع و حەقیقەت.(٢٤)**

ئایدیۆلۆژیا بۆ چونێکی یەك بەرگی دەربارەی جیهان فەراهەم دەکا، بەلاّم جیهان زۆر ئالّۆزەو زەحمەتە ملکەچ بکا بۆ زاراوە سادەکان و سادە لەوحی ئایدیۆلۆژیا کە دەیەوێت هەمووشت ئەم زاراوانە تەفسیربکا. لەم حالّەتەدا کەسیّ کە هەلّگری یا پەیڕەویکەری ئایدیۆلۆژیایە کە دوو ئیختیاری لەبەردەمدایە: یا ئەوەتا دەرك بەوە دەکات کە سادەیی فەزیلّەت نییەو لەوە تێدەگا کە جیهان لەوە ئالّۆزترە کە ئەو ئایدیۆلۆژیایەی ئەو وێنەی دەکێشیّ، لێرەوە دەگەڕێتەوە بۆ بیرکردنەوەو عەقلّ و ئیدی دەستبەرداری ئایدیۆلۆژیا دەبێت. ئیختیاری دووەم ئەوەیە کە ئەو کەسە دژی واقیع دەوەستێتەوەو زیاترو زیاتر لەنێو دۆگماکانی ئەو ئایدیۆلۆژیایەدا غەرق دەبێت. کشانەوە لەواقیع و چوونە ناو جیهانە خەیالّی و ئەفسانەییەکەی کە ئایدیۆلۆژیا دروستی کردوەو جیهانێك کە ئیماندارەکانی هەمان ئایدیۆلۆژیا بەجیهانی خۆیانی دەزانن. لێرەوە هەنگاوی دواتر بریتی دەبێت لە دژایەتی کردنێکی پڕ لەکینەوڕق دژی ئەو کەسانەی کە ئەم ئایدیۆلۆژیایە دەخەنە ژێر پرسیارەوە.

ئەمەش بۆ پاراستنی ئەو ئایدیۆلۆژیایەو شاردنەوەی پینەو کەم و کوڕییەکانی ئەو ئایدیۆلۆژیایە، تاکو کارەکە بەوە دەگا کە ئەم ئایدیۆلۆژیایە بکرێت بەشتێك کە قابیلی ڕەت کردنەوە نیە، ئەو ئیماندارانەی ئایدیۆلۆژیا بە هیچ شێوەیەك بەرگەی هیچ تەحەدایەك ناگرن، هەر بۆیەشە هەنگاوی دوای میلیتاریستی بوونە. هەلّگرانی ئایدیۆلۆژیا هەر هەموو دەبنە ئەندامی کەلّت(Cult)،و ئنجا دەکەوتنە کوشتن و تیرۆرکردنی نەیارانی ئەو ئایدیۆلۆژیایە.

ئەم هەلّوێستەی پەیڕەوانی ئایدیۆلۆژیا وا لەئارێنت دەکا بلّیّ: باوەڕهێنان بەئایدیۆلۆژیا لە ناخیدا ئارەزووی" سەیتەرەی تەواو" لە خۆ دەگریّ. مادامێك ئایدیۆلۆژیا بەرگەی تەحەدای عەقلّی و موناقەشە ناگریّ، لێرەوە هەولّدەدا کە هەموو

شت داگیر بکا، هەموو شت بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە بەتایبەت ئەو شتانەی کەدژایەتی لەگەڵ بۆچوونی ئەو بەرامبەر بە جیهان دەکەن. هەروەها مادامێکیش خەڵکیو خاوەن توانای کرداری عەفەوینو ئەم کردارانەش هەڕەشەن لە ئایدیۆلۆژیا، ئیدی ئایدیۆلۆژیا هەوڵ دەدا کە کۆنترۆڵی هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی خەڵکی بکا. کەواتە هەموو ئایدیۆلۆژیاکان تۆتالیتارین، هەر هەموو تەفسیرێکی شمولین بۆجیهان، داوا دەکەن کە جیهان کۆنترۆڵ بکرێتو بخرێتە ژێر ڕکێفی یەك بەرگی ئایدیۆلۆژیاوە. کەواتە ئایدیۆلۆژیا هەڵگری تۆوی تۆتالیتاریانیزمە. بەلام لێرەدا پرسیارێك ڕوو بە ڕوومان دەبێتەوە، گەر هەموو ئایدیۆلۆژیایەك تۆتالیتاریانیزمی‌یە بۆچی تەنیا نازیزمو کۆمۆنیزم بوونە مایەی دامەزراندنی ترسناکترین ستەمکاری، نەك ئایدیۆلۆژیاکانی دی؟ وەلامی ئارێنت ئەوەیە کە دەبێت لەو هەل ومەرجانە بدوێین کە زەمینەیان خۆش کرد بۆ سەرهەڵدانی ئەم دوو ئایدیۆلۆژیا ترسناکەو ئەم دوو بزووتنەوەیە لەئەڵمانیاو لەروسیادا. ئارێنت دوو بەشی کتێبەکەی"ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزم"ی تەرخان کردووە بۆ تاوانبارکردنی مۆدێرنتی وەك کێشە سەرەکی یەکە. مۆدێرنتی لای ئارێنت واتە" نامۆبوونanomie" قەیرانی شوناس، دوورخستنەوەی خەڵکی لەبڕیارەکانی کە بەژیانیان شێوە دەبەخشیو ئەو بڕیارانەی کە جۆری ژیانیان دیاریدەکا. وەك باسمان کرد، ژیانی مۆدێرن واتە زاڵ بوونی ژیانی شەخسی بەسەر ژیانی مەدەنیدا کە دەبێتە مایەی لەدەستدانی دیدەگا(perspective)و تێگەیشتن لە"بوون لە جیهاندا"، هۆی ئەوەی کە کۆمۆنیزمو نازیزم سەرکەوتوبوون دەگەڕێتەوە بۆ توانای ئەم دوو ئایدیۆلۆژیایە لەتەسخیرکردنی خەڵکیو بەکارهێنانی هەستکردن بە نامۆ بوونی خەڵکیو لەدەستدانی هەستی کۆمیونتی"جڤات". ئەم دوو ئایدیۆلۆژیایە توانیان دەغدەغە بە عەواتفەکانی خەڵکی بکەنو بیانهێننە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. هەروەها گرنگە لەیادمان بێت کە ئەو دوو ئایدیۆلۆژیایە بەرئەنجامی بزوتنەوەی جەماوەری(masses) بوون. هەردووك دوو ئایدیۆلۆژیای ڕادیکال بوونو بەو موژدەیەوە هاتنە پێش کەتەنیا ئومێد والەدابڕانێکی موتڵەقدا لەگەڵ ئێستادا، ئێستای نامۆبوونی کۆمەلایەتی، لێرەوە کۆنترۆڵی خەیاڵی ژمارەیەك لەخەڵکیان کرد. هەروەها لەیادمان بێت کە گوتاری سیاسی ئاسایی لەئەڵمانیاو ڕووسیا لەکاتی سەرهەڵدانی ئەو دوو بزوتنەوەیەدا لاواز بوون گەر نەڵێین بەتەواوی لێك هەڵوەشابوونەوە تائەمەش بووە مایەی دەرگا خستنە سەرپشت بۆ ئەم دوو ئایدۆلۆژیایە کە هەڵگری تۆوی ستەمکاری بوون.

خاڵێکیتر کە زۆر جەوهەری‌یە، دەربارەی نەتوانینی ئایدیۆلۆژیاکانی دی بۆ هێنانە کایەوەی سیستمی تۆتالیتاری ئەم خاڵەیە: بوونی هەلومەرجی دیموکراسی.

له هەرشوێنێکدا هەلومەرجی دیموکراسی هەبێت دەبێتە مایەی رێگرتن لەوەی کە ئایدیۆلۆژیاکان ببنە تۆتالیتاری چونکە ئەو ئایدیۆلۆژیایانە هەمیشە لەژێر تاقی کردنەوەدان‌و دەبنە بابەتی رەخنەو هەڵسەنگاندنی عەقڵی. لەم ئاوو هەوایەدا پارتە سیاسیەکان لێپرسراون لەبەردەم ئەندامەکانیان‌و ئنجا بواری گشتی(public)و ئایدیۆلۆژیاکانیش دەبنە مادەی گفت‌وگۆی عەقڵی. بەلاّم ئەوکاتەی کەجەستەی سیاسی تێك دەشکێ‌و بواری گشتی(public) لاواز دەبێ‌و کۆمەڵگای مەدەنی لەناو دەچێ، ئەمە رەچەتەیەکە بۆ دەست بەسەراگرتنی مەیدانەکە لەلایەن ئایدیۆلۆژیایەکەوە کە دێت‌و چەندین پەیمان‌و مژدە لەگەڵ خۆی دەهێنێ‌و لەدواجاردا بە دامەزراندنی سیستەمێکی تۆتالیتاری کۆتایی بە گەمەکە دێت. لەم حاڵەتەشدا لە جیاتی بەشداری کردن لە گفت‌وگۆدا، سیستەمێکی داخراو کە تێیدا یەك بەرگی بالاّدەست دەبێت دادەمەزرێت. لە هەلومەرجی ئاوهادا ئایدیۆلۆژیا بە تەواوی تەعبیر لەجەوهەری ستەمکاری خۆی دەکا.

ئەو کاتەی ئایدیۆلۆژیاکان دەبنە مایەی پاسف بوونی عەقڵی‌و سیاسی چونکە لەجەوهەردا ئەوان کۆششێکی نائومێدانەن بۆ راکردن لە لێپرسراوێتی، خۆیان دەشارنەوە لەپاڵ ئیدعای زانستی بوونیانداو کەشف کردنی یاسا زانستی‌یەکانی مێژوو یا کۆمەڵگا، لێرەوە ئایدیۆلۆژیا داوامان لێدەکا کە سەر دانەوێنین بۆ ئەو شتەی کە حەتمی‌یە، تا ببینە موسافیرێکی ئەو شەمەندەفەرەی مێژوو، پرسیار نەکەین بۆو چۆن، چونکە حەقیقەتەکان لەلایەن ئایدیۆلۆژیاوە کەشف کراون‌و ئیدی ئەوەی لە سەر ئێمەیە مل کەچ کردن‌و رازی‌بوونە، لەکاتێکدا بە شێوەیەکی سروشتی ئینسانی عادی(average) زوو تەسلیمی ئایدیۆلۆژیا دەبێت، بەلاّم ئەمە کافی نیە، لەبەر ئەوە دەبێت پەیڕەوانی ئایدیۆلۆژیا کارێك بکەن کە هەر هەموو دانیشتوان فێری ئەوەبن کە چۆن لە بەیانیاندا ئەوە دووبارە بکەنەوە کە شەوی رابردوو سەرکردەی فەرماندە فەرموی، رۆژنامەکان دەبێت"فەرمودەکانی" پاڵەوانی نەتەوە چاپ بکەن، دوێنێ پاڵەوانی نەتەوە کێی بینی‌و چی کردو چی گوت. دەبێت خەڵکی فێربن کە ئەو بۆچوونەی هەفتەیەك بەر لەئێستە لەو دیوو گومانەوە بوو، ئۆرسۆدەکسی بوو، ئەمرۆ دەبێت بەخەتەرناك لەقەڵەمی بدەن. ئایدیۆلۆژیاکان ئەوە دیاریدەکەن کە رەوایە، ئەوەش کە رەوانییە، ئەوەی رەوایە شوێنی باوەڕە، دەبێت یەك سەرچاوە هەبێت بۆ ئۆتۆرەتی، یەك کەسایەتی کەلەو دیوو رەتکردنەوەو گومانەوەیە، هیتلەرو ستالین‌و ماوتسی تۆنغ لەودیو تەحەداو گومانەوە بوون. ئایدیای ئەوەی کە سەرکردە لێپرسراوبێت‌و شوێنی لێپرسینەوەی ئەندامەکانی بزوتنەوەکە، ئەم ئایدیایە تەواوپێچەوانەی ئەو لۆژیکەیە کە ئەو بزوتنەوەیەی لەسەر

بەندە. ئەوە سەرکردەیە کە بڕیاری هەمووشت دەدات، کام دامو دەستگا فلآنەکاربکاو کام دامو دەستگای دی نەیکا، کێ لێپرسراو بێت لەچی. گرنگ نییە سەرکردە نەخوێندەوارە بەلآم هەقی ئیلاهی ئەوە کە لەکۆنفرانسی چاککردنی زانکۆدا وتار بخوێنێتەوە، پرۆفیسۆرەکان گوێ لەفەرمایشتە نازانستییەکانی ئەو بگرن، ئەو خۆیەتی کە دەزانێ زانکۆ دەبێت چۆن بڕوات بەڕێوە، سەرباز چی بکا، پرۆفیسۆر چی بکا، زانا چۆن لەموختەبەردا کاربکا، هەر هەموو فەرمایشتەکانیشی لەرۆژنامەو دۆکومینتە دەوڵەتیو کۆمەلآیەتیو ئیدارییەکاندا دەبێت بلآوبکرێنەوەو بپارێزرێن. تەنیا سەرکردە دەتوانێ بڕیار لەسەر ئەوشتانە بدا چونکی تەنیا ئەو دەزانێ کەسیستەمەکە چۆن کار دەکات.

کەواتە کلیلی تێگەیشتن لەسروشتی سیستەمی تۆتالیتاری بریتییە لەتێگەیشتن لە ئایدیۆلۆژیاو چۆنیەتی کارکردنی. ئایدیۆلۆژیا ئیدیعا دەکا کە تێگەیشتنێکی سەراپاگیری پێیە لەمەڕ رابردووی ئێمەو شتەکان ئێستاو داهاتووش ٠ ئەم تێگەیشتنەش ناو دەبرێ بەزانستی٠ هیچ بوارێك نامێنێتەوە بۆ تەفسیر کردن یابیرکردنەوە لەبەرئەوەی ئایدیۆلۆژیا لۆژیکییە٠ سیستەمێکی بیروباوەڕەولەسەر مەبنای زانستی یەوە دامەزراوە، ئیدی تەفسیر هیچ نیی‌یە جگە لەکاریکی بێ سود، ئەمە ئەگەر هەرهەمان شتەکانی ئایدیۆژیا دووبارە بکاتەوە، خۆئەگەر شتێکی تر بلێ ئەوە هەر لەبنەرەتەوە شوێنی مەترسی یە دەبێت قەدەغە بکردرێت، کەواتە هەبوونی ئایدۆلۆژیا واتە ڕزگارکردنی تاکەکەس لەلێپرسراوێتی وئەرکی بیرکردنەوە ٠ ئەمەش واتە تەسلیم بوونی سەربەخۆیو هۆشیاری ـ خود، ٠تەسلیم بوون بە سیستەمێکی داخراو.

بەلآم لەبەر ئەوەی جیهان ئالۆزەو خەلکی وەك یەك بیرنا کەنەوە لێرەوە بۆ پاراستنی ئایدیۆلۆژیا ورێگەگرتن لەکەوتنی ئادیۆلۆژیاو کۆنترۆل کردنی هەموو کەس دەبێتە پێویستی یەکی نکۆلی لێنەکراو٠ تەنیا لە رێگەی سەیتەرەی شمولی یەوەیە کە جیهانە خەیالی یەکەی ئایدیۆ لۆژیا دەتوانێ. هەناسە بداونەکەوێ هەرئەم ئارەزوەشە٠ ئارەزوی کۆنترۆل کردنی جیهان و هەمووتوخمەکان وڕەهەندەکانی ژیان کە زۆرتاییەتە بە تۆتالیتارینزم

ئارنێت نایەوێت تەنها پێمان بلێ کە سیستەمی تۆتالیتاری چیی‌یە بەلکو دەشیەوێت پێمان بلێ ژیان لەژێرسایەی سیستەمێکی تۆتالیتاریدا چۆنە ٠

زۆرگرنگە کە لە یادمان بێت کە پەیرەویکردن لەئایدیۆلۆژیاییەك هەر ئایدیۆلۆژیایەك بێت، ڕەنگەو بگرەتاسنورێکی زۆر راستە کە ببێتە مایەی نەبونی هەلکردن(تسامح) بەرامبەر بە بۆچوونو جیهانبینی دیکە٠ کاتێك کۆمەلەخەلکێك

گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ئایدیۆلۆژیایەك دەتوانی وەلامی هەمووپرسیارەکانی بداتەوە· ئیدی ناتوانن هەلبکەن لەگەل کەسانیدی. لە مەترسناکتر پەیرەوی کردن لە ئایدۆلۆژیا خۆی واتە دەستبەرداربون لەخودێتی هەریەك لەپەیرەوانی ئایدیۆلۆژیا ·کەواتە ئەوەنەبونی تەسامح نەبووە کە بووەمایەی گۆلاكو کامپەکانی مەرگ بەلکو ئارەزووی دەربازبون لە لێپرسراویەتیخودێتیو تاکایەتیو ئارەزووی دلنیابونی موتلەق· ئایدیۆلۆژیاتەنیا ئەو کاتە گیانی سالم دەردەکا کەئەو کەسانەی دەتوانن حوکمیبەسەردابدەن وبیکەنە مادەی گفت وگۆیعەقل· ئەوکەسانە خەفە بکرێن ·ئەمەش تەنها لەرێگەی تیرۆرکردنی خەلکەوە دێت· هەر رژێمێ کەبە خەفە کردنی دەنگینەیاران و دەنگی عەقل و گفتوگۆی عەقلی هەلبستێ خودبە خود رژێمێکی تۆتالیتاریە· هەرئایدیۆلۆژیایەکیش لە پرنسیپێکدا سیحری تێگەیشتنی هەموو دیاردەکان ببینێتەوە· دەبێتە رێگر لە بەردەم بیرکردنەوەی سەربەخۆدا.

کەزانیمان ستەمکاری هەمیشە ئەگەرێك بوەو ئەگەرێکە لەژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو کلتوری جڤاتەکاندا، لەنێو کۆمەڵگاکاندا، ئەو پرسیارە بەناچاری خۆی دەسەپێنێ کە ئێمە ، ئینسانەکان جڤاتەکان چ میکانیزمێك شك دەبەین بۆ رێگرتن لە ستەمکاری یا رزگار بوون لە ستەمکاری؟ فەلسەفە کە گوتمان لە مێژووی خۆیدا بەشێوەی جیاواز جیاواز دەست و پەنجەی لەتەك ستەمکاریدا نەرم کردوە. چ رێگا چارەسەرێك پێشنیار دەکا بۆ دروست کردنی بەربەستێك لەبەردەم ئەم ئەگەرە ترسناکەدا کەستەمکاریە؟ گوتمان ئایدیۆلۆژیا خۆی هەڵگری تۆوی ستەمکاریی‌یە، کەواتە هەموو ئەو پەیمانو دروشمو ئایدیاو زاقو بریقەی کە ئایدیۆلۆژیاکان هەڵیان گرتوەو زۆرجار وەك پرۆژەیەك بۆ رزگاربوون لەستەمکاری خۆ دەنوێنن ، هەموو ئەمانە لە باشترین حاڵەتدا کۆمەڵێ درۆو فێڵ و وەهمنو ئەفسانەو لە خراپترین حاڵەتیشدا پرۆژەی ستەمکاریەکی تازەن، کەواتە شۆڕشو بەرپاکردنی شۆڕشو راپەرینو دروشمی رادیکاڵیانەی گۆڕانو گۆڕانی بنەرەتی کەئایدیۆلۆژیاکانی دروستکراوی مۆدێرنتی پێشنیاریان کردووە لەرابووردوداو ئێستاش وێڕای ئەو سیستەمە ستەمکاریانەی کە هەموو ئەو ئایدیۆلۆژیانە (لەوانە کۆمۆنیزم، ناسیۆنالیزم، سۆشیالیزم بەهەموو جۆرەکانیەوەو، لیبرالیزم)، دروستیان کردوە، پێشنیاری دەکەن، بەتەواوی دەبێت لە هاوکێشەکە ئایدیۆلۆژیا بخەینە دەرەوە، لێرەدا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ فەلسەفەو لە فەلسەفەدا بۆ رێگا چارەیەك بگەڕێین، فەلسەفەش پێشنیاری پەروەردەی لیبراڵ دەکا وەك میکانیزمێك، پرۆژەیەك بۆ دروست کردنی بەربەستێك لەبەردەم ستەمکاریدا هەر بۆیەشە لێرەدا ئێمە باس لەپەروەردەی لیبراڵ و زانکۆ دەکەین لە پەیوەندیدا بەستەمکاریی‌یەوە.

* * *

"مانای تەقلیدی پەروەردەی لیبراڵ لەم بۆچوونەی ئەم نوسەرە مرۆڤ دۆستەی رێنسانس دا ڤێرگیریۆس بەجوانی خۆی بەیاندەکا:

**ئێمە ئەو لێکۆڵینەوانە ناو دەبەین بە لیبراڵ کە شایانی ئینسانی ئازادن، ئەو لێکۆڵینەوانەی کەلە رێگەیانەوە ئێمە دەستمان بەفەزیلەت و حیکمەت دەگاو پراکتیکی فەزیلەت دەکەین، ئەو پەروەردەیەی کە مەشق بە ئەوکەسانە دەکاو ئەوانە گەشەپێدەدا**

**که خاوەنی بەهرەی بەرزی عەقڵی و جەستەیین ، ئەو نەجیبانەی کەلەپلەو پایەدا وان لەڕیزی فەزیلەت خۆیدا "(١).**

مانا بنەڕەتیەکەی پەروەردەی لیبراڵ بریتییە لەهەوڵدان بۆ بەیانکردنی سروشتی ئینسان لەهەمە بنەڕەتیو هەمیشەییەکاندا. زیاتر لەمە، پەروەردەی لیبراڵ گریمانکاری ئەوە دەکا کە جەوهەری ئینسان ئەوکاتە دەدرەوشێتەوە کە پەیوەندی ئینسان بەجڤاتی سیاسییەوە political community ڕۆشنکرایەوە. بەڕای بیریارە کلاسیکیەکان ژیانی ئینسان نوقسانە، کەمو کوڕی دەبێت لەدەرەوەی بوون بەئەندام لەکۆمەڵەیەکی مەدەنیدا،و ژیانی ئینسان ناتوانرێ بەدروستی لەسەر بنەمای تاکە کەسییەوە شایانی تێگەیشتن بیو پڕمانابێت. لێرەوە پەروەردەی لیبراڵ بریتییە لەپەروەردەی مەدەنی. لیۆشتراوس لەوتارێکدا بەناوی "پەروەردەی لیبراڵ چییە"دەڵێ:

**"پەروەردەی لیبراڵ پەروەردەیەکە لەکلتووردا یاخود بەرەو کلتوور. بەروبوومی پەروەردەی لیبراڵ بریتییە لەئینسانێکی خاوەن کلتور (cultured). کلتوور لەبنەڕەتدا واتە کشتوکاڵ، کێڵانی زەویو پەروەردەکردنی بەروبووم.. کلتور واتە کێڵان، پەروەردەکردنی عەقڵ، بەتەنگەوەهاتنی عەقڵو گەشەپێدانی عەقڵیش پێویستی بەمامۆستا هەیە"(٢)**

شتراوس لەهەمان ووتاردا دەڵێ کە پەروەردەی لیبراڵ پێکهاتووە لەخوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی کتێبە مەزنەکان بەدیقەتو بەووریاییەوە، ئەو کتێبە مەزنانەی عەقڵە مەزنەکان بۆیان جێ هێشتووین. بەڕای شتراوس پەروەردەی لیبراڵ لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا ئەو پەیژەیەیە کە ئێمەپیایدا سەردەکەوین لە پلەی یەکەمەوە کە دیموکراسی جەماوەرە بەرەو پلەکانی سەرەوەی دیموکراسی بەمانا ڕەسەنەکەی دیموکراسی. کەواتە پەروەردەی لیبراڵ هەوڵو کۆششێکی پێویستە بۆ "دۆزینەوەی ئۆرستۆکراسیەتێك لەنێو ئەم دەریای دیموکراسیەتەی گاڕاندا". ئاشکرایە کە ئەم بۆچوونەی شتراوس خۆی ڕەخنەگرتنە لەو شتە عەجیبەی کە پێی دەڵێن "کلتوری جەماوەر یا حەشامات Mass culture". دیارە شتراوس تەنیا بیریارێك نەبوو لەسەدەی بستەمدا کە دژ بەوکارەساتە بوەستێتەوە کە پێی دەڵێن "کلتوری حەشامات". گەر پەروەردەی لیبڕاڵ بریتی بێت لەو پەیژەیەی کە ئێمە سەردەخاتە

سەرەو ە بۆ گەیشتن بەمەزنی، مومتاز بوون، شادبوون بە بەرهەمە گەورەکانی ئینسان، شادبوون بەرۆحانیەتێکی باڵا، ئەو پەیژەیەی سەرمان دەخاتە سەرەوە تاببینین عەقلْ چ شاکارێکی خوڵقاندوەو گفتوگۆ بکەین لەتەك عەقڵە گەورەکاندا، ئەمەش واتە کلتوور بەمانا کلاسیکیو رێنسانسیەکەی، گەر ئەوە پەروەردەی لیبراڵ بێت ئەوا کلتوری جەماوەر یا حەشامات داگرتنەوە یا هێنانە خوارەوەی ئێمەیە لەوبانیژەیەوە بەرەو ژێر زەمینی ساویلکەیی، ژێر زەمینی گەمژەیی، سەردابی غەریزەکان، کەڵکەڵە ئاژەڵیەکان، کلتووری جەماوەر یا حەشامات Masses ئێمە دەکاتەوە بەئاژەڵ. لەو ژێرزەمینەدا کە کلتوری جەماوەری Mass ئێمەی بۆ کێشدەکا مانای کتێبی مەزن مردووە، خوێندنەوەی کتێبی پیرۆزو playboy وەك یەك مانایان هەیە، خوێندنەوەی "ددان پیادانانەکان"ی سانت ئۆگستینو خوێندنەوەی موغامەراتە سێکسیەکانی یاریکەرێك وەك یەکن. پەروەردەی لیبراڵ پەروەردەکردنێکی مەدەنییە بەومانایەی کە ئینسان لەبوونەوەر ێکی خامەوە دەکاتە هاونیشتمانی. لەدایەلۆگی "یاساکان"دا ئەسینایی غەریب دەڵێ ئەوشتەی کە پەروەردەی لیبراڵ لەپەروەردەکردنێکی دی جیادەکاتەوە گەر لەسەر ئاستی باڵا بێت، پەروەردەی دیکە بازارییەو نالیبراڵو ناشێ پێی بڵێین پەروەردە، ئەم خاڵەیە: پەروەردەی لیبراڵ بریتییە لەپەروەردەکردن لەمنداڵیەوە بۆ ئاشنابوون بە فەزیلەت، ئەو شتەی کە کارێك دەکا کەتاك ئارەزوو بکا ببێتە هاونیشتمانیەکی کامڵ، هاونیشتمانیەك کە دەزانێ چۆن فەرمانڕەوایەتی بکا بەعەدلەوەو چۆنیش فەرمانڕەوایەتی بکردرێ"[٣].

پەروەردەکردن لەبواری هاونیشتمانی کۆماریدا Republicanو پەروەردەکردنێك کە تۆوی حەماسەو عیشقو ئیلتزام بۆ بەشداریکردنی مەدەنیو بۆ عەدالەتی سیاسی لەهاونیشتمانیاندا پەروەردە دەکا، پەروەردەکردنێك بەم مانایە جێ هێشتنی مانای پەروەردەی لیبراڵ بەمانا ئەفلاتوونیەکەی نییە، بەڵکو بریتییە لەدڵی ئەوشتەی کە ئەفلاتوون بە پەروەردەی لیبراڵ لەقەڵەمی دەدا. پەروەردەی ئەفلاتوونی رەهەندێکی بالاتری هەیە، ئەم رەهەندە باڵایەش لەدوا قۆناغدا رەهەندێکی فەلسەفییە. لەکاتی گفتوگۆکردنیدا لەسەر پەروەردەکردنی فەیلەسوفەکاندا لەکتێبی حەوتەم لەدایەلۆگی کۆماردا، سوکرات پەروەردەکردنی فەلسەفە بە "دیالکتیك" لەقەڵەم دەداو هەر زۆر زوو ئەو خاڵە روون دەکاتەوە کە "دیالکتیك" ناشێ لەرێگای قوتابخانەی گشتییەوە فێربکردرێ.. قوتابخانە دەتوانێ زەوییەکە ئامادەبکا بۆ تاکە کەسەکانو کردنیان بەهاورێو لەم رێگەیەوە زەمینە بۆ پەروەردەی فەلسەفی ئامادە دەکا. پەروەردەی لیبراڵ لەجەوهەریدا سەرگەرمی ئەوەیە کەئینسانەکان

بگونجێنیّ لەتەك جیهاندا، لەتەك یەكتردا، لەتەك ناكۆكیە ناو خۆییەكانی رۆحی خۆیاندا.

پێویستی بوون بە پەروەردە paideia (پەروەردە بەمانا یۆنانیەكەی) لەئەمڕۆدا زیاتر لەهەركات پێویستیەكە شوێنی نكۆڵی لێكردن نییە، زیاتر لەسەردەمەكانی دیكە. لەدوو وێنە ووردبینەوە، وێنەیەكی گشتی جیهان‌و وێنەیەكی تایبەتی وڵاتانی ئێمە. سەبارەت بەوێنەی یەكەم كەمەبەستمان باروودۆخی ئەمڕۆی جیهانە، دەبێت بڵێین كە ئەمڕۆ هێزێك، هێزێكی ئابووری‌و كۆمەڵایەتی پشت ئەستوور بەزانست‌و تەكنۆلۆژیا، باڵا دەستی پەیداكردوەو نیازی وایە، بەرنامەی درێژخایەنی هەیە كە جیهان بكاتە یەك بازاڕ یەك مەیدانی گەورەو ئینسانەكانیش هەر هەموو بەرەنجدەر (بەمانا هانا ئارێنتیەكەی رەنج). ئەم هێزە كە خۆی لەكۆمپانیا گەورەكاندا دەبینێتەوە لێپرسراو نییە لەهیچ، بەپێچەوانەی ئەو دام‌و دەستگا مەدەنیانەی دیكە، لەسیستەمە دیموكراسیەكاندا كە شوێنی لێپرسینەوەن گەر هاونیشتمانی هۆشیار حازربێت لەسەریان، ئەم كۆمپانیایانە كەڵكەڵەی تەماع‌و كۆكردنەوەی سامان لەپێناو ساماندا ئەو مۆتۆڕەیە كە دەیانجولێنیّ، پشت ئەستوور بەجیهانبینیەك كاردەكەن كە لەلایەك ئەم گۆی زەوییە، سروشت بە stuff شت‌و مەكی بیّ گیان، مادەی خام دەزانن، ئەم گۆی زەوییە هەیە بۆئەوەی توورِ هەڵبدرێتە ناو پرۆسەی بەرهەمهێنان‌و بەكارهێنان‌و ئنجا جارێكی دی بەردەوامی دان بەم سووڕە بۆ ئەبەد بەرئەنجامە فیكری‌و سیاسی‌و كۆمەڵایەتی‌و ئەخلاقیەكانی كە لەم مەبەست‌و نیازو دیدگای ئەم هێزەوە دەكەونەوە هێندە ترسناكن كە لەتوانای كەسێكدا نییە، توانای باسێكدا نییە، چەند كتێبێكدا نییە كە ئاماژەیان بۆبكا، لەبەرئەوە لێرەدا تەنیا ئەوەندەمان لەسەرە كە بڵێین ئەم هێزە یەكەم شت ئێمە لەهاونیشتمانێتی، هاونیشتمانی بوون دەخاو دەمانكاتە ئیشكەرو رەنجدەرو بەكارهێنەر. بۆ ئەوەی بەردەوامی بەژیان بدەین كە ژیان خۆی دەبێتە رەنجدانێكی رووت، بۆ ئەم مەبەستە پێویستمان بەووزە هەیە واتە دەبێت بخۆین‌و پێویستیە بایۆلۆژیەكانمان تێربكەین، لێرەوە دەبێت كار بكەین، ئیدی لەم بازنەیەدا بۆ هەمیشە گیردەخۆین‌و تەنیا ئیزافەیەك هەبێت كە كارێك بكا بەرگەی ئەم سووڕە بگرین ئەو شتەیە كە پێی دەڵێن Entertainment (تسلیە)و تەفریح‌و حەوانەوە، لێرەوە هونەرو ئەدەب دەبنە تەسلیەو حەوێنەرەوەو ماس میدیاش دەبێتە ئەو بنكەیەی كەفەراهەمی دەكا. لەمە ترسناكتر ئەوەیە كە سیاسەت وەكو هونەری پەروەردەكردنی رۆح‌و هونەری گفتوگۆو دەمەتەقیّی عەقڵی دەبێتە ئینتەر تەیمێنت، حەوێنەرەوە، واتە ئێمە لەئینسان بوون دەكەوین، لەهاونیشتمانی بوون

دەكەوین‌و گۆشەگیردەبین‌و خۆمان دەمێنینەوە بە ریمۆت كۆنترۆڵێكەوە لەبەردەم تەلەفزیۆنێكدا. دەسكەوتە رۆحییە گەورەكانی ئینسان وەكو ئەدەب‌و سیاسەت‌و هونەر دەبنە هۆكاری رابواردن، گفتوگۆكان دەبنە چەند ئامارێك یا دەمەتەقێی ئەو كەسانەی بەپسپۆر ناو دەبرێن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەوە كە لەنێوان كۆمێرشاڵەكاندا باس لەگۆڕە دەستە جەمعییەكان دەكەن، خودی گۆڕەكان‌و كارەساتەكان ماناكان لەدەست دەدەن. قسەكردنیش لەسەر چارەنووسی ئینسانەكان دەبێتە ئیشی ئەوكەسانەی كە لەودیو پەردەوە لەئۆتێلەكاندا، لەپاپۆڕەكاندا بەنهێنی وەك مانیجەری كۆمپانیاكان بڕیار دەدەن چی بخۆین، چۆن بیربكەینەوە، چی لەبەربكەین، كامە حەب بەكار بهێنین، كام فیلم ببینین، چ سیستەمێكی سیاسیمان هەبێت، كێ سەركردەمان بێت‌و چەند بژین‌و چۆن بژین. یەكورتیەكەی ئەم هێزە كەناوی نیو لیبراڵیزمەو جەوهەری مۆدێرنتییە گەرەكیەتی لەسەر ئاستی جیهان كۆپلایەتی كۆمەلایەتی‌و ستەمكاری نەرم‌و نیان كە نمونەكەی ئەمریكایە گلۆبالایز بكا، بەجیهانی بكا. لەبەردەم ئەو وێنە گشتییەدا دەڵێین پەروەردەی لیبراڵ ئەمڕۆ تاكە ئەڵتەرناتیڤێكە كە لێوەی جارێكی دی ئینسانیەتی خۆمان كەشف بكەینەوە، بەكتێبە مەزنەكان كە بەروبوومی عەقڵ‌و حیكمەتی رابووردون ئاشنابینەوە، جارێكی دی خۆمان وەك هاونیشتمانی ببینینەوە لەسەر ئاستی ئەو جڤاتەی كە لەناویدا دەژین‌و ئنجا هاونیشتمانیەكی سەر ئەم گۆی زەوییە جارێكی دی ئینتمامان تۆخ بكەینەوە. پەروەردەی لیبراڵ تاكە ئەڵتەرناتیڤێكە دژ بەو شیزۆفرینیا دەستە جەمعییە كە پێی دەڵێن كلتووری حەشامات Mass culture.

هەرچی پەیوەندی بەوێنە تایبەتیەكەوە هەیە دەبێت ئامارژدە بەبارودۆخی ئەو وڵاتانەی لەمەڕ خۆمانەوە بدەین كە لێوانلێون لەقەیران، قەیرانی سیاسی‌و رۆحی‌و فیكری‌و كۆمەلایەتی، ئەوكلتورانەی كە گیریان خواردو،و ئیدی بیركردنەوە بەرهەم ناهێنن‌و ئینسانەكانی نێوە ئەو كلتورانە ئیدی بیرناكەنەوەو هەمووشت لەژیانیان لەماندوو بونێكی سەدەكان قسەدەكا، ئایدیۆلۆژیاكان فریادرەس نین بەڵكو خەمیری كارەساتەكانن، لێرەوە تاكە ئەڵتەرناتیڤێك بمێنێتەوە بۆمان وەك رزگار كەرێك لەوقەیرانە قوڵانە هیچ نییە جگە لە پەروەردەی لیبراڵ.

ئێمە پێویستمان بەوەیە كە بكرێینەوە لەبەردەم ئەو ئەگەرەدا كە كۆمەڵێ عەقڵ هەن دەتوانن بەرزبینەوە بۆ ئاستی سەروو زەمەنەكەی خۆیان‌و لەودیو سەدەكانەوە قسەبكەن لەپرۆسەی هەوڵ‌و كۆششی ئینسانیدا بۆ تێگەیشتن لەهەل‌و مەرجی ئینسان. بەمانایەكی دی یەكەم هەنگاوی پەروەردەی لیبڕاڵ رەخنەگرتنە لەمێژوویێتی (هیستۆریسزم التأریخانیة) كە پێ دادەگرێت لەسەر ئەو پرنسیپەی كە

هەر بۆ چونێك، بیرۆكەیەك، نووسەرێك كتێبێك، فەلسەفەیەك زادەی شوێن‌و زەمانێكی دیاریكراوەو ناتوانیٚ وەلاٚمگۆی پرسیارو كێشەكانی سەردەم‌و شوێنەكانی دیكەبێت. بۆخستنەژێر پرسیاری دۆگمای مێژوویێتی كە دەیەویٚ ئێمە لەمیراتێكی دەوڵەمەندی ئینسانی دابڕیٚ، ئێمە پێویستمان بەخوێندنەوەی كتێبە مەزنەكانەو مەبەستیش لەخوێندنەوەی كتێب‌و عەقڵە گەورەكان فەراهەم كردنی گفتوگۆیەكی عەقڵی‌و رۆحانیە لەتەك ئەو میراتە دەوڵەمەندەدا.

* * *

فەلسەفەی پەروەردەی لیبراڵ بەسوكرات دەست پێدەكاو ئێمەش لەسوكراتەوە سەرەتای گەشتەكەمان دەست پێدەكەین. لەساڵی 399 ی پێش زاینیدا سوكرات دادگایی كراو تاوانباركرا بەوەی كە خودا نەناسەو باوەڕی بەو خودایە نییە كەشاری ئەسینا باوەڕی پێیەتی‌و ئنجا تاوانباركرا بەوەی كە گەنجەكان فاسد دەكا. دەتوانین سیٚ خاسیەتی پەروەردەی سوكراتی دیاری بكەین كە لەبەرهەمەكانی ئەفلاتوون‌و زینۆفۆندا دەیانبینینەوە:

١ـ خاسیەتی یەكەم بریتییە لەپێداگرتن لەسەر بیركردنەوەی نەقدی‌و پتەوو گونجاو.

٢ـ خاسیەتی دووهەم بریتییە لەسەیركردنی پەروەردە وەك پرۆسەیەكی بەردەوام كە تێیدا چ مامۆستاو چ قوتابیش هەردووك چاو لەوە دەبڕن كە فێربن، بەپێچەوانەی پەروەردەیەكەوە كە تێیدا مامۆستا بانگە شەی ئەوە دەكا كە هەموو حەقیقەتی لا هەیەو قوتابی تەنیا گویٚ گرتنی لەسەرە.

٣ـ خاسیەتی سێیەم بریتییە لەپەروەردە لەبواری فەلسەفەدا بەو نیازەی كە فەلسەفە نەك كۆمەكیان بكا بۆ چۆنێتی ژیان، ژیانێكی چاك لەسەر ئاستی تاكەكەس‌و چۆنێتی بەتەنگەوەهاتنی رۆح، بەڵكو فەلسەفە بەكارە سیاسییەكەی خۆی هەڵبستیٚ ئەویش رووناكی خستنە سەر ژیانی جڤات.

سوكرات لەدایەلۆگی گۆرگیاسداپرسیار دەكا:

"من سەر بەچ گروپێكم؟ من لەگەڵ ئەوانەدام
كە خۆشحاڵ دەبن رەت بكرێنەوە، منیش خۆشحاڵ دەبم
رەت بكرێمەوە گەر شتێك بڵێم راست نەبێت، خۆشحاڵیش دەبم
كە كەسێك رەت بكەمەوە گەر شتێك بڵیٚ راست نەبێت
بەلاٚم لەراستیدا زۆرتر خۆشحاڵ دەبم كە رەتبكرێمەوە
نەك رەت بكەمەوە. من لەو باوەڕەدام
كەچاكەیەكی مەزنە كە لەدەست هەڵەو خراپە رزگار بكردریٚ
چاكترە لەوەی كە كەسێكی دی لەو بەلاٚیە رزگاركەی". [٤]

لەو وێنەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە قەناعەتێ نییە، بۆچوونێك نییە، مەسەلەیەك نییە کەنەچێتە ژێر پرسیارو رەخنەوەو نەبێتە بابەتی گفتوگۆ، گفتوگۆش گەمەنییەو ئامانجیش لێی بردنەوەی گەمەیەك نییە، گەیشتن بەپلەو پایەیەك نییە بەڵکو گفتوگۆ لەلایەکەوە تۆخکردنەوەی ئینسانی بوونی ئێمەیە بەشێوەیەکی بەردەوام، لەلایەکی دیکەوە بۆزانینی جوانیو راستیو فەزیلەتە. کاتێك کەسێك بانگەشەی مەعریفە بکا سوکرات روبەڕووی ئایرۆنیەکەی (موفارەقە) خۆی دەکاتەوە، ئەو ئایرۆنیەی کە بەو کەسە دەڵێ: من دەبمە قوتابیت تەنیا لەوکاتەدا گەر شتێك بڵێی کە لەبەردەم پرسیارەکانمدا خۆی بۆ رابگیرێ. سوکرات لێرەدا رۆڵی مامۆستا نابینێ بەڵکو رۆڵی قوتابیەکی فەلسەفە دەبینێ کە فەلسەفە لەپرسیارکردندا دەبینێتەوە. لەم پرۆسەیەدا سوکرات خۆشیو هاو دایەلۆگەکانی رادەکێشێتە ناو پرۆسەیەکی درێژخایەنەوە کە پەروەردەی عومرە، ئەم گفتوگۆیانە رۆڵی پەروەردەکردنی خودself-education دەبینن چ بۆ سوکراتو چ بۆ هاو دایەلۆگەکانی سوکرات هەمیشە پێ لەسەر تاقیکردنەوەی بۆ چوونەکانی خۆی دادەگرێو هەوڵیش دەدا کە هاو دایەلۆگەکانی کارێك بکەن کە تاقیکردنەوەی - خۆ بکەنە پرۆژەی خۆیان. لەدایەلۆگی عوزرخواییدا دەخوێنینەوە:

"مەزنترین چاکە بۆ ئینسان بریتییە لەگفتوگۆکردن
لەسەر فەزیلەت هەموو رۆژێ.. چونکی ژیانێکی
تاقی نەکراوە شایانی ژین نییە بۆ ئینسانەکان."(٥)

پرۆژەی سوکرات، پەروەردەی - خۆ و تاقیکردنەوەی - خۆ، پرۆژەی تەمەنی سوکرات بوو، ئەو پرۆژەیەی کە مەبەستەکەی بریتی بوو لەمەعریفەی - خۆ، ئەو پرۆژەیەی کە لەزۆربەی دایەلۆگەکاندا خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە فەیلەسوف هەمیشە پێ لەسەر نەزانینی خۆی دابگرێتەوە. ئەوەی سوکرات دەیزانێ لەباشترین حاڵەتدا راگرتنی مانای نەزانینی خۆیە لەرێگای تاقیکردنەوەی خۆیەوەو راستەوخۆیانە. لەعوزر خوایدا سوکرات باس لەوە دەکا کە چۆن. لەرێگای ئۆراکڵەوە (oracle) (وەحی ئیلاهی) کە بەهاورێکەی گوتراوە گوایا سوکرات لەناو ئینسانەکاندا لەهەمووان زیاتر حەکیم ترە، چۆن ئەمە سوکرات دەخاتە سەر رێگای کەشفکردنی حەقیقەت یا لوغزی ئەم ئۆراکڵە. (٦)

سوکرات دەست دەکاتە گەڕان بۆ پەیداکردنی کەسێ کە حەکیم بێت یا حەکیم تر بێت لەخۆی. ئەو دەست دەکاتە پرسیارکردن لەو کەسایەتیو توێژانەی شاری ئەسینا لەوانە سیاسەتمەدارەکانو شاعیرەکانو خاوەن پیشەکان. لەئەنجامی ئەم گەشتە لەپرسیارو وەڵامدا سوکرات بۆی دەردەکەوێ کە سیاسەتمەدارو شاعیرەکان

جاهیل‌و نەفامن‌و تەنیا ئیدعای مەعریفەیان هەیە نەك خودی مەعریفە. هەرچی پەیوەندی بەخاوەن پیشەکانەوە هەیە ئەوان لە زۆر شت ئاگادارن‌و زۆر شت دەزانن لەوانە پیشەکانی خۆیان بەڵام هەر بەهۆی ئەم زانینە کەمانەوە بەهەڵەدا دەچن‌و وا تەسەور دەکەن کە دەربارەی پرسیارو کێشە گەورەکانیش دەزانن، لەوانە فەزیلەت، عەدالەت.. هتد. بەڵام ئەمان بێ ئاگان لەوەی کە هیچ دەربارەی شتە مەزنەکان نازانن. لەئەنجامدا سوکرات دەرك بەم حیکمەتە دەکا ئەویش ئەوەی کە سوکرات دەشێ لەهەمووان حەکیم تر بێت بەڵام لەدوو خاڵدا. یەکەم: ئەو دەزانێ کەنازانێ، دوو: حیکمەتی ئینسانی لەبەرانبەر حیکمەتی خودادا بێ بەهایە.

لەشوێنێکی تردا سوکرات دەبینین کە لەتەك سۆفستائیەکاندا دەرگیرە، لەوانە پرتۆگۆراس، گۆرگیاس، هیپپیاس، لەگەڵ قوتابیەکانی سۆفستائیەکاندا لەوانە مینۆ، ڤیدرۆس، لەگەڵ ژەنەراڵەکاندا وەکو لاچس، لەگەڵ گەنجەکان وەکو کلینیان لەدایەلۆگی یوسیمیۆس‌و لایس،و ئنجا کەسایەتی ئەلسابایەدیس. پەروەردەی سوکراتی بەپلەی یەکەم لەخستنەڕووی پرسیارێك یا چەند پرسیارێك پێك هاتوە، پرسیارێك کە فەیلەسوف دەیخاتەڕوو بۆ قسە لەسەر کردن. فەیلەسوف لێرەدا ئیدعای ئەوەناکا کە وەڵامەکە دەزانێ یاخود مامۆستای حەقیقەتە، نا، بەڵکو فەیلەسوف وەکو قوتابیەکان یا هاو دایەلۆگەکان دەیەوێ بزانێ، دەیەوێ فێربێ، دەیەوێ بەراستی مەسەلەکە بگا. بەڕای ئێمە دۆکترین یا عەقیدە یا دۆگمای سوکراتی وجودی نییە جگە لە خودی پرسیار، هەر ئەمەشە جەوهەری ناحاڵی بوونەکەی نیچەو هایدگەر ئنجا ئەوانەش کە بۆچوونی ئەمانە دووبارە دەکەنەوە، سەبارەت بەئەفلاتوون‌و سوکرات.

فەیلەسوف ئەو پرسیارانەی کە دەیانخاتە روو بۆ گوێگرەکان‌و هاو دایەلۆگەکانی چاو لەگفتوگۆیەکی دۆستانە دەبڕێ، بەڵام هاودایەلۆگەکان لێپرسراون بەرانبەر بەهەر وەڵامێ کە لەو گفتوگۆ دۆستانەیەدا خۆی بەیاندەکا. ئەم خاڵەی دوایی زۆر گرنگە چونکی لەم سیستەمە پەروەردەییەدا کەسانی بەشداربوو هەست دەکەن کە وەڵامەکانیان موڵکی ئەوانەو هەوڵی ئەوانە بۆ تێگەیشتن لەکێشەی شوێنی پرسیار. بەواتایەکی دی ئەمە پرۆسەیەکی بیرکردنەوەیە کە لەیەك کاتدا بیرکردنەوەیەکی سەر بەخۆیانەیەو ئنجا پرۆسەیەکیشە زەبت کردن (دیسپلین) لەخۆدەگرێ. لەیادمان بێت کە فەیلەسوف رێگە دەدا کە هاودایەلۆگەکان هەست بەلێپرسراوی بکەن لەبەردەم راکانیانداو سەربەستن رای خۆیان بخەنە بەردەم، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە فەیلەسوف رێگابدا هەمووشتێك بڕوا، هەمووشت شیاو بێت‌و دواجار لەتەك

بیرکردنەوەی ناگونجاو ناتەبادا هەڵ بکا، واتە سوکرات رێژەگەرا نییەو هەروەها پۆست مۆدێرنیستیش نییە.

ئەم میتۆدە پەروەردەییەی سوکرات یا ئەوەتا ئەنجامێکی نێگەتیڤ بەدەست دەهێنێ ئەویش ئەو کاتەی کە هاودایەلۆگەکان بەو ئەنجامە دەگەن کە لەشتێك قسەیان کردوە هیچ مەعریفەیەکیان دەربارەی نەبووە، یاخود ئەنجامێکی پۆزەتیڤ ئەویش ئەوکاتەی کە بەبۆچوونێكو ئیلتزامێکی ئەخلاقی نوێ دەگەن کە پێشتر نەیاندەزانی ئەوان هەڵگری بوون. لەهەردوو حاڵەتەکەدا فەیلەسوف جگە لەوەی کە خۆی لەم میتۆدەو لەم گفتوگۆیە فێر دەبێت، هاودایەلۆگەکانیش دەوڵەمەند دەبن بەمەعریفە، ئەمە جگە لەوەی کە کێشەی قسە لەسەرکراو مامەڵەیەکی عەقڵی لەگەڵ دەکرێ، ستانداردێکی مەعریفە دەخرێتە روو لەزۆربەی حاڵەتەکاندا بەرێککەوتنی هەموو لایەك.

میتۆدی سوکراتی ئەوە لە خۆ دەگرێ کە چۆن بیرکردنەوە مەیسەر دەبێت، چۆن بیرکردنەوە گونجاوو بەدوور لەهەڕەمەکی بێتو خاوەن جەوهەر، ئەمەش پشت بەوە دەبەستێت کەهەر لەسەرەتاوە بەشدارنی دایەلۆگ دەبێت توانای ئەوەیان هەبێت کە بیربکەنەوە، چونکی کەسێ ناتوانێ کەسێکی دی فێری بیرکردنەوە بکا، کەسێ کەمەهارەتی بیرکردنەوەی سەرەتایی نەبێت هیچ کەسی دی ناتوانێ فێری ئەو مەهارەتەی بکا. مامۆستا (فەیلەسوف) ئەوەی لەسەرە کە قوتابیان فێربکا چۆن بەدروستی بیربکەنەوە چۆن دژایەتیەکانی ناو گوزارەکانیان بناسنەوە. فێربونی بالا پشت بەو سەرچاوانە دەبەستێت کە قوتابیان خۆیان هەیانە، لەو سەرچاوانە چەمکە سەرەتاییەکان، توانای پەیوەستکردنو داتاشینی ئەنجامەکانو ئنجا توانای رەتکردنەوەی دژایەتیەکان لەبیرکردنەوەیانداو توانای قبوڵکردنی رەتکردنەوە.

بۆ ئەوەی لەسوکراتەوە فێربیت دەبێت وەك ئەو ئاگرو شەوقی ئارەزووی مەعریفە جێت پێ تەنگ بکا، وەك ئەو دەبێت بەهایەکی زۆر بۆ فێربوون دابنێیت. ژیان لەژێر کاریگەری ئەو ئارەزووەدا بۆ مەعریفە واتە فەیلەسوف بوون عاشقی حیکمەت. فەلسەفە بەمانا قوڵەکەی خۆی حیکمەت نییە بەڵکو عیشقی حیکمەتە، ئەو گەشتەیە، ئەو عەودالْ بوونەیە بە بەدووی حیکمەتدا، فەیلەسوفیش ئەوکەسە نییە کە بەحەقیقەت شادبووە. بەڵکو ئەو کەسەیە کە شەوقی دیداری مەعریفەو حەقیقەت خستویەتیە سەر رێگای بێ کۆتایی بەرەو حەقیقەت. گەر تاکەکان روو لەفەلسەفە بکەن ژیانیان دەگۆڕێ، حیکمەت دەکەنە ئامانجی خۆیان لەشوێنی دەستەڵاتو سامان. ئەم رەهەندەی فەلسەفەی سوکرات بووە شوێنی هەڕەشە لەئایینی تەقلیدیو ئەخلاقی تەقلیدی یۆنان. لێرەوە ئیدی ئاسانە ئەو ناکۆکیەی نێوان

سوكراتو ئەوانەی تاوانباریان كردوە لەدادگادا ببینین، ناكۆكی نێوان سوكراتو سۆفستائیەكان، ئاسانە ئەوەببینین كە لە بنەڕەتدا ڕێك نەكەوتنێك هەیە لەسەر بەهای پەروەردەی سوكراتی.

پەروەردەی سوكراتی جۆرە تەشویق كردنێكە بۆ ڕێگایەكی نوێی بیركردنەوە لەڕێگای رازی نەبوونەوە بە وەڵامی سادەو پێش وەخت ئامادەكراو، رازی نەبوون بەهەر وەڵامێك كە كەمتربێت لەمەعریفە. پەروەردەی سوكراتی چاو لەوئامانجە دەبڕێ كە كارێ بكا خەڵكی (دیارە هەموو خەڵك نا) وێڕای ئازارو ئەشكەنجەی وێڵ بوون بەدووی حەقیقەتدا چاو لەستاندارێكی باڵابڕن، ستاندارێك كە تەنیا ئەوكاتە شوێنی بەرگە گرتنە كە تۆ بەهایەكی زۆر بۆ مەعریفە دابنێیت لەسەروو هەموو شتێكەوە. لێرەوە فەلسەفە هەڕەشە لەوەدەكا كە ژیانی خەڵكی، یا قوتابیانی فەلسەفە، لەبنەڕەتەوە بگۆڕێ، گۆڕینی هەموو ئەوشتانەی كە خەڵكی دەیانكەنو حەزیان لێدەكەن، یاخود گۆڕینی دیدو زەوقو سلوك. عیشق لەژیانی فەیلەسوفدا لەئارەزوویەكی شەخسی ئیروتیكەوە دەگۆڕێ بۆ حەماسەتێك بۆ مەعریفە. رەوانبێژی لای سوكرات ئیدی بەهرەیەك نییە، بەهرەیەك بۆ سەرگەرمكردنی حەشامات وەك ئەوەی لای سۆفستائیەكان هەیە، بەڵكو وەك لە دایەلۆگی فایدروسدا دەبینین دەبێتە هونەری نووسین لەتەك مەعریفە لەناو رۆحی ئینساندا. ئەمەش خۆی بەمانایەك مەسەلەیەكی سیاسییە، سیاسەت بەوشێوەیەی كە سوكرات پراكتیكی دەكا لەئەنجومەندا، لەپەڕلەماندا روونادا بەڵكو هەركاتێك دووكەس یەكتریان بینیو پرسیاریان كرد كە چۆن دەتوانین باشترین ژیان بژین ئا ئەمە دڵی سیاسەتە. لەپەروەردەی سوكراتیدا جەغدكردنێك هەیە لەسەر پەیوەندی نێوان رێكخستنی سیاسیو ژیانی عەقڵ، ئەوخاڵەی كە هەمیشە دووبارە دەبێتەوەو شوێنی تەئكیدكردنە سەرە لەهەمووشت زیاتر بریتییە لەپێویست بوونی هاوسەنگی ئەمە تەنیا گوێ گرتن نییە لەفەرمانی دێلفیك Delphic كەدەڵێ "هیچ شتێك بەزیادەڕۆیی نا"، "هەموو شتێك بەئیعتدال" بەڵكو بۆ بەخشینی هەر توخمە بەشی خۆی لەبەشداریكردنی ئینسان لەواقیعدا. سوكرات دەركی بەوە كردبوو كە ئاژاوە هیچ كات كۆتایی نایەت گەر لایەنە گەورەكانی واقیع پشت گوێ بخرێن، ئارەزووی كورتنەكراوەی ئینسان بۆ چاكە، ئازاری گرژی نێوان جەستەو رۆح، ئامادەیی حەماسەتی سیاسی (سوموتیك thumotic)، ژیانی ئیرۆتیكیانەی گوتاری ئینسانی، بەشداربوونی عەقڵی ئینسانی لەعەقڵی ئیلاهیدا، پەیژەی سەركەوتن بەرەو چاكە كە رۆحی پرسیاركەر دروستدەكاو ئنجا حەتمیەتی داڕزانی جەوهەری رژێمە سیاسییەكان. رۆحێكی هاوسەنگ بەڕای سوكرات بەردی بناغەی بوونی بەختیارییە.

چەند فۆرمێکی ئەم هاوسەنگییە لە دایەلۆگەکاندا دەبینرێتەوە کە لە پەروەردە قسە دەکەن. یەکەم فۆرم بریتی‌یە لەو فۆرمەی کە لەپەروەردەی کۆندا مەی‌رکەزی ترین بوە ئەویش داڕشتنی کاراکتەرێکی چاك. لەدایەلۆگی کۆماردا سوکرات دەگیری داڕشتنی رۆحێکی هاوسەنگە. ئەو گریمانکاری دروستکردنی "شارێك لەگوتاردا" "City in a Speech" دەکا تاکو هارمۆنیەك لەنێوان هێزە سەرەکیەکانی رۆحدا دروستبکا. گفتوگۆی چۆن شار دێتەبوون، چۆن فەرمانڕەواکانی پەروەردە دەکرێن، چۆن چاکەی هەموان دابین دەکرێت، ئنجا چی روودەدا ئەوکاتەی کە رژێمی سیاسی فاسد دەبێت، هەمو ئەمانە ئەو پرنسیپە ئەفلاتوونیە دەسەلمێنن کە لۆژیك بەبێ درامای فەلسەفەی ناتوانێ بەکاری قانع کردن هەڵبستێ.

پەروەردەی ئەفلاتوونی جەغد لەسەر دووهێزی جەوهەری رۆح دەکا، حەماسەت thumos (سومۆس)و ئیرۆس (عەشق). هەریەکە ئەگەری ئەوەی هەیە کە ببێتە مایەی خولقاندنی ئاژاوەیەکی ئینسانی، بەڵام لەهەمان کاتدا چ سومۆس‌و چ ئیرۆسیش ئامرازێکن بۆ بەدەست هێنانی نەجیبترین ئەزموونی ئینسانی. دوو هاودایەلۆگی سەرەکی ناو "کۆمار" گلاوکۆن‌و سراسیماخۆس وێڵی ئەو چێژە پەیمان پێدراوەن لەلایەن ئەو ئیدعایەیەی سۆفستائیەکانەوە کە گوایا دەتوانن هونەری فەرمانڕەوایەتی ستەمکاریانە فێربن، بەڵام سوکرات هەوڵ دەدا کە یارمەتیان بدا دەستیان بەڕازی بوونێکی باڵاتربگا، رازیکردنی ئارەزووە قوڵەکانیان. سوکرات هەوڵ دەدا کە تێیان بگەیەنێ کە ئارەزووی ناوبانگ‌و پلەوپایەی مەزن ئارەزوویەکی ستەمکارانەیەو چاکترە بە کەناڵێکی دیکەدا ئەو ئارەزووە گوزەربکا. سومۆس (حەماسەت) تەعبیر لەخۆی دەکا وەك ئارەزووی تۆڵە، تووڕەبوون، هەڵچوونی دەروونی بەڵام لەهەمان کاتدا خۆی وەك حەماسەتێکی وەفادارانە، کرداری دلێرانەی خۆبەختکردن لەپێناو شەرەفدا تەعبیر لەخۆی دەکا. لە دامەزراندنی "شارێك لەگوتاردا" هاوڕێ گەنجەکانی سوکرات فێری ئەوەدەبن کە چۆن ئیدارەی ئەم حەماسەتانە بکەن، هەروەها چۆن ئارامیان بکەنەوە تاکو بەسوودبن لەبواری فەزیلەتی سیاسیدا. بەبێ داکۆکی کردنی حەماسیانە (سۆمۆسیانە spirited)ی شار، بێ خۆبەختکردنی بەشەرەفانە بۆ جڤاتی سیاسی، شار دەبێتە کەڵەکەبوونێکی غەریزە بایۆلۆژیەکان. لەخۆتەرخانکردنیاندا بۆ شارێکی تەواو عادل کە تێیدا حەماسەتەکان بەکەناڵێکی تردا رۆیشتوون‌و بەحاڵەتی تسامی (باڵابوون) گەیشتوون، ئارەزووە کانیان ئەو کاتە بەڕازی بوونێك، تێربوونێکی قووڵتردەگەن. بەڵام بەم تێکەڵکردنەی ئارەزووی تاك بەژیانی مەدەنی بەم شێوەیە، سوکرات ریسکی دامەزراندنی رێکخستنێکی سیاسی کرد کەتێیدا داخوازی عەدالەت بەوشێوە تۆخی‌و

توندییە خۆی داواکردنی قوربانییەکی زۆرەو ئەرکێکی گرانە بەسەر بوونی ئینسانەوە، لەبەرئەوە دەبێت ئەو کەمێك لەو جەغدە زۆرە لەسەر سومۆس کەم بکاتەوە. لێرەدا جارێکی دی ئارەزوو وەخەونی ستەمکارانە جارێکی دی دێنەوە بەردەم تاسەی گەیشتن بەهەموو (کل) بەگشت، تاسەیەکی ترسناکە. تاسەی گەیشتن بەهەموو بریتییە لە ئیرۆس. لەکاتێکدا هاو دایەلۆگەکانی سوکرات هەر هەموو دەزانن کە یەکەم دەرکەوتنی ئەم تاسەیە بریتییە لەسێکس، ئارەزووی سێکسی بەڵام لەلایەن سوکراتەوە بانگ هێشتن دەکرێن کە ئەزموونی ئەو تاسەیە بکەن، واتە ئیرۆس، لەرێگای پرۆسەی لەسەرە خۆی تسامی (بەرەوبالا) کە بەهۆیەوە هەمان تاسە، تاسەی گەیشتن بەکەماڵ ئەمجارە خۆی لەعیشق حیکمەتدا بەیاندەکا. ئەزموونکردنی ئەم پرۆسەی تسامییە گەیشتنە بەڕازی بوونێکی قووڵ کە خۆی لەحیکمەتدا دەبینێتەوە، لە پرۆسەیفەلسەفاندندا. دیارە رۆحی فەلسەفی دەبێت جارێکی دی بێتە خوارەوە بۆ ناوشار چونکی لەشاردا دەژیو بەناچاری لەکۆمەڵگای سیاسیدادەژی، لێرەوە دەبێت خۆی لەنێو چوارچێوەی پێویستە سیاسییەکاندا پێناسەبکا. ئیرۆس خۆی لەفۆرمە کۆنکرێتیەکاندا مانیفێست دەکا، ئەو فۆرمانەی کە هاوڕێکان سەرنجی یەکتری بۆ رادەکێشن. ئەگەری ئیرۆس پشت بەمەشقکردنی سومۆس دەبەستێ، بەڵام رامکردنی سومۆس پشت بەخستنە گەڕی ئیرۆس دەبەستێت. ئیرۆسو سومۆس یەکتر تەواو دەکەن، یەکتر لەئەگەرەکانو سنوورەکانی یەکتر ئاگادار دەکەنەوە.

لەپرۆسەی داتاشینی شێوە سیاسیەکاندا "شارێك لەگوتاردا" سوکرات هەوڵ دەدا کە رۆحی هاو دایەلۆگەکانی پەروەردەبکا. ئەو تۆنو هەستو رێگاو نیشانو هەڕەمی رێکخستنی هێزەکانی نێو رۆحی ئەوان دیاری دەکات کاراکتەرێك دروست بێت کە نەزوو لەخۆوە هەڵدەچیو نەترسنۆکیشە، نە کەلە رەقو نە نەرم، لێرەدا حیکمەتی سوکراتی بریتیە لە هاوسەنگی نێوان ئازایەتیو بێ باکیدا، ئیعتدالو تاسەی موتەعالی.

خاڵێکی دیکەی پەروەردەی سوکراتی بریتیە لەپەیداکردنی هارمۆنیەك لەنێوان ماتماتیکو شیعردا کە نموونەکەی لەهونەری دیالکتیکی گوتاردا خۆی دەبینێتەوە. گووتار ئەو شێوەیەیە کەتێیدا ئارەزووە ئینسانیەکانو تاسەکان بە قووڵیو پێکەوە گونجاندن دەگەن. لەزمانی یۆنانیدا گوتارو عەقڵ هەمان ووشەیان بۆ بەکاردێت، لۆگۆس. رەهەندی ئیرۆتیکی گووتار بە بونیادەکانی عەقڵ دەگا، ئەم بەیەك گەیشتنە کارێك دەکا کە دیالکتیك شیاوبێت، لەدیالکتیکشدا تاسەی گەیشتن بەکەماڵ تێردەبێت لەرێگای تێگەیشتنی لەسەرخۆی مەعقولیەتی گەردوندا، گوتاری

دیالکتیکی که ماتماتیك‌و شیعر، عەقڵ‌و ئیرۆس بەیەك دەگەیەنیّ، ئەو پەیژەیەیە کە رۆحی ئینسان دەبەستێتەوە بەڕێکخستنی واقیعەوە، ئەو یەکێتی بوونەی کە باس لەتاسەی ئینسان لەتەك کەماڵی خوداوەند دەکا. گووم بوونی هەر هاوسەنگیەك واتە ئاژاوەی سیاسی‌و سەرلێشێواوی عەقڵ. نمونەی ئەم ئاژاوە سیاسی‌و سەرلێشێواوی عەقڵە چاکتر خۆی لە سیستەمە داڕزیوەکانی وەکو دیموکراسی دیماگۆگی‌و ستەمکاریدا دەبینێتەوە لەو سیستەمە دیموکراسیەدا کە بەو هەل‌و مەرجە دەناسرێتەوە کەتێیدا هەموو ئارەزوەکان ڕێگایان پێدەدریّ تا تێربن، ئەو هەل‌و مەرجەی کە تێیدا ئەو ئەنرژییەی (ووزەیەی) لەئەنجامی نەبوونی ئاراستەوە دەبێتە مایەی دروستکردنی ڤاکیوم (بۆشاییەکی) ترسناك، کە هەر زۆر زوو لەلایەن دیماگۆگیەکانەوە پڕدەکرێتەوە کە لەبەرئەنجامدا ڕێکخستنی سیاسی دەبێتە حوکمی مێگەل، لەلایەکی دیکەوە ستەمکاریەکان بەبیّ یاسایی‌و بەڕەڵلایی دەناسرێنەوە، جۆرە حوکمێك لەلایەن ئارەزووە شەخسییەکانەوە، فەنتازیای ژیانی ستەمکار باس لەبیّ هاوسەنگی دەکا.

لەهەر دوو شێوە داڕزاوەکەی حوکمدا، دیموکراسی‌و ستەمکاری، ئەفلاتوون لەو باوەڕەدابوو کە فەیلەسوفی ساختەو سۆفستائی وجودیان دەبێت کە هونەری دیالکتیك‌و هونەری موجادەلەی عەقڵی بەخراپی بەکار بهێنن، وەك ئەوەی ئەو دوو هونەرە یاری دەستی ئەوان بن هەمیشە بەڕاست‌و چەپدا بۆ مەبەستی جیاجیاو پڕ لەدژایەتی بەکاریان دەهێنن، وەك شەکەرۆکە لەززەت لەپەرت پەرت کردنی موجادەلە وەردەگرن بۆ دڵخۆشکردنی میّ گەل.

* * *

بیرۆکەی پەروەردەی لیبراڵ لای ئەرستۆ رەهەندێکی دی کلاسیك نیشان دەدا. ئەرستۆ زیاتر سەرقاڵی پەروەردەی مەدەنییە لەژیانی رۆژانەی سیاسیدا. پێویستی بوونی پەروەردە لەو تێگەیشتنەوە سەرهەڵدەدا کە سەیرکردنێکی قوڵی سروشتی ئینسان پێویستیەکی نکۆڵی لێنەکراوە، ئەمە لەکاتێکدا ریفۆرمی سیاسی ناتوانیّ ئەو سەیرکردنە فەراهەم بکا جا بۆ ئەوەی ئەو ریفۆرمە سەرکەوتوو بێت ئەو سەیرکردنە قووڵەی سروشتی ئینسان لەلایەن پەروەردەوە فەراهەم دەکرێت.

لەکتێبی "سیاسەت"دا ئەرستۆ باس لەجیاوازی نێوان دەستوورە سیاسییەکان دەکا، چونکی دەستورێك لەدەستوورێکی دی جیاوازە پەروەردەش کە ئەو دەستوورانە لەزەیندا (زهندا) دەچەسپێنیّ لەدەستوورێکەوە بۆ دەستوورێکی دی دەگۆڕیّ. هەروەك چۆن باشترین دەستوور بەرجەستەبووی باشترین بۆچوونێکە

دەربارەی فەزیلەتو بەختەوەری، ئاوهاش باشترین پەروەردە دەبێت لەسەر سروشتی ئینسانەوە بێت، بەلەبەرچاوگرتنی پێویستیەکانی، تواناکانیو ئنجا سنوورەکانی سروشتی ئینسانەوە. بەڕای ئەرستۆ ئینسانەکان، لەپاڵ سیاسی بوونیاندا، بوونەوەری سایکۆفیزیکین کە رۆحیان لێپرسراوە لەژیانو وەزیفەی کاراکتەریان. ئەم رۆحانە پێك هاتوون لەبەشی عەقڵی ـ کە ناوکی حیکمەتی پراکتیکییە Phronesis و عەقڵ nous و بەشی نا ـ عەقڵی کە پێك هاتووە لەئارەزوو سۆز، ئەم بەشەبێ بەری نییە لەکاریگەری عەقڵ. لێرەوە پەروەردەی ئەرستۆیی لەسێ بەش پێك دێ، مەشقکردنی جەستە (جمناستیك)، راهێنانی ئارەزوو و سۆزەکان (ethismos)و هەروەها پەروەردەکردن لەڕێگای عەقڵەوە بۆ بەشە عەقڵانیەکە. ئامانجی هەرهەموو بەشەکانیش بەرهەمهێنانی کەسێکی کۆو عەقڵانییە، کەسێك کە رۆحی بەجۆرێك خاوەنی هارمۆنیاو هاوسەنگییە کەدەتوانێ بەختەوەریی حەقیقی بناسێتەوەو عەودالی بێت. چۆن؟

کردارێك یا چالاکیەك کە تەعبیر لەحیکمەتی عەمەلی دەکا بریتییە لەبەرئەنجامی بڕیارێك کە خۆی ئارەزوویەکە لەسەر راوێژو خۆزگەوە بیناکراوە، خۆزگە ئارەزوویەکی عەقڵییە بۆ گەیشتن بە بەختەوەری یاخود ئەوشتەی کە بکەر وێنای دەکا وەك بەختەوەری (7) گەر ئارەزووەکانمان بەگشتی گونجاو بن لەگەڵ خۆزگەکانمان ئەوا ئێمە حاڵەتێکمان هەیە کە دەشێ پێی بڵێین دان بەخۆداگرتن temperance ، گەر ئەم دووانە لەتەك یەکتر نەگونجێن یا حاڵەتێکمان دەبێت کە دەشێ پێی بڵێین ئیرادەی لاواز (ئەو کاتەی ئارەزوو دەستەڵات بەسەرخۆزگەدا پەیدا دەکا)، یاخود حاڵەتی قانیع بوون (واتە خۆزگە بەسەر ئارەزوودا دەستەڵات پەیدادەکا)، لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئێمە ئەزموونی ناکۆکیەکی پڕ لەئازاری ناوخۆیی دەکەین لەجیاتی هارمۆنیەکی ناوخۆیی. ئێستا فەزیلەتی کاراکتەر بەتەنگ ئارەزووەکانەوە دێ بەڵام لەهەمان کاتدا بەتەنگ هەستەکانیشەوە دێ، "فەزیلەت بریتییە لەهەستکردن بەشتێکی دروست لەکاتێکی دروستدا دەربارەی شتێکی دروست، هەستکردن بۆ خەڵکێکی دروست بەنیازی ئامانجێکی دروستو بەڕێگایەکی دروست" (8). بابپرسین "دروست" لەم ڕەوتەدا مانای چی؟

لەبەرئەوەی هەڵچونو داچوونە دەرونیەکان راو بۆچوون لەخۆدەگرن کەواتە لەڕووی بوون بەهێزەوە عەقڵینو شایانی پەروەردەکردن. کەسی ترسنۆك دەشێ لەڕێگای فێربوونەوە لەترسنۆکی رزگار بکردرێت، کاتێك تێگەیەنرا کەئەو شتەی ئەو لێی دەترسێ هیچ هەڕەشەیەك بۆسەر ئەو دروست ناکا، بەڵام هەڵچوونو داچوونە دەروونیەکان لەلایەکی دیکەوە ئارەزوەکان لەخۆدەگرن، ئەمانەش بەئاسانی

ناگۆڕێن لەلایەن ئامرازی عەقڵیەوە، رەنگە ئەزموون و کاتمان بویَ بۆ هێنانەدی ئەو گۆڕانە. لەبەرئەوە بەڕای ئەرستۆ بۆ بەدەست هێنانی فەزیلەت پێویستمان بەڕاهێنان habituation هەیە، بەخووگرتنەوە هەیە. خووەکانی ئێمە لەئارەزووکردن و هەستکردندا تاڕادەیەکی زۆر چۆنێتی ئەوەی ئێمە چۆن کردار دەنوێنین دیاری دەکەن. لەمەزیاتر، هەر ئەو خووە ئامانجی کردارو وێناکردنی ئێمە بۆ بەختەوەری دیاری دەکەن. کەواتە ئامانجی پەروەردەی ئەرستۆیی لەپەروەردەکردنی هەڵچوون و داچوونە دەروونییەکان و ئارەزووەکاندا بریتییە لەبەرهەمهێنانی هاونیشتمانی، هاونیشتمانییەك کە کردار بەرمەبنای یاساو رێزگرتن لەیاسا بۆی دەبێتە سروشتی دووهەم، کەواتە مەسەلەیەکی لەڕادەبەدەر گرنگە کە ئێمە لەگەڵ خووی چاکدا گەورەببین، ئەرستۆ لەم روەوە دەڵێت "گەر بمانەوێت بەشێوەیەکی دروست قوتابی ئەوشتە بین کەچاکە، کە عادلەو قوتابی پرسیارە سیاسییەکان بەشێوەیەکی گشتی" ئەوا دەبێت خوو بەشتی چاکەوە بگرین. بەڵام خووی چاك هەرچەندە پێویستن، لەگەڵ ئەمەشدا بەتەنیا کافی نین، بەڵکو پێویستە ئێمە لەڕووی ئەخلاق و سیاسییەوە پەروەردەبکرێن، هەر ئەم پەروەردەکردنەیە کە ئێمە دەکاتە "قوتابییەکی دروست" ئەخلاق و سیاسەت جەستەکانی مەعریفەی عەمەلین، ئەخلاق کارێك دەکا کە ئێمە بەدروستی نیشانە بپێکین لەکردارەکانمانداو بەبەختەوەرییەکی رەسەن بگەین ئەمەش لەرێگای فەراهەمکردنی مەعریفەی ئەوشتەی کەهەیە. سیاسەت ئێمە دەوڵەمەند دەکا بەمەعریفەیەك کە پێویستە بۆ دارشتنی دەستوور، دەستورێك کە ئەو بەختەوەرییەی تێیدا دێتەدی.

لەکتێبی حەوتەم و هەشتەمی "سیاسەت"دا ئەرستۆ رای خۆیمان لەمەڕ باشترین رژێمەوە پێ دەڵێ: سیاسەتێ کە بەچاکی کارێك دەکا خەڵکی ئەگەرەکانی بوونیان، ژیانیان جێ بەجێ بکەن، ئەگەری فەزیلەت. ئەم حاڵەتە کۆمەڵێ مەرجی ئابووری و جوگرافی دەخوازێ، بەڵام رۆحی ئەو رژێمە سیستەمێکی پەروەردەی درێژخایەنە کە تێیدا فەزیلەتەکان جێی خۆیان دەگرن دوای گەشەکردنی هەستی لێپرسراوێتی و پەرەپێدانی توانای حوکم کردنی خۆ لەلایەن هاونیشتمانیانەوە. لێرەدا پەروەردە تەنیا ئامادەکردنێك نییە بۆژیان،و تەنیا بۆ گەنجەکانیش نییە، بەڵکو چالاکی سەرەکی ژیانە. پەروەردەی لیبراڵ ناشێ و نابێت کورت بکرێتەوە بۆ مەهارەتەکانی وەکو پزیشکی، ئەندازیاری، یا کشتوکاڵ یا تەکنۆلۆژیا، بەڵکو پەروەردەی لیبراڵ ئەوشتەیە کە ئینسان دەکاتە ئینسانێکی ئازاد. لای ئەرستۆ ئازادی برتیی نییە لەهەواو هەوەسێك، بەڵکو پەروەردەی لیبراڵ لەئێمەدا ئەو فەزیلەتانە گەشە پێدەدا وەکو لیبراڵ بوون، بەمانای هەڵکردن (تسامح)و دەدان بەخۆداگرتن،و ئیعتدال و ئنجا

ئازایەتی، ئەمانەش بەدەوری خۆیان ئازادمان دەکەن لەدەست هەڵچوونو هەواو هەوەسەکان کە گەر بێتو لێیان بگەڕێین ئەوا بەرەو ئاستی ئاژەڵ ڕاپێچمان دەکەن. کەواتە پەروەردەی لیبراڵ کارێك دەکا کە ئێمە بتوانین دوای پەروەردەکردنی توانای ڕاوێژکردنی خۆ ئیختیارەکانمان بەچاکی هەڵبژێرین، جێبەجێکردنی بڕیار لەمەڕ مەسەلە گرنگەکانی وەکو عەدالەتو ناعەدالەتی، جوامێریو ناجوامێری، ئینسان بوون یا ئاژەڵ بوون. هەبوونی گوتاری عەقلانی دەربارەی ئەو مەسەلانە ئەو قەناعەتەی ئەرستۆیە کە دەڵێ" ئینسان بەسروشت ئاژەڵێکی سیاسیە . ئێمە ئەوکاتە بەفەزیلەت دەگەین کە توانیمان لەسەر ئەلتەرناتیڤەکان گفتوگۆمان کرد، پرسیارمان کرد باشترین حکومەت کامەیە، چۆن لێپرسراوبین بەرامبەر بەخۆمانو ئەوجڤاتەی کەتێیدا دەژین، ژیانی چاك کامەیە..هتد.

ئەرستۆ جیاوازی دەخاتە نێوان ئیشو حەوانەوەو کاتی ئازاد leisure. ئیشی جیدیە بەڵام پڕ لەئازارە، ئەوشتەیە کە دەبێت بیکەین بۆ ئەوەی زیندوو بمێنینەوە حەوانەوە بۆ ئامانجێکی دی هەن کە لەخۆیان بەرزترە، ئەرستۆ ئەم ئامانجە ناودەبا بەکاتی ئازاد کە لەیۆنانیدا ووشەی skole تەعبیری لێدەکا، ووشە ئینگلیزییەکانی وەکو سکۆڵ school. سکۆلەر شیپ scholarship لەوشەی skole (سکۆل) (کاتی ئازاد)ی یۆنانیەوە وەرگیراون. کەواتە پەروەردە بریتییە لەکاتی ئازاد بەپلەی ئیمتیاز par excellenle .

بەڕای ئەرستۆ ڕێگای جیاواز هەن بۆ گەیشتن بەحقیقەتێ کە لەدەوڵەمەندکردنی شارو یەکێتی شاردا ڕۆڵی جەوهەری دەبینێ. پەروەردە دەبێت بریتی بێت لەکرانەوەو ئیلتزامی مەدەنی، گەشتێك لە بەشەوە بەرەو گەردوونی (Universal)و ئینجا گەڕانەوە بۆ بەش. کەواتە پەروەردە ناشێ نیشتمانپەروەری بخاتە ژێر پرسیارەوە، و لە هەمان کاتیشدا نابێت تەشویقی خۆبەستنەوەیەکی بەربەریانەو لاعەقلانی بکا بە جیهانە بچووکەکەی کەسەکانەوە وەکو ئەوەی ناسیۆنالیزمی مۆدێرن دەیکا. بوونی ئێمە بەستراوەتەوە بەو جڤاتەوە کە تێیدا دەژین، نە داخستنی ئەو جڤاتەو نەخۆبەستنەوە بەو جڤاتەوە بەشێوەیەکی دەمارگیریانە ئێمە دەکاتە هاونیشتمانیەکی چاكو نەڕاکردن لەو جڤاتە کە واقیعیو کۆنکرێتییە بەرەو جڤاتێکی خەیاڵی کە پێی دەگوترێت جڤاتی جیهانی واتە بوون بە هاونیشتمانی جیهانی. ئەو شتەی بەدەستی دەهێنینو تاقیکردنەوەی ژیانو گەیشتن بە جەوهەری ئینسانی بەپلەی یەك لەڕێگای بوونە ئەندامی جڤاتێکی سیاسییەوە دەبێت کە خۆمانی تێیدا دەبینینەوە. ئەو شتەی کە ئەمڕۆ چەپەکانو لیبراڵەکانو

میدیای بەناوی هاونیشتمانێتی جیهانی Global Citizenship قسەی لێدەکەن هەرگیز ناتوانێ شوێنی ئەو جڤاتە کۆنکرێتیو حەقیقیـیە بگرێتەوە کە ئێمە تێیدا گەورە بووینو خۆمانی تێیدا دەبینینەوە، مانای عەدالەتو بەختەوەریو ژیانی چاك تەنیا لەسەر ئاستی ئەو جڤاتە مانایان هەیە.

*   *   *

تا ئێرە باسمان لە بۆچوونی کلاسیك کرد دەربارەی پەروەردەی لیبرالْ بەتایبەت دیدی سوکراتیو ئەفلاتونیو ئەرستۆیی. ئەم گەشتە گەشتێکی ناکاملْ دەبێت بیْقسەکردن لەسەر بۆچوونی سانت ئۆگستینو تۆماس ئەکوانیەسو فارابیو ئیبن سیناو مەیمۆنەدیس. بەلاّم لێرەدا قسەکردن لەسەر بۆچوونی ئەو فەیلەسوفو سیۆلۆجیانە هەلّدەگرین بۆ بۆنەیە کیدی، لەجیاتی ئەوە لە کلاسیکەوە بازێك دەدەین بۆ دنیای مۆدێرنو چەند سەرنجێك تەنیا لەسەر دیکارتو ڤیکۆرو رۆسۆ دەدەین. تەواوکردنی ئەم باسە قسەکردنە لەسەر هۆبز، سپینوزا، لۆك، کانت، رۆمانتیکیەکان، هیگلْ، نیچەو هایدگەر کەبابەتی پرۆژەیەکی دیکەن.

لەنێو بیریارە مۆدێرنەکاندا، دیکارتو ڤیکۆ بۆ ئەم باسەمان گرنگییەکی تایبەتیان هەیە چونکی لە بۆچوونەکانیاندا ئەو شتەی کە ئەفلاتوونو ئەرستۆ پێیان گوتین کە شوێنی مەترسییە، توندرەوی، لە نووسینەکانی ئەماندا بەرەوا لەقەلّەم دراوە، لەگەلْ بوونی جیاوازیشدا لەنێوان ئەم دوو فەیلەسوفەدا، ئەو هاوسەنگیەی کە بیریارە کلاسیکەکان قسەیان لێدەکرد، هاوسەنگی نێوان ماتماتیكو شیعر، لای ئەمان ئەو هاوسەنگییە هەلّوەشاوەتەوە سەرەتا با سەرنجێکی دیکارت بدەین.

هەنگاوی یەکەمی فەلسەفەی دیکارت بە جەغدکردنە سەر خود (زات) دەست پێدەکا ئەمەش لەو کتێبە سەرەتاییەدا کە بەناوی "یاساکانی ئاراستەکردنی عەقلْ لە Rules for the Direction of the mind وەیە دەست پێدەکا. جەغدی سەرەکی ئەم کتێبە وا لەسەر گەشەکردنی پرۆسەی لێکۆلّینەوە کە بەرای ئەو دەبێتە مایەی بەدەستهێنانی مەعریفەیەکی رەسەن. یاسای سێهەم بریتییە لە:

**ئێمە دەبێت نووسینەکانی نووسەرە کۆنەکان (کلاسیکەکان) بخوێنینەوە چونکی سوودێکی زۆر دەبینین گەر بتوانین لە بەروبوومی کۆمەلّێ ئینسان بخۆین. دەبێت ئەمە بکەین لەپێناو فێربوونی ئەو راستیە کەمانەی کە کەشف کراونو زانینی ئەو خالاّنەی کە ماونەتەوە کاریان لەسەر بکردرێت لە بوارە جیاجیاکاندا. بەلاّم لە هەمان کاتدا مەترسییەك**

**هەیە ئەویش ئەوەی کە گەر بێتوو ئێمە زۆر لە نزیکەوە لەو بەرهەمانە بکۆڵینەوە رەنگە ئەو هەڵانەی کە لەو بەرهەمانەدان دزە بکەنە ناومانەو بێویستو ئیرادەی خۆمان.."(٩).**

"بەتەنگەوە هاتنی ئەو بابەتانەی کە پێشنیارکراون بۆ لێکۆڵینەوە، ئێمە دەبێت لەو شتە بتوێژینەوە کە بە ئاشکرایيو بەبەڵگەوە دەتوانین بیبینینو لێی دڵنیابین، نەك ئەوەی کە خەڵکی چۆن بیریان لێکردۆتەوە، مەعریفە لە هیچ رێگایەکی دیکەوە بەدەست نایەت.

ئنجا دیکارت دەڵێت ئێمە دەبێت تەنیا پشت بە دوو شت ببەستین حەدس (حدس intuition)و ئیستدلال deduction، دەربارەی حەدسیش دەڵێ:

**"مەبەستم لە حەدس شەپۆلەکانی هەستەکان نییە یاخود حوکمی هەڵخەڵەتێنەرانەی خەیاڵ، بەڵکو وێناکردنێکی ئاشکراو بەئاگای عەقڵە کە ئاسانو جیاوازە تا ئەو رادەیەی کە گومانێك ناهێڵێتەوە کە ئێمە بەراستی تێدەگەین. کەواتە حەدس بریتییە لە وێناکردنێکی بەدوور لە گومانی عەقڵێکی ئاشکراو بەئاگا، کە بەتەنیا لەڕووناکی عەقڵەوە دێت"(١٠).**

حەدس لای دیکارت بە ئیستدلال تەواو دەکرێت، مەبەستیش لە ئیستدلال ئەمەیە: ئاماژەکردن بە شتێك بە ناچاری لەرێگای گوزارەکانیترەوە کە ئەوە زانراوە بەدوورن لە گومان. بەو شێوەیەی دیکارت دەیانبینێ حەدسو ئیستدلال ریشەکانیان وا لە ئەزموونەکانی تاکە کەسدا. لای دیکارت مەعریفە لەنێو کتێبەکاندا نییە یاخود لە ئۆتۆرەتیدا (دەستەڵاتدا)، بەڵکو بۆ ئەوەی تاکە کەس بە مەعریفەی رەسەن بگا ئەو دەبێت بە فعلی ئەزموونی هەبێت، ئەو ئەزموونەی کە بریتییە لە گەیشتن بە حەقیقەت لەرێگای حەدسەوە، حەقیقەتی گوزارە یاخود دروستی ئاماژ دەکردن بۆ گوزارەیەك لەرێگای گوزارەیەکی دیکەوە. بەم شێوەیە فێربوون بریتی نییە لە نەقڵ کردنێکی پاسیڤانەی ئەو شتەی کە مامۆستا یا کتێبێك دەیڵێ. قوتابیەك کە خۆی ئەزموونی نییە مەعریفەشی نییە. دیکارت لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێت:

**"هەروەها گەر هەموو موجادەلەکانی arguments**
**ئەفلاتوون و ئەرستۆشمان خوێندبێتەوە بەهیچ شێوەیەك**
**نابینە فەیلەسوف گەر نەتوانین حوکمی دروست بدەین**
**لەسەر ئەو بابەتانەی کە قسەیان لەسەر دەکەین،**
**چونکی لەو حاڵەتەدا ئەوەی کە فێری بووین وا**
**دەردەکەوێ زانست نەبێ بەڵکو مێژوو بێت"(١١).**

کەواتە پەروەردە نابێت بریتی بێت لە نەقڵ کردنی زانیاری یا دۆکترین (عەقیدە) یا دۆگما بەڵکو پەروەردەکردنی عەقڵ ئامانجەکەیە.

لە کتێبەکەیدا "گووتار دەربارەی میتۆد" دیکارت چەند پرنسیپێك دیاریدەکا بۆ مەعریفەی دڵنیا لەسەر مۆدێلی ماتماتیکەوە، ماتماتیك وەك باڵاترین شێوەی رەهای عەقڵ. دیکارت ئەوە روون دەکاتەوە کە ناڕەحەتیەکانی ژیانی ئینسان لە جیاوازی راوبۆچوونی ئینسانییەوە سەرهەڵدەدەن. جیاوازیەکان سەر هەڵدەدەن نەك لەبەر ئەنجامی ئەو جیاوازییە حەتمیانەی وێناکردنی واقعێکی ئاڵۆز، بەڵکو بەپێچەوانەوە لای دیکارت واقیع زۆر سادەیەو بەهرەکانی ئینسانەکانیش یەکسان. کێشەکە خۆی لە ترادسیۆنی عەقڵیدا کە ئێستا هەیە مەڵاس داوە. دیکارت لەو باوەڕەدایە کە میتۆدی دیکارتی چارەسەرەکەیە چونکی پەیمانی ئەوە دەدا کە میتۆدێکی گەردوونییەو سەرچاوەیەکی بنەبڕە بۆ داڕشتنەوەی هەموو مەعریفەی ئینسانی. دوو هەنگاوی بنەبڕ (حەدی) لەم میتۆدەدا بەرچاو دەکەون؛ هەنگاوی یەکەم بریتییە لە گومانی سیستماتیکی، گومان کردن لە شەهادەتی هەستەکانو هەستی هاوبەش وەك بناغەیەك بۆ ئەو شتەی کە شایانی دەرك کردنە، شتەکان بەو شێوەیەی کە ئێستا لە جیهاندا هەن ئیدی دەبنە شوێنی گومانو ماسکەکانیان لەرێگای ئەم گومانەوە دەکەونو رۆح ئیدی ناتوانێ بڕوا بە دەرکەوتنەکانی جیهان بکاو ئیدی جیهان ئەو شتە نییە کە هەناسەی خوداوەند ئینعکاسی بکاتەوە. هەنگاوی دووهەمی میتۆدی دیکارتی بریتییە لە بوونی میتۆد وەك ئامرازێکی نەقدی بۆ سەرلەنوێ دروست کردنەوەی جیهان. لەژێر فەرمانەکانی میتۆدی دیکارتیدا داوێنگی حەقیقەت کورت دەبێتەوە بۆ ئەو پرۆسە عەقڵیەی کە شێوە بە واقعی جیهان دەبەخشێ، لێرەدا ئۆپەراسیۆنی Operation لۆژیکی شوێنی واقیعی دەروونی دەگرێتەوە. پێکهاتەی جەستەو رۆح کە لە قۆناغی کلاسیكو سەدەکانی ناوەڕاستدا

مایەی بەخشینی گرژیو سنوورەکانی بوونی ئینسان یا ئینسان بوون بوو، سەرچاوەی مەعریفە بوو، لێرەدا لەلایەن عەقلێکی سەربەخۆوە سەرکوت دەکرێ، دیکارت پێشنیاری میتۆدێك دەکات کەئالۆزی تێیدا سەرەتا هەڵدەوەشێنرێتەوە بۆ بەشە سادەکانیو ئنجا ئەم بەشانە جارێکیدی پێکەوە گرێدەدرێنەوە. ئەم پرۆسەی هەڵوەشاندنەوە ـ دروست کردنەوەیە لەسەر ئەو گریمانکارییەوە کار دەکا کە ئالۆزی بە سروشت شوێنی سەرلێشێواوییەو رێگرە، ئەو گریمانکارییەی کە دەڵێ چاودێریکەر Observer دەتوانێ تەنیا راستەو خۆو یەکسەر ئەو شتە دەرك پێبکا کە ئاشکرایەو ئەو شتەش تەنیا لە بەشە سادەکانیدا شایانی دەرك پێکردنە. ئیدی بەم شێوەیە دیاردەکانی جیهان ئالۆزنینو هیچ پرپیش نین لە ناکۆکی چونکی ئەوە ئێمەین کە هەڵمانوەشاندونەتەوەو دامان رشتوونەتەوە، ئەمەش ئەو پرنسیپە دەسەلمێنێ کە دەڵێ تەنیا ئێمە دەتوانین ئەو شتە بزانین کە خۆمان دروستمان کردوە. لێرەدا ئاشکرایی، سادەیی شوێنی ئەو وێناکردنە دەگرێتەوە کە دەڵێ واقیع فرە رەهەندەو پڕ لە موعەمایە، پڕ لە نهێنی. دوا هەنگاوی پرۆژەی دیکارت بریتییە لە تەئکیدکردنە سەر باڵادەستی مەعریفەی ماتماتیکی، بەتایبەت ئەندازەی شیکاری، وەك مۆدێلێکی شوێنی باوەڕ بۆ دروستکردنەوەی جیهان.

با بپرسین میتۆدی دیکارتی بەرەورووی چ ئامانجێك ئاڕاستەکراوە؟ لە بەشی شەشەمی "گووتار دەربارەی میتۆد" دەخوێنینەوە:

**" لە رێگای ئەم فەلسەفەیەوە دەتوانین دەسەڵاتو کرداری ئاگرو ئاوو هەوا بزانین، ئەستێرەکانی ئاسمانو هەموو ئەو مەبەستانەی کە لە ژینگەکاندا هەن، زانینێکی دیارو ئاشکرا هەروەك چۆن هونەرو بەهرەی خاوەن پیشەکانمان دەزانین، ئنجا دەتوانین ئەم مەعریفەیە بەکار بهێنین بۆ ئەو مەبەستانەی کە گونجاون، <u>بەم شێوەیە خۆمان دەکەینە سەروەری سروشت</u>"(١٢) (جەغدکرنە کە کاری ئێمەیە نەك دیکارت)**

کۆنترۆڵکردنی سروشت، ئینسانیو نائینسانی کە جەوهەری مۆدێرنێتییە بریتییە لە وەڵامێکی پڕ لە دڵنیایی بۆ قەلەقیە رۆحیو عەقلییەکانی رابووردوو. کاتێك کە دیکارت دەڵێ "حەقیقەتی فەرەزیە hypothesis لەرێگای واقعیبوونی ئەنجامەکانەوە

دەسەلمێنرێ" ئەو لە راستیدا دەرگا دەخاتە سەر پشت بۆ سەروەریکردن و بەکارهێنانی سیستماتیکی جیهان بەنیازی هێنانی بۆ ژێر رکێفی یاساداڕشتنی لۆژیکی، بۆ ژێر رکێفی لۆژیك، کورتکردنەوەی فرە رەهەندی جیهان بۆ یەك رەهەندی، رەهەندێك کە دەتوانین بیناسینەوەو بیزانین لەرێگای لۆژیکەوە.

ئەم بە ماتماتیك کردنەی جیهان کە فەلسەفەی دیکارت و جەوهەری مۆدێرنێتییە، لەلایەن ڤیکۆ رەتدەکرێتەوە بەتایبەت لە کتێبی "لێکۆڵینەوە میتۆدیەکانی سەردەمی ئێمە"داو ئەمە رەهەندی شیعرگەرایی، جوانناسی زیاتر تۆخ دەکاتەوە. ڤیکۆ وێڕای ئەوەی کە ددان بەوەدادەنێ کە میتۆدی ئەندازیاری لە داهێنانی شتەکاندا رۆڵی خۆی هەیە، بەڵام بەڕای ئەو ئەو میتۆدە دیکارتییە شکستی هێنا لەوەی کە دەربارەی ئینسان وەك گشتێك قسە بکا، هەروەك چۆن مۆسیقایەك لەسەر هاوکێشەی ماتماتیکییەوە دارێژرابێ هیچ چێژێك نابەخشێ، ئاوهاش ئەو میتۆدە لەمەڕ رەهەندەکانی ئینسانەوە بێتامە. میتۆدی لێکۆڵینەوەی ڤیکۆیی بەپلەی یەك گرنگی بەو گووتارە دەدا کە پێی دەڵێت eloquence رەوانبێژی. رەوانبێژی ڤیکۆیی بەپێچەوانەی رەوانبێژی کلاسیکەوە کە هەوڵ دەدا هارمۆنیەك لەنێوان رۆحی تاکەکەس و بووندا دروست بکا، روانبێژی ڤیکۆیی بە قووڵی تەعبیرکردنێکی ویژدانیی توانای خەیاڵە لە رەنگ پێدانەوەی هەستی یەکێتی بوون لەرێگای سۆزیبوونەوە.

دژ بە حەدی بوون و بنەبڕی ماتماتیکی دیکارتی، ڤیکۆ ئاشکرایی و رەوانی شیعر پێشنیار دەکا. شیعر رێگایەکی کورتە بەرەو ئایدیای سیاسەتی سیرەپیوتیکی (چارەسەریی)، گرێدانی گەڕان بەدوای تەحقیق کردنی زاتدا لەگەڵ پرۆگرامی رزگاربوون لە ناڕەحەتیەکانی هەڵ و مەرجی ئینسان بوون. هەوڵی ڤیکۆ بۆ رزگارکردنی تاسەی یەکێتی بوون لەدەست بونیاد، رزگارکردنی خەیاڵ لەدەست گووتار، شیعر لەدەست ماتماتیك، ئەم هەوڵە وەرچەرخاندنێکی مۆدێرنە بەرەو تاسەیەکی رادیکاڵ بەرەو رزگاری لە عەقلانیەتێك کە هەموو رەهەندەکانی ژیان دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، ئەم تاسەیە بۆ رزگاری بەناو شیعرەوە لێرەوە ترادسیۆنێك بۆ خۆی دروست دەکا کە دواجار لەلایەن رۆسۆو رۆمانتیکیەکان و نیچەو ئنجا پۆست مۆدێرنیستیەکانی ئەمڕۆوە درێژەی پێدەدرێ.

لەگەڵ دیکارت و ڤیکۆدا هاوکێشەیەکی مۆدێرن سەرهەڵدەدا، هاوکێشەیەك لەنێوان، لەلایەکەوە، گەردوونی بوونی میتۆدی ئیستدلالی، لەلایەکیدیکەوە، تاسەو خەون بینین بە عەفەویەت و بە یەکێتیبوونەوە، تاسەی رزگاربوون لە عەقلی ماتماتیکی و درێژکردنەوەی ئەو عەقڵە بۆ بوارەکانی مەدەنی و ئەخلاق. دژایەتی

نێوان دیکارت‌و فیکۆ قسە لە گرژیەکی ناومۆدێرنتی دەکا کە دواجار لەتەك پرۆژەی رۆمانتیکیانەی رۆسۆدا دژ بە لیبرالیزمی سیاسی سەرهەڵدەداتەوە، هەر هەمان گرژی نێوان دیکارت‌و فیکۆ دواجار لە بەرگی گرژیەکدا خۆی نیشان دەدا، گرژی نێوان ئەخلاقی شێوەیی (شکلی) کانتی‌و بانگەوازی شیلەر بۆ پەروەردەی جوانناسیانەی ئینسان.

هەوڵی ژان ژاك رۆسۆ بریتی‌یە لە زیندووکردنەوەی غەمی کلاسیك، بەختەوەری‌و گەشەکردنی سروشتی ئینسان لەنێو کۆمەڵەیەکی مەدەنیدا. بەڕای رۆسۆ رزگاری ئینسان‌و گەشەکردنی ئەخلاقی زۆر فراوانترن لەوەی کە لیبڕالیزمی سیاسی تەسەوری دەکا (یادەکرد)، لەوانە جۆن لۆك. رزگاری‌و گەشەکردنی ئەخلاقی ئەم رەهەندانە لەخۆ دەگرن: ئازادی ئێمە وەك هاونیشتمانی لە بەشداریکردنی سیاسەتدا، ئۆتۆنۆمی ئێمە کە لەو کەرامەتە سروشتی‌یەوە هاتووە کە هەر ئینسانە بە سروشت خاوەنێتی، بەتەنگەوە هاتنی ئەوانی دیکە.. هتد. بەڕای رۆسۆ مافی ئێمە لە بەشداریکردنی کاروباری سیاسی‌و مەدەنیدا زۆرترە لە مافی بەدەستهێنانی موڵك‌و ماڵات، لەبەر ئەوەی رۆسۆ جەغدی زیاتر دەکاتە سەر تواناکانی ئێمە وەك هاونیشتمانی لە گشت بوارەکاندا، لێرەوە مانایەکی مۆدێرن بەو قەناعەتە کلاسیکی‌یە دەبەخشێ، قەناعەتی ئەوەی کە هونەری فەرمانڕەوایەتی‌کردن لە بنەڕەتدا بریتی‌یە لە هونەری پەروەردە.

رۆسۆ لەو باروەڕەدا بوو کە کۆمەڵگای بۆرژوازی لەرێگای بە رۆتینی کردنی پێشبڕکێ‌وەو خولقاندنی قەلەقی پێشبڕکێ لەلایەکەوە زیاتر لە هەر کات دوورمان دەخاتەوە لە بەختەوەری سروشتی‌و لەلایەکی دیکەشەوە جەوهەری ئینسانی بوون دەشێوێنێ.. بەڕای رۆسۆ چ ئینسانی هۆبزی کە هەمیشە سەرگەرمی بەدەست هێنانی دەستەڵاتەو چ بەرنامەی سیاسی‌و ئەخلاقی رۆشنگەری هیچ کامێکیان سروشتی نین، بەڵکو ئەوە جۆرە ئینسانێکە کە لەلایەن کۆمەڵگاوە فاسدکراوە(١٣).

لە کۆمەڵگای بۆرژوازیدا لەوکاتەدا کە پێویستیەکانمان رۆژانە زیاترو زیاتر دەبن، غەمخۆاردن بۆ مانا قووڵەکانی بوون کەمتر دەبنەوە، لە کۆمەڵگایەکی لەو جۆرەدا زیاتر ئێمە سەرقاڵی جێ‌و مەقام‌و هەیبەت دەبین وەك لە مانا قووڵەکانی بوون‌و حەقیقەت. ئێمە خۆمان دەدۆڕێنین‌و لەجیاتی زاتێکی دروستکراو یا صناعی دروست دەبێت کە لەلایەن ئەوانی دیکەوە دیاری دەکرێ‌و پێناسە دەکرێ، قبووڵکردنی ئەوانی دیکە بۆ ئێمە یا قبولکردنی ئێمە لەلایەن ئەوانی‌دیکەوەو قبووڵکردنی زەوق‌و سەلیقەی ئێمە لەلایەن ئەوانەوە خۆی دەبێتە تاکە قەلەقیەك. ئەمە کۆمەڵگایەکە لەسەر کێشمەکێش لەسەر جێ‌و مەقام بیناکراوەو هەقی گەیشتن بە شکۆمەندیەکی

رەسەنا نەمان لێدەستێنێتەوە، شکۆیەك کە قارەمانەکانی کلاسیكو سیاسەتمەدارەکانی کلاسیك بەدەستیان دەهێناو لەجیاتی ئەمە دەمانکاتە ئەو بوونەوەرە بچووکانەی کە سەرگەرمی رازیکردنو بەختیاری زۆر بچووك بچووکن. چارەسەری رۆسۆ بۆ ئەم کارەساتەی کۆمەڵگای بۆرژوا لە کتێبی "ئەمیلی"دا خۆی بەیان دەکا کە بریتییە لە پەروەردەیەکی ئایدیاڵ بۆ ئینسانێکی سادە. (١٤) ئەم چارەسەرە بۆ ئەوەیە کە تا دەشێ سەربەخۆیی سروشتی بپارێزرێ تاکو ئینسان لەمە زیاتر ئازار نەچێژێ بەدەست ئیعتمادکردنییەوە لەڕووی سۆزەوە بە ئەخلاقی باوو دیدەگای باوی کۆمەڵگاوە. با یەك دوو سەرنجی خێرا بدەینە کتێبی "ئەمیلی".

لە پرۆسەی پەروەردەکردنی ئەمیلیدا، پێویستیەکانی ئەمیلی کورتکراونەتەوە بۆ پێویستیە سادەو سروشتیەکانی مانەوەی خود، یاخود–مانەوە self-preservation ئەمەش لەڕێگای ناردنی ئەمیلییەوە بۆ لادێ تا پشت بە کۆمەڵگای بەرخۆری (إستهلاکی) نەبەستێتو تاکو راپێچ نەکرێتە سەر خوانی ململانێ لەپێناو جێو مەقامداو تا نەبێتە قوربانی ئەو ئارەزوو رۆژ لەدوای رۆژ زیادبووانەی ئەو کۆمەڵگایە. بەڵام کاتێك ئەمیلی بە تەمەنی باڵق بوون دەگا ئەم هەنگاوەی یەکەم کافی نییە بۆ پاراستنی ئەمیلیو سەربەخۆیی بوونی. لەبەر ئەوەی ئارەزووی سێکسی بە ناچاری پشت بە کەسانی دیکە دەبەستێ، لێرەوە بۆ تێرکردنی ئەو تاسەیە ئێمە بەناچاری دەبێت خۆمان تووڕ هەڵدەینەوە ناو پەیوەندییە باوەکانو پڕ نامۆبوونەکانەوە. کاتێك ئەمیلی وەدووی ئارەزووی سێکسی دەکەوێ بە ناچاری سەربەخۆییو خود–کەفایی خۆی لەدەست دەدا، لەجیاتی ئەوە دەبێت هەوڵ بدا کە بەپێی ستانداردەکانی کۆمەڵگا کە ئەوانی دیکە (others) دایانڕشتوون هەڵسوکەوت بکا. لێرەوە ئەو لەخودی خۆی دادەبڕێو بەخۆی نامۆ دەبێت. چارەسەری رۆسۆ بۆ ئەم حاڵەتی نامۆبوونە بریتییە لە جوڵاندنی جۆشو خرۆشی ئەمیلی لەڕێگای وێنەی ئافرەتێکی ئایدیاڵەوە، واتە سۆفی. رۆسۆ بەیەك گەیشتنی ئەم دووانە دادەخا تا ئەوکاتەی کە خەیاڵی ئەمیلی تەواو پەخش دەبێت وە بۆ هەموو سنورەکانی. ئەو ئەمیلی قانیع دەکا کە لەم ئافرەتەدا (سۆفی) سەربەخۆیی سروشتیو تەوازوعو چاکەی سروشتی ببینێتەوە. رۆسۆ ئەمیلی تەشویق دەکا کە تێرکردنی ئارەزوو و تاسەی بۆ ئەم ئافرەتە دوابخا تا ئەو کاتەی کارێك دەکا کە خۆی بەشێوەیەك پەروەردە بکا کە شایانی سۆفی بێت، لەڕێگای سەربەخۆ بوونو ئازادبوونەوە هەروەك چۆن سۆفی ئازادو سەربەخۆیە. لەڕێگای قانیع کردنی ئەمیلیوە بۆ گۆڕینی ئارەزووە سێکسیەکان بەتاسەیەکی رۆمانتیکیانە یاخود رۆحیانە بۆ یەکێتییەکی رۆحی لەگەڵ سۆفیدا، لەگەڵ باشترین خاسیەتەکانی سۆفی کە خۆی رەنگدانەوەی

خاسیەتەکانی ئەمیلی خۆیەتی، لەم ڕێگایەوە ڕۆسۆ ئەمیلی فێر دەکا کە عاشقی سەربەخۆیی خۆیی بێت لەگەڵ عاشقی حیکمەت، چونکی سۆفی بەمانا یۆنانیەکەی واتە حیکمەت. لەڕێگای فێرکردنی ئەمیلی تاکو ئیرادەی دەستەڵاتی بخاتە گەڕ لەپێناو ئایدیالی خۆیدا، ڕۆسۆ ئیرادەی ئەمیلی ڕزگار دەکا لە هەموو ئەو شێوە فاسدانەی ژیانی کۆمەڵگا وەکو عەودال بوون بە دووی حەوانەوەی ماتەریالێستیو جیّو مەقامی کۆمەلایەتی..هتد.

لای ڕۆسۆ خواستنی خودی خۆمانو بەرزبوونەوە بۆ ئەودیو غەریزەکان پێویستە لە ئیرۆتیکای بەیەکێتیبوون گەیشتندا زەمینەی خۆی خۆش بکا، لە هارمۆنی نێوان حەماسەتو ئەرکدا. بەم شێوەیە ڕۆسۆ هەوڵدەدا کە دیدی کلاسیكو بەتایبەت پەروەردەی ئەفلاتوونی جارێکیدی زیندوو بکاتەوەو دایبرێژێتەوە لەسەر مەبنای تاککەرایی مۆدێرن.

*　　　*　　　*

با پرسیار بکەین کە ڕۆڵی زانکۆ لەم پرۆسەیەدا، لەم پرۆژەیەدا، پرۆژەی پەروەردەی لیبراڵ، لەم گفتوگۆ فیکریو عەقڵیەدا چییە؟ سەرەتای دەبێت بزانین کە مەبەستمان لە زانکۆ چییە؟

لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا ژیانی ئەورووپایی خۆرئاوا گۆڕانێکی گەورەی بەخۆیەوە دی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ بەهۆی کێشمەکێشێکی زۆر کە پێیدا تێپەڕی. بەربەرییەکان لە باکوور (ئەوانەی کە زۆر درەنگ بوونە مەسیحیو هەر زۆر زووش وازیان لە مەسیحیەت هێناو ئەمڕۆش مۆلگەن بۆ دژایەتیکردنی نەك مەسحیەت بەڵکو هەر ئاینێك) جۆرێك لە زەینی (زهنیەتی) توندوتژیو جۆرێك لە ئەخلاقی جەنگاوەریانەیان بە ئەروپای خۆرئاوا ناساندو ئیزافە کرد.

موسڵمانەکانیش وەکو ئەوی دیکەی مەسیحیەکان بوونە مایەی ئەوەیکە دامو دەستگا مەسیحیەکانو مەسیحیەکان ناچار بکەن کە بە ئاگا بێنەوەو خۆئامادە بکەن بۆ ئەو تەحەدا عەقڵیو ئیمانیەی کە ئیسلام دروستی کردبوو، لەپاڵ ئەم فاکتەرانەو فاکتەری ئابووریو سیاسی دی بوونە مایەی سەرهەڵدانی ئەو شارانەی کە بە حەسار چواردەوریان گیرابوو. ئەم شارانە دواجار بوونە شوێنی لەدایك بوونی زانکۆکان. لە نێو چوار دیواری ئەم شارانەدا هاونیشتمانیان لەسەرخۆ بەجۆرە سەربەخۆییەك دەگەیشتن. لەو شارانەدا خەڵکی ئەنجوومەنیان دروست دەکرد بۆ ئیدارەکردنی کاروباری هاوبەشو پاراستنی پیشەکانیانو دانانی یاسا بۆ چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەو کاروبارانە، بەم شێوەیە هێواش هێواش خۆیان ڕزگار کرد لەو کۆسپو تەگەرانەی کە دەهاتە پێشیان لەلایەن کڵێساو میرەکانەوە. ئەم بزووتنەوە

مەدەنیە هەر زۆر زوو کاریگەری خۆی لەسەر بواری پەروەردە نیشان دا. یەکێك لەو کاریگەریانە زیادبوونی ژمارەی قوتابخانەکان بوو. وێڕای کۆنترۆڵی پیاوانی ئایینی بەسەر ئەو قوتابخانانەوە، بە تێپەڕبوونی کاتی ئەو قوتابخانانە زیاتر مۆرکی عەلمانیان بەخۆوە گرت. لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا هەندێ لەو قوتابخانانە لەژێر کۆنترۆڵی کلێسا دەرچوون‌و بوون بە داموو دەستگای سەر بە شارەوانییەکان: قوتابخانەکانی خوێندنی بالا لەسەرەتاوە پێیا دەگوترا: studi a generlai (لێکۆڵینەوەی گشتی)و تادواجار بە universities ناویان دەرکرد.

سەرەتاکانی زانکۆ دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دوازدە ئەو کاتەی لە کۆمەڵێ شاری جیاوازەوە قوتابیان روویاندەکردە چەند شارێك کە ناوبانگیان دەرکردبوو بە بوونی قوتابخانە یا مامۆستای چاك لە بوارەکانی سیۆلۆجیا (ئیلاهیات)و پزیشکی‌و یاسا، وەکو پاریس‌و ئۆکسفۆرد سەرەتاکانی گەشەکردنی فێربوون بریتی‌بوو لە هونەرەکانی لیبڕاڵ liberal arts، لەکاتێکدا لە ئیتالیا بەهۆی پێویستی ژیانی پراکتیکی‌یەوە هونەری رەوانبێژی‌و بەرئەنجامە یاساییەکانی ئەو هونەرە زیاتر شوێنی گرنگی پێدان بوو، لە باکووری ئەورووپا بەهۆی دەستەڵاتی کلێساوە بەسەر سیستەمی پەروەردەدا زیاتر لۆژیك‌و دیالەکتیك شوێنی برەوپێدان بوون، بەتایبەت لۆژیکی ئەرستۆیی. لەشاری پاریس زیاتر لێکۆڵینەوەی فەلسەفی‌و ئیلاهیات لە برەودابوو، لە سەرەتای سەدەمی دوازدەدا ئەڤیرۆسیزم (ئبن روشدیەت) بۆ ماوەیەك شوێنی گرنگی پێدان بوو تا ئەو کاتەی کە تۆماس ئەکواینەسی بە ئەڤیرۆسی (ئیبن رۆشدی) تاوانبارکراو بۆ ماوەیەك تۆماسی ئەکواینەس‌و ئەڤیرۆسزمیش یاساغ کران. لەگەڵ بوونی جیاوازیشدا لێکچوونێکی بنەڕەتی لە هەل‌ومەرجی ئەکادیمیدا لە برەو پەیداکردندا بوو لەو بنکە پەروەردەییانەدا لە ئیتالیاو پاریس‌و ئینگلستان. لە هەموو حاڵەتەکاندا، هەندێ قوتابخانەی هونەرەکانی لیبڕاڵ لەسەر خۆ جەغدیان کردە سەر هەندێ بواری تایبەتی لێکۆڵینەوەو لێرەوە ئەو قوتابخانانە بوونە شوێنی studia generalia (لێکۆڵینەوە گشتی‌یەکان)، واتە بەشێوەیەکی گشتی بوونە شوێنە ناسراوەکان بۆ لێکۆڵینەوە کە دەرگاکانیان کراوە بوو بۆ هەموو قوتابیان لەسەرتاسەری ئەورووپادا. لێرەدا دەبێت هێڵێك بهێنین بەژێر ووشەی لێکۆڵینەوەدا چونکی ئەمە سەرەتای زانکۆیەو زانکۆش بۆ ئەم مەبەستە واتە لێکۆڵینەوە هاتە ئاراوە. زانکۆکان بریتی بوون لە کۆمەڵەیایانەی مامۆستایان‌و قوتابیان کە دامەزرابوون بەنیازی نەك خوێندن بەتەنیا بەڵکە یارمەتیدانی یەکتری‌و پاراستنی یەکتر لەسەر شێوەی ئەو کۆمەڵە پیشەییانەی‌تر کە لەسەرهەڵداندا بوون‌و لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکان.

لەسەدەی سیازدەهەمدا گۆڕانێکی گەورە هاتەکایەوە. کۆمەڵێ لەو قوتابخانانە گەشەیان کرد لەتەك هەبوونی پەیڕەوپڕۆگرامی تایبەتو بوونی ئیداریەکی سەربەخۆدا کە دواجار ناسران بە Universita Studii ئینجا Universitias (بە زمانی لاتینی). لێرەوە زانکۆ لە بەرانبەر دەستەڵاتی مەدەنیو ئاینیدا خۆی چەسپاند، ئەمەش ڕێگای خۆش کرد بۆ ڕێنسانسو پەروەردەی هیومانیستی (مرۆڤ پەروەری). سەرەتا سەرنجێك لە زاراوەی ڕێنسانس بدەین زاراوەی "ڕێنسانس" کە بەو بەکارهێنانە باوانەی کە هەیەو مانای بە ئاگاهاتنەوەیەکی ڕۆحی کە بووە مایەی وەرچەرخاندنێکی نوێ، ئەم زاراوەیە لەڕووی حەرفیەوە زۆر بەرتەسکە. لە باشترین حاڵەتدا تەنیا یەك قۆناغی ئەو بزوتنەوەیە لەم زاراوەیەداو لەم بەکارهێنانەدا تەعبیری لێدەکرێ. دوو ڕاستی بنەڕەتی دەبێت لەبەرچاو بگرین، لەلایەکەوە، جارێکیدیکە لەدایك بوونەوە re-birth یا بووژانەوەی بیروپراکتیکی کلاسیكو ڕاپەڕین دژ بە تەسك بینی سەدەکانی ناوەڕاستو جەغت کردنە سەر ژیانی تاکە کەسی لەلایەکیدیکەوە بەواتایەکیدی پرەنسیپی یەکەم لە بووژاندنەوەی ڕابووردوو دەدوێو ئەوی دیکە خولقاندنی داهاتوو، ئارەزووی بوژاندنەوەی ڕابردوویەکی پڕشنگدار لە بنەڕەتدا شێوەیەکی دی ئەو ئارەزووە بوو بۆ ئایندەیەکی ڕۆشن ئامانجی ئەو کەسانەی کە چاویان لە بەرهەمهێنانەوەی ژیانی جیهانی کلاسیك لە ڕاستیدا بریتی بوو لە دروست کردنەوەی جیهانی خۆیان. لەبەرچاوگرتنی ئەم دوو کەڵکەڵەیەی ڕێنسانس زۆر گرنگە بۆ زانینی لەلایەك گەشەکردنی پەروەردە لەدوای ڕێنسانسو لەلایەکیدیکەشەوە کاریگەری ئەو دوو کەڵکەڵەیە لەسەر پەیامو ئایدیای زانکۆ. جەوهەری پەیامی زانکۆ بریتییە لە پەروەردەی مەدەنی Civic educationو پەروەردەی مەدەنیش خۆ ئامادەکردنە بۆ گفتوگۆکردنی مەعریفیانە دەربارەی کێشە سیاسییەکانی بواری مەدەنی، لێتوێژینەوە دەربارەی گشت کایەکان، خستنەڕووی پرسیارو دەرگیربوون لە تەك گفتوگۆی عەقلی بەدوور لە هەر دەستەڵاتێك جگە لە دەستەڵاتی عەقڵ. ئەم ڕۆحیەتە زانکۆی خستە سەر ڕێگای پەیامێك کە لەسەرخۆ بوە مایەی دروستکردنی ئەدەبیاتی نوێ زانستی نوێ، مێژوی نوێی فەرمانڕەوایەتی کردن. بە مانایەك لە ماناکان دروشمی "گەڕانەوە بۆ ئاینو ئەدەبیاتی جیهانی کۆن" لە ڕاستیدا چاوی لەم ئامانجە بڕیبوو "دروستکردنی جیهانێکی نوێ"و لێرەوە زانکۆش هۆکارو ئامرازەکە بوو بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە، بەڵام زانکۆ چییەو پەیامی زانکۆ دەبێت چی بێت؟

سەرەتا با پێناسەیەکی سادە بکەینو لێرەوە، بەرەو ئاڵۆزی زیاتر کە ڕەنگدانەوەی ئەم دەستگا ئاڵۆزەیە هەنگاو بنێین. زانکۆ ئەو مەڵبەندە

پەروەردەییەیە کە تێیدا لێکۆڵەرەوە Scholar و قوتابیان دەگیرێ پرۆسەی زانینن، کەشف کردنی ئەو شتەی کە دەبێت بزانرێت، پرۆسەی گەڕان بەدوای راستیدا، واتە ئیرادەی زانینین. مادامێك ئەم پرۆسەیە پەیوەندی هەیە بە هەموو رەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵگاو مرۆڤەوە، رەهەندی مەعریفیی‌و رۆحانیی‌و سیاسیی‌و هتد، لێرەوە تەنیا زامنێك (گەرەنتۆرێك)و ئنجا مۆتۆرێکی ئەم پرۆسەیە برتییە لە ئازادی ئەکادیمی. راستیەکی نکۆڵی لێنەکرا وە کە دەوڵەت‌و کۆمەڵگا چاو لەم دەستگایە دەبڕن چونکی ئەم دەستگایە قوتابیان ئامادە دەکا بۆ دنیای گشتی Public، و مەشقیان پێدەکا بۆ گەشەکردنی توانا زانستیی‌و عەقڵیەکان. لێرەوە زانکۆ ئەو دەستگایەیە کە ئامانجی پراکتیکی (عەمەلی) هەیە بەڵام ئەم ئامانجە تەنیا لەرێگای فەراهەم کردنی ئازادیی‌یەوە بەدەست دێ، لێرەوە ئازادی رۆحی زانکۆیە. پرۆسەی زانین کە هۆ یا بەهانەی بوونی زانکۆیە لەرێگای چاودێریکردن‌و بیرکردنەوەی میتۆدیی‌و رەخنەلەخۆ وەك پرۆسەیەکی بەردەوام مەیسەر دەبێت، ئەمەش لێتوێژینەوەی سیستیماتیك دەخوازێ، لێرەوە لێتوێژینەوە دەبێتە کاری یەکەمی زانکۆ.

ئاشنا بوون بە میتۆدو لێتوژینەوە لەرێگای وانە گووتنەوەو، پرنسیپی سەرەتایی زانکۆیە . ئامادەکردنی‌لێکۆڵەرەوە، یا دروست کردنی نەوەی نوێ لە لێکۆڵەرەوەکان لەقوتابیان لەرێگای لەبەرکردنی کۆمەڵێ چەمك و جەستەیەکی داخراوی مەعریفیی‌یەوە، مەیسەر نابێت بەڵکو لە رێگای مەشق کردن و گەشەپێدانی بیرکردنەوەی زانستی یەوەو گەشەپێدانی فاکۆڵتی عەقڵەوە مەیسەردەبێت. هەنگاوی‌یەکەم دەبێت قوتابیان فێر بکرێن چۆن پرسیاربکەن، پرسیارکردن هەم هەنگاوی یەکەمەو هەم رۆحیەتێك کە ئەو دوای ژیانی سکوڵەرانەی(لێکۆڵەرەوانەی) قوتابی، گەر ببێتەلێکۆڵەرەوە، رێنومای‌دەکا.لەشێوەی دەرەوەداو لەژیانی رۆژانەی ئینسانەکاندا رەنگەپرسیارکردن رەنگەواخۆ بنوێنێ‌کە ئەرکێکی گەورەنیی‌یەو مەشق کردنی ناوێ، بەڵام هەرکە پێمان نایە ناو مەملکەتی مەعریفەو، ئەوسا تێدەگەین کە پرسیارکردن سەخت ترین کارە، کام پرسیارانە دەتوانین بخەینە روو؟ چۆن لەتەك پرسیارەکاندا دەستو پەنجە نەرم بکەین؟ چۆن پرسیاری راست لەکاتی راستداو دەربارەی بابەتی راست بخەینەروو؟ مەسەلەی فێربوونی پرسیارکردن پەیوەندی بەلێکۆڵینەوەی سیستیماتیکیەوە هەیە ، چۆن لەرووی سیستماتیکی‌یەوە، ئەو پرسیارە بخەیتەروودەربارەی بابەتێکی دیاریکراو کە قوتابی دەگەیەنێتە سنورێك. لەم پرۆسەیەداقوتابی بەکۆمەڵێ مەعریفەی واقعی دەگا، بەڵام وێرای گرنگی ئەم رەهەندەی ئەم پرۆسەیە، ئەمەئامانجی سەرەکی نییە، بەڵکو ئامانجی سەرەکی بریتی‌یە لە چۆنێتی لێکۆڵینەوە، بریتی‌یە لەمیتۆد، چۆنێتی بیر کردنەوەلەو

فاكتانه(ڕاستیانه) و چۆنێتی خستنه ڕووی پرسیاری نوێ. لێكۆڵینه‌وه په‌یوه‌ندی به پرنسیپێكی دیكه‌ی بنه‌ره‌تییه‌وه‌هه‌یه ئه‌ویش یه‌كێتی مه‌عریفه‌یه، گه‌ر له‌ناوی زانكۆ وورد بینه‌وه چ له‌زمانی كوردیداو چ له زمانه ئه‌وروپیه‌كاندا ده‌بینین كه زانكۆ واته كۆی زانینین و(university) كه‌ڕیشه‌كه‌ی(univerise)ه واته گه‌ردوون. كه‌واته ئه‌و كاته‌ی زانكۆ ده‌بێته كۆمه‌ڵێ لێكۆڵینه‌وه‌و دیپارتمان (به‌ش) كه‌په‌یوه‌ندیان به‌یه‌كه‌وه نی‌یه‌و شتێك، ڕۆحیه‌تێك ، په‌یامێك، ئامانجێكی گه‌ردوونی نییه كه پێكیانه‌وه گرێ بدا ئه‌وسا زانكوداده‌رزێ و ئه‌مه‌ش حاڵه‌تێكی بێ‌مانایی دروست ده‌كا. ده‌توانین ئه‌م یه‌كێتی مه‌عریفی یه ناوبنێین"دیدی فه‌لسه‌فی". ده‌بێت فه‌لسه‌فه له دیدی فه‌لسه‌فی جیا بكه‌ینه‌وه، فه‌لسه‌فه‌وه‌ك كایه‌كی تایبه‌تی، به‌لام دیدی فه‌لسه‌فی كه هه‌رچه‌نده زاده‌ی فه‌لسه‌فه‌و ڕوحی فه‌لسه‌فه، كه‌مێك سه‌راپاگیر تره، مه‌به‌ستمان له دیدی فه‌لسه‌فی دووشته، یه‌كه‌م ئه‌وكه‌لكه‌ڵه‌یه‌یه كه‌لێكۆڵینه‌وه لێوه‌ی ده‌ست پێده‌كا، ئه‌و ئایدیایه‌ی كه ڕێنومایی لكۆڵینه‌وه ده‌كاو مانابه‌م گه‌ڕانه ده‌به‌خشێ، ئه‌م كه‌لكه‌ڵه‌یه گه‌ڕانه به‌دوای حه‌قیقه‌تدا، ئیراده‌ی ڕاستی‌و زانینین. دووهه‌م، مه‌به‌ست له‌دیدی فه‌لسه‌فی سه‌یر كردنی ژیانی ئینسانه‌و غه‌مخواردنی ده‌رباره‌ی هه‌لو مه‌رجی ئینسان وه‌ك كۆیه‌ك ، واته كۆی هه‌موو ڕه‌هه‌نده‌كانی هه‌لو مه‌رجی ئینسان. له ڕاستیداگه‌ر ئه‌م دیده فه‌لسه‌فی‌یه نه‌بێت كه‌وه‌ك كۆیه‌ك له هه‌لو مه‌رجی ئینسانی بڕوانێ هه‌ر لقه‌ی زانست ئه‌گه‌ری ئه‌وه‌ی هه‌یه‌كه به ڕێگایه‌كدا بڕواو گه‌شه‌بكا كه دواجار ببێته مایه‌ی خاپووركردنی ژیانی ئینسان ، یاخود به‌لانی‌كه‌مه‌وه ، ئه‌و لقه‌ی زانست ڕوولـه عه‌ده‌میه‌ت(هیچ گرایی)بێ یاخود به‌هیچ گه‌رایی بگا ، زانكۆ عه‌وداڵی زانست‌و لێكۆڵینه‌وه‌و وانه گووتنه‌وه‌یه ،هه‌وڵ ده‌دا. كه ئیزافه بخاته سه‌ر كلتوری عه‌قڵی، زانكۆ ڕێگایه‌كه كه‌لێوه‌ی حه‌قیقه‌ت وه‌كو به‌رهه‌می ئه‌و گه‌ڕانه خۆی به‌یانده‌كا، زانكۆ چاو له میتۆدێ ده‌برێ كه مه‌وزوعیه‌تی كردۆته ئامانج، ئه‌م میتۆده ڕێگانادا كه كه‌س، قوتابی یا لێكۆڵه‌ره‌وه به‌هه‌ر شێوه‌یه‌ك كه‌دڵی ده‌خوازێ بیر بكاته‌وه ، به‌ڵكو خاسیه‌تی سه‌ره‌كی بریتی‌یه له‌ڕۆحیه‌تی گومان و هه‌ڵسوكه‌وتی پرسیار كردن،به‌لام ئه‌وه‌مان له‌یادبێت كه‌گومان جۆری زۆره ، گومان هه‌یه‌منداڵانه، هه‌رزه‌كارانه كه سه‌رچاوه‌كه‌ی ڕاكردنه له بیركردنه‌وه‌ی ڕه‌سه‌نو گومانیش هه‌یه خۆی هه‌نگاوه به‌ره‌و بیركردنه‌وه‌ی ڕه‌سه‌ن واته هه‌ر كه‌سه گووتی "بۆ" مانای وانیه كه‌گوومانی هه‌یه یا پرسیاری دروست . كه‌واته ئه‌ركی زانكۆ بریتی‌یه له لێكۆڵینه‌وه‌و پرۆسه‌ی فێر كردن ، په‌روه‌رده‌وكلتوور به‌واتایه‌كی دی سێ شت له‌زانكۆدا پێویستن: مه‌شق كردنی پیشه‌یی (پرۆفێشناڵ) و په‌روه‌رده‌ی سه‌راپاگیری ئینسان ، مه‌به‌ست

لە سەراپاگیری لێرەدا بەسەرکردنەوەی گشت ڕەهەندە کانی ژیانی ئینسانە ، و لێکۆڵینەوە. لەزانکۆدا ئەم سێکایەیە دەبنەیەك

لەپاڵ لێکۆڵینەوەدا پەروەردە کۆڵە کەیەکی دیکەی زانکۆیە. چونکە پەروەردە ئەو ئاوێنەیەیەکە بونیادەکانی کۆمەڵگا عەکس دەکاتەوە، لێرەوە بەهۆی گۆرانکاریە مێژوویەکانی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی‌یەوە ئایدیای پەروەردەش حاڵەتێکی نەگۆری نی‌یە، بۆ نموونە باڵەم دوو تایپە ووردببینەوە. تایپێکمان هەیەپێی دەگوترێت پەروەردەی سوکراتی. لە دیدی سوکراتەوە پەروەردە بریتییە لەمامانی کەتێیدا قوتابی کە سك پڕە بەئەگەرو دەستەلاَت کۆمەك دەکرێ تابزێ، واتە ئەگەرەکانی خۆی بکاتە واقع، واتە ئاگادار دەکرێتەوە، هۆشیاردەکرێتەوە کە تواناکانی خۆی کەشف بکا. پەروەردەی سوکراتی واتە دەست گرتنی قوتابی تاخۆی بیربکاتەوەو توانای بیرکردنەوەوتاقی کردنەوەی عەقڵی بخاتە گەڕ، دەست گرتنی قوتابی بۆ سەر ڕێگای ناسینەوەی حەقیقەت. تایپی دووەهەم بریتی‌یە لە سکۆلاستیك . ئەم جۆرە لە پەروەردە بریتی‌یە لەگواستنەوەی ترادسیۆن لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی، تێیدا کتێبو مامۆستاو دۆگما وەك ئەتۆرەتی سەیریان دەکرێ، مامۆستا بەتەنیا ئەوەی لەسەرەکە ئەم جەستەیە لەمەعریفە بێدەست کاری نەقڵ بکا بۆ قوتابیان وقوتابیانیش تەنیا ئەوەیان لەسەرە کەئاشنا بن بەو کتێبو دۆگمایانە دەبێت ئەوە بڵێین کە ئەم تایپەی پەروەردە گەر شان بەشانی جۆرێکی دیکەی پەروەردە بڕواکە تێیدا توانای بیر کردنەوەو پرسیار کردنو توانای تەفسیر فەراهەم بکا، ئەم تایپە گرنگی خۆی هەیە، بەلاَم گەر بەتەنها مەبەست لە نەقڵکردن بێت ئەوامانا پەروەردەییەکەی خۆی بزر دەکا. لەپاڵ ئەمانەدا جۆرێکی دی پەروەردە هەیە کەبریتی‌یە لەئامادەکردنی قوتابیانو کردنیان بەکادێر لە کۆمەڵێ بواری پیشەیدا، واتە کردنی قوتابی بەپسپۆرلە پیشەیەکی تایبەتیدا کەدواجار پێویستی‌و داواکاری کۆمەڵگا لەقۆناغێکی تایبەتی مێژووی خۆیدا دەیسەپێنێ. ئەم تایپە لە پەروەردە ئەوکاتە ئیشکالیەت ئامێزە کەباڵ بەسەر زانکۆ دا بگرێتو زانکۆ لەو بنکەیەوەکەبریتی‌یە لەکۆبونەوەی لێکۆڵەرەوەو قوتابی لەسەر خوانی مەعریفە بگۆرێتە سەر پەروەردەکردنی تەنیا کەسی خاوەن پیشە، ئەوسا زانکۆ لەپەیامی مەعریفی خۆی لادەداو پەیامەکەی خۆی لەدەست دەدا ، ئەمەش بەشێکە لەو قەیرانەی زانکۆکانی خۆرئاوا لەرۆژگاری ئەمرۆدا.

مەشق کردنی قوتابیان لەسەر لێکۆڵینەوە بریتی یە لەپەروەردەکردنیان تاکو واسەیری خوێندن نەکەن کە نەقڵکردنێکی زانراوەکانو ڕاستی‌یەکانە بەڵکو بەئاگا هاتنەوەی ڕۆحی نەقدی‌یە لەناویانداو گەشەکردنو چالاککردنی عەقڵە. بەم شێوەیە

پەروەردە کەڵکەڵەی عەقڵیوفەلسەفی لە خۆ دەگرێ کەچاولەئینسان دەبڕێ وەك کۆیەك وتەنیائیلتزامێکیش شوێنی جەغد کردنە ئەویش ڕۆحی لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای حەقیقەتی شتەکاندا، گوێگرتن لە ئەرگومێنت، تێگەیشتن لە ئەرگومێنت، پەروەردە کردنی توانای بیرکردنەوە لە ئەرگومێنتو هەڵسەنگاندنی ئەرگومێنتو ئینجا خستنەڕووی ئەرگومێنت. ئەم هێزەی پەروەردەکردن کەئایدیای زانکۆیە لە ئیرادەی زانینەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەو ئیرادەیەی کە لەیەك کاتدا دڵنیایی ئامانجەکان بەکەسی پەروەردەبوو دەبەخشێ، ئەو پرۆ سەیەش خۆی لەخۆیدا کارێکی کلتوری یە، واتە جیاکردنەوەی مرۆڤ لەئاژەڵو نەفامو جاهیل، چونکی کلتور واتە ڕزگار کردنی ئینسان لەستەمکاری نەزانینو گەیشتن بەڕووناکیزانین کە خۆی بریتییەلە ئازادی. گومان لەپێویستی بوون یابوونی ڕاستی،پێویستی بوونی مەعریفە، قبووڵکردنی هەمووشتێ ، ڕازی بوون بەوەی کەهەموو ئەگەرێك وەك یەك سەنگیان هەیە، سەیر کردنی زانست وەك حیکایەت ، کاڵ بونەوەی سنورەکانی نێوان عەقڵوناعەقڵ( ئارەزوو غەریزە)، کاڵ بوونەوەی سنورەکانی جەهل ومەعریفە، ئەمە تەنیا عەدەمیەت نییە بەڵکو مەرگی زانکۆشە، ئەمڕۆش لەدنیادا کەم نین ئەو دەنگانەی کە بانگەشە بۆ ئەم کارەساتە دەکەن . مۆتۆری زانکۆ بریتییە لە ئیرادەی گەڕان بێ ڕێگری، گەشەکردنی عەقڵ بێ دەست تێوەردان ، جگە لەڕێنومای کردنی لەلایەن خودی عەقڵەوەوپەیرەوی کردن لەدروشمی"بۆیرە بزانیت".

لەسەرەتادا گووتمان سەربەخۆیی زانکۆ بنەمایەکە مشتو مڕ هەڵناگرێ ، گووتمان کە کۆمەڵگاو دەوڵەت بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان هەیە لە زانکۆداو زانکۆش وەلامگۆی کۆمەڵێ غەمی کۆمەڵگاو دەوڵەتە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ. بەڵام ئەم پەیوەندییە نابێت بەوە بکشێتەوە کەزانکۆ بکاتە بنکەیەك کە بەپێی خواستو ویستو ئارەزووی کۆمەڵگاو دەوڵەت شێوە بەخۆی یا شێوەی پێببەخشن چونکی لەم حاڵەتەدا زانکۆ لەپەیامە سەرەکی یەکەی کەچاو بڕینە لەمەعریفەو ڕاستیلادەدا. هەموو دەست تێوەردانێکی دەوڵەت، لە هەندێحاڵەتیشدا حزب بەتایبەتی لەو وڵاتە ستەمکارانەی کەدەوڵەت بوونی نییە بەڵکو حیزب فەرمانڕەوایە، لەوانەئەزموونی کوردستانی عێراق لە دەیەی نەوەددا، هەموو دەست تێوەردانێکی لەم جۆرە دەبێتە لادانی زانکۆ لە ئیلتیزامە سەرەکیەکەی بۆ مەعریفە . هەموو دەست تێوەردانێکی لەم جۆرە زانکۆ دەکاتە داموو دەستگایەکیدەوڵەتو مل کەچی بڕیارە سیاسییەکان . ئەم دەست تێوەردانە لە ڕژێمە ستەمکاریەکاندا بەپلەیەك دەگا کە بەپوچەڵکردنەوەی زانکۆو ڕۆڵی زانکۆ

کۆتایی دێت ، هەر بۆیەشە لەو وولاتانەدا زانکۆ بەمانا قوڵەکەی بوونی نییە . لەژێرسایەی ئەو سیستەمانەدا زانکۆ دەبێتە بنکەیەکی مەشق کردن، سەربازگەیەك مەشق کردنی خەڵکی بۆ پەیرەوی کردن لە ئایدیۆلۆژیایەك، ئەفسەرو سەرباز شوێنی سکوڵەر (لێکۆکەرەوە) و قوتابی دەگرنەوە ، لەجیاتی فێربوون پرۆسەی چاندنو شتنی دەماغ بەرکەماڵە.

زانکۆ بنکەیەکە کە بوونی ئەو کاتە مانای هەیەکە سەربەخۆیە ، بەڵام ئەم سەر خۆبوونە لەکۆمەڵگاو دەوڵەت بەمانای ناسیاسی بوونی ئەم دەستگایەنایەت ، بەپێچەوانەوە زانکۆ سیاسیترین داموو دەستگایە چونکی لەتەك مەعریفە مامەڵە دەکات ومەعریفەش پەیوەندی تەنگاتەنگی لەگەڵ سیاسەت دا هەیەبەمانا فراوانەکەی سیاسەت . وەك گووتمان زانکۆ بریتییە لە گفت وگۆو لێکۆڵینەوە لەسەر هەموو ڕەهەندەکانی ژیان ئەمەش خۆی لەخۆیدا سیاسەتە بەمانا قووڵەکەی سیاسەت . هەروەهازانکۆ بنکەیەکە کەقوتابیان ئامادە دەکا بۆ بواری گشتیو مەدەنی (public) ئەمەش مانایەکیدی سیاسی بوونی زانکۆیە . بەڵام ئەوکاتەی لەجیاتی گەران بەدوای ڕاستیدا زانکۆ ببێتە شوێنی گوتنەوەی دۆگماولەجیاتی گفتوگۆی عەقڵی ببێتە بنکەیەك بۆ نەقڵ کردن گوێگرتن لە پڕوپاگەندەی ئایدۆلۆژیا، ئیدی ئەو کاتەزانکۆ لە بنکەیەکی مەعریفییەوە یا دەبێتە بارەگای حزب یا مەخفەری پۆلیس یا ژورێك لە شارەوانی بۆ ڕێکخستنی خزمەتگوزاریو کرێکاران . هەروەها ئازادی زەمینەیەکە تێیدا گەران بەدوای حەقیقەتو لێکۆڵینەوەی زانستی مەیسەر دەبێت ، هەموو دەست تێوەردانێکیش دەبێتە مایەی ووشك بوونەوەی ئەوزەمینەیە، مەبەستیش لە ئازادی ئازادی پرسیار کردنە ئازادی گومان کردن لەتیوریەکان، ئازادی لێکۆڵینەوە، ئازادی پیادەکردنی ئەرگومێنت. ئازادی ئەکادیمی تەنیا ئازادی لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە ناگەیەنێت، بەڵکو ئازادی وانە گوتنەوەش بەشێکە لەپرۆسەکە ، مامۆستاو لێکۆڵەرەوەکان دەبێت ئازادبن لە چۆنێتی و چیەتی گوتنەوەی وانە. چ مامۆستایانو چ قوتابیان دەبێت بەدووربن لە تارمایی هەر جۆرە ئەتۆرەتیەك(دەستەڵاتێك) جگە لە ئەتۆرەتی عەقڵو حیکمەت . ئەم ئازادییە بەو مانایە نابێت تەفسیربکردرێ وەك ئەوەی جۆرێکە لەمۆڵەت ، جۆرێك لەبەرەڵایەتی، واتە مافی گوتنی هەرشتێك کە کەسێك دڵی بخوازێ، ئەمە مانای لەناو چونی ستانداردی عەقڵییەو عەینی فەوزەویەتەو ئەو عەقڵیەتەش دوژمنی فەوزەویەتو فەوزەویەکانەو فەوزەویەتیش جگەلەوەی نا ـ عەقلانییە ڕێگە خۆشکەریشە بۆ بەرەڵایەتی ئازادی ئەکادیمی واتە ڕزگاربوون لەهەموو ئەرکێك جگە لەئەرکی عەقڵیو لێکۆڵینەوەی سیستماتێکو ئیلتزام بە حەقیقەتەوە. لەلایەکی دیکەوە زانکۆ وێرای

پەیوەندی بەکۆمەڵگاو دەوڵەتو نەتەوەیەکی تایبەتەوە، ئامانجی زانکۆ مرۆڤایەتییە، واتە مرۆڤایەتی بەشێکەلە جەوهەری زانکۆ: کەواتە زانکۆ پەیامێکی گەردوونییەو هەرئەم پەیامەشە کەناوی زانکۆ تەعبیری لێدەکا، کۆی مەعریفە. زانکۆ ئەو کاتە خزمەتی گۆمەڵگاو مرۆڤایەتی دەکاکە جەغدلەسەر داهێنانی عەقڵ بکا نەك خزمەتکردی ئایدیۆلۆژیا. لێرەوە زۆربەکورتی دەتوانین بڵێین کە زانکۆ بەسێ ئەرك هەڵ دەستێ کە کارێك دەکا ستەمکاری مەحاڵبێت:

١-لێکۆڵینەوەی زانستیو فکری وعەقڵی

٢-پەروەردەکردنو پرۆسەی فێرکردن

٣- دروست کردنی هاونیشتمانیەکی چاك کە لەبیری کێشەکانی کۆمەڵدابێت، واتە دروست کردنی کاراکتەرێك کەمەحاڵە ستەمکاری قبوول بکاو بتوانێ لەژێر سایەی ستەمکاریدا بژیو مەحاڵەستەمکاری لەسەریەوە هیچ شتێك بینا بکا. لێرەوە پەروەردەی لیبراڵ و زانکۆ ئەوهۆکارەن کەلەڕێگایانەوە ئێمەدەتوانین ئەو بازنەیە بشکێنین کە چەندین سەدەیە ئێمە تێیدا قەتیس ماوین کە بازنەی ستەمکارییە.

# پەراوێزەکان

## پەراوێزی پێشەکی :

١ـ شتراوس، دەربارەی ستەمکاری، لاپەڕە: ٢٣ Leo Strauss ، on tyranny

٢ـ بەرنامەمان بوو بەدرێژی قسە لەسەر ئەم دووشارە بکەین، بەلام ئەمە بۆ بۆنەیەکی هەڵدەگرین.

٣ـ بڕوانە سیۆسیددس، مێژووی جەنگی پینیپلژیان، لاپەڕە ١٣.
Thucydides , History of Pelonnesian War

٤ـ پەیوەندی فەلسەفەو رەگەز بەشێکە لەنامەی دکتۆرا کەم کە بەنیازم لەئایندەدا بەزمانی کوردی قسەی لەسەر بکەم.

## پەراوێزی بەندی یەکەم:

١ـ ئەم تێکستەمان لەم کتێبەوە کردووە بەکوردی Leo Strouss, On Tyranny.

٢ـ لەزمانی ئینگلیزیدا (private) بەکۆمەڵێك مانا دێت، لەوانە کەسی (private) ئەوکەسەیە کە لەبواری مەدەنیو گشتیدا کارناکات واتا کار بۆمیری ناکات، بەمانایەکی دی سەربەخۆیەتی، ئێمە لێرەدا کەسی تایبەت بەکاردەهێنین. بۆ ئەم مەبەستە.

٣ـ ئەرخۆن حاکمی یەکەم لەئەسینای کۆندا.

٤ـ بڕوانە دەربارەی ستەمکاری، شتراوس.

٥ـ بڕوانە فینۆمینۆلۆجیای رۆح، هیغل Hegel Phınomınology of Mınd

٦ـ بڕوانە گووتارەکان، میکافیلی. Machiavelli, The Discourses.

## پەراوێزی بەندی دووەم:

١ـ بڕوانە مێژووی جەنگی پینیپلۆژیان.

٢ـ R.Sealey , A History of The Greek City state.

سیلی، مێژووی دەوڵەت شاری یۆنانی، لاپەڕە ٥٧.

٣ـ A. Andrewes, The Creek Tyrants.

ئەندریۆس، ستەمکارەکانی یۆنان، لاپەڕە ٢١.

٤ـ ئەفلاتوون، کۆمار Plato, The Republic

بەشەکانی ٤٣٥e ـ ٤٣٥b ـ a ٤٤٣, c ـ ٤٤٤

٥ـ هەمان سەرچاوە، بەشەکانی ٤٣٣a ـ a ٤٣٣

٦ـ هەمان سەرچاوە بەشی d ٤٤٣ ..

٧ـ دایەلۆگی گۆرگیاس، ئەفلاتوون، بەشەکانی ٤٧٧a ـ ٤٧٨b .Gorgias, Plato

٨ـ کۆمار، بەشی e ٥٤٤

٩ـ کۆمار، ٥٥٥b٣ ـ a٣ ٥٦٢

١٠ـ کۆمار، ٥ ـ ٤ a ٥٥٧

١١ـ کۆمار، ٥٧١a

١٢ـ کۆمار، ٥٦٥d

١٣ـ گۆرگیاس، ٤٦٩c

١٤ـ کۆمار، c ـ ٥٧٣٠

١٥ـ کۆمار، c - d ٥٧٩

## پەراوێزی بەندی سێهەم:

١- سیاسەت، ئەرستۆ a ١ ١٢٥٣ Aristotle, The Politics.

٢- سیاسەت a ٧ ١٢٥٣.

٣- سیاسەت ٧ - ١٢٥٢٠١.

٤- سیاسەت b ١٥ ١٢٥٢.

٥- سیاسەت a ١٧ ١٢٩٥ ١ ١٢٩٥a.

٦- میتافیزیك، ئەرستۆ b ١٢ ١٠٢٧ Aristotle, Metaphysics, Book1,.

٧- میتافیزیك ٣٠ a ٢٣ ١٩٩.

٨- ئەخلاقی نیکۆماخی ٢٠ a ١ ١٠٩٤.

٩- ئەخلاقی نیکۆماخی 1097 a 10   b6.
١٠- شارو ئینسان لاپەڕە ٣٠، Leo Strauss, The city and Man,
١١- سیاسەت 1263 b 37.
١٢- سیاسەت 1280 a 29   1280 b 11.
١٣- سیاسەت ٣٩   1255 a 32.
١٤- سیاسەت ٣١   1262 a 25.
١٥- سیاسەت ١٤   1262 b 7.
١٦- ئەخلاقی نیکۆماخی 109 a 27.
١٧، ١٨- بڕوانە ئەم بەشانە: سیاسەت، 1286 b 37   41611289 b 2   16 a 13 1267 a 13. ڕەوان بێژی، 1341 a 24.
١٩،٢٠- بڕوانە ئەم بەشانە: سیاسەت 1414 b 30   32   1319 b 25   32 35 1287 a   14   13 1267 a ٠ ڕەوانبێژی 31   1366 a 1.
٢١- سیاسەت 1275 a 22.
٢٢- سیاسەت 22 b - 1275 b 5.
٢٣- سیاسەت 1257 b 25، 12 1258 a.
٢٤ سیاسەت 123 b 35.
٢٥- ئەخلاقی نیکۆماخی 114024.
٢٦- ئەخلاقی نیکۆماخی 267 p 21 b 1157.

# پەراوێزی بەندی چوارەم:

١- ڕۆحی یاساکان، کتێبی یەکەم، بەشی یەکەم سێیەم.
٢- ڕۆحی یاساکان، کتێبی یەکەم، بەشی دووەم، ١-٣، بڕگەی١١.
٣- ڕۆحی یاساکان، کتێبی یەکەم، بڕگەی ١١١.
٤- نامە فارسی‌یەکان، نامەی ژمارە L XXX .
٥- نامە فارسی‌یەکان، نامەی C11.
٦- نامە فارسی‌یەکان، نامەی LXXX.
٧- ڕۆحی یاساکان، بڕگەی ١١١، بەشی یەکەم دووەم.
٨- ڕۆحی یاساکان، کتێبی دووەم، بەشی یەکەم.
٩- ئەرستۆ، کتێبی سیاسەت، 1295 b 20.

١٠- رۆحی یاساکان، کتێبی سێیەم، بەشی سێیەم، بڕگەی هەشت کتێبی VIII ، بەشی سێهەم-بڕگەی دوانزە.

١١- رۆحی یاساکان، ١٤ X.

١٢- رۆحی یاساکان، بەشی دووەم، کتێبی چوارەم، بەشی VIII، بڕگەی هەشتەم، ٢١.

١٣- ئێرنست بێرکەر، ئەفلاتوون و ئەرستۆ، لاپەڕە، ١٣.

١٤- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە :

The Growth of Political Thought in The West from the Greeks to the End of the Middle Ages.

١٥- The Elements, T. Hobbes.

١٦- رۆحی یاساکان، کتێبی پێنجەم، بەندی چواردە، بەشی یەکەم/ بڕگەی ٥٩.

١٧- Considerations on the causes of the Grateress.

١٨- رۆحی یاساکان، کتێبی سێیەم، بەشی نۆیەم، بڕگەی ١٢٠٦.

١٩- نامە فارسییەکان، نامەی ٦٢.

# پەراوێز: بەندی پێنجەم:

١- لە هاوینی ٢٠٠١ کارم لەسەر ئەم باسە کردووە، بەڵام دوای یازدەی ئەیلول دیارە دەتوانین تەفسیریترمان بۆ ئەمریکا هەبێت، وولاتێك کە خاوەنی وەزارەتێك بێت بەناوی وەزارەتی ئاسایشی نەتەوەیی کە ٢٧٠ هەزار کارمەندی هەبێت و بودجەی ساڵانەی ٤٤ بلیۆن دۆلار بێت ئەستەمە بتوانین تەنیا پێی بڵێین ستەمکاریەکی نەرمو نیان بەڵکو راسترە پێی بڵێین ستەمکاری بەمانای ووشە.

٢- توکیۆڤیل، دیموکراسی لە ئەمەریکا، بەرگی یەکەم/ لاپەڕە ٩-١٠.

Democracy In America, Vol 1. P9-10.

٣- تۆکیوڤیل، رژێمی کۆن، لاپەڕە ١٦٩.

Ancien Regime. P169.

٤- ئەن ئیقتیباسە لەم کتێبەوە وەرگیراوە: مارتن تۆرنێل: بۆدلێر، لاپەڕە ٢٣٤.

Martin, Turnell. Baudelaire, p234.

٥- فرانك مانیوێل. جیهانە نوێکەی سان سیمۆن. لاپەڕە٢٨٤.

Franke. E. Manuel. P284.

٦- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ١٤٩.
٧- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٤٧.
٨- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٩٤.
٩- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٣٠.
١٠- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٣٤٠.
١١- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٣٦.
١٢- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٢٦٥.
١٣- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٢٧.
١٤- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٢٧٣.
١٥- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٧٤-٧٣.
١٦- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٢٧٥-٢٧٤.
١٧- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٣٦.
١٨- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣١١.
١٩- توکیوڤیل، نامە هەڵبژێردراوەکان دەربارەی سیاسەت و کۆمەڵگا، لاپەڕە ٣٧٦.

Tocqueville, Selected Letters.. p.376

٢٠- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٣٧.
٢١- دیموکراسی له ئەمریکا، بەرگی دووەم، لاپەڕە ١١٦.

# پەراوێز بەندی شەشەم

١- یەکەمین پێشەکی (ساڵی ١٩٥٠) بۆ کتێبی "ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزم"

Arendt, Origins of Totalitarianism. P VII.

٢- لێرەدا رووبەڕووی گیروگرفتێك دەبینەوە ئەویش نەبوونی مقابلی کوردی بۆ ئەم دوو زاراوەیە لە کوردیدا، ئێمە بۆ (labour)و (work) تەنیا کار یا ئیش بەکار دەهێنین بەلاّم لای ئارنێنت ئەم دوو زاراوەیە زۆر جیاوازن و ئەم جیاوازیەش جەوهەری بۆچوونەکەی ئەوە کەواتە ناتوانین تێکەڵیان بکەین لەبەر ئەوە من لێرەدا رەنج بۆ (labour) بەکاردەهێنم و کاریش بۆ (Work).

٣- ئەرستۆ، سیاسەت، کتێبی یەکەم، بەشی دووەم.

Arstotle, politics, 1.2

٤– ئارێنت، هەلومەرجی ئینسان، لاپەڕە٣٠.

The Human Condition. P30.

٥– هەل‌ومەرجی ئینسان، لاپەڕە ٢٨.

٦– ئەرستۆ، ئەخلاق، کتێبی دووەم،A. ٤

Ethics, II, 40 A.

٧– هەل‌ومەرجی ئینسان، لاپەڕە ١٣٤.

٨– هەل‌ومەرجی ئینسان، لاپەڕە ١٣٩.

٩– هەل‌ومەرجی ئینسان، لاپەڕە ١٧٦.

١٠– هەل‌ومەرجی ئینسان، لاپەڕە ٢٣٧.

١١– هەل‌ومەرجی ئینسان، لاپەڕە ٢٦٩.

١٢– هەل‌ومەرجی ئینسان، لاپەڕە ٣٢٢.

١٣– ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزم، لاپەڕە ٤٧٥.

١٤– بڕوانە ووتاری "دروست کردن‌و تیرۆر" لە کتێبی (ووتارەکان دەربارەی تێگەیشتن: ١٩٣٠–١٩٥٤)، لاپەڕە، ٣٠٢.

١٥– ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزم، لاپەڕە ٤٣٠–٤٣١.

١٦– ئەسڵەکانی توتالیتاریانیزم، لاپەڕە٦.

١٧– ئیریك ڤۆگلین لە نامەیەکیدا بۆ لیۆشتراوس دەربارەی کتێبەکەی کارل پۆپەر (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی) دەڵێت: بەینی خۆمان بێت لە هەموو ژیانمدا کتێبی ئاوا سەخیفم نەخوێندۆتەوە.

Faith and political philosophy.

١٩– ئەسڵەکانی توتالیتاریانیزم، لاپەڕە ٤٥٧.

٢٠– ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی، مارکس، لاپەڕە ١٣–١٥.

Marx. The German Ideology p13-15

٢١– ئایدیۆژیاو یۆتۆبیا، لاپەڕە٥٩.

Ideology and Utopia p59.

٢٢– ولیەم دێلنی، لەکتێبی "گفت‌وگۆی کۆتایی‌هاتنی ئایدیۆلۆژی". ئامادەکردنی چەین واتمان. لاپەڕە ٢٩٥.

William Delany. P295.

٢٣– ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزم، لاپەڕە ٤٦٩.

٢٤– ئەسڵەکانی تۆتالیتاریانیزم، لاپەڕە ٤٦٩.

# پەراوێزی بەندی حەوتەم:

-١

torino da felter and

Other Humanist Educators.

دەربارەی لێکۆڵینەوەی لیبراڵی، ڤێرگێریۆ، لاپەڕە١٠٢.

-٢

What is liberal Education? In Liberalism Ancient and Modern

پەروەردەی لیبراڵ چیی‌یە؟ لاپەڕە ٣٠.

-٣ ئەفلاتوون، یاساکان، a٦٤٤ b ٦٤٣.

Plato, The Laws

-٤ گۆرگیاس، ٤٥٨٩.

-٥ عوزر خوایی، ئەفلاتوون، ٣٨٩

Plato, Apology

-٦ Ovacle: وسیط الوحی، کاهن لە یۆنانی کۆندا. وەحی ئیلاهی لە ڕێی کاهنەوە، ئەو باوەڕەی کە خوداکان لەڕێگای کاهنەوە وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە.

-٧ ئەرستۆ، ئەخلاقی نیکۆماخی، ١٤-٩ a ١١١٣.

-٨ هەمان سەرچاوە، ٣ ٢١ b ١١٠٦.

-٩

Philosophical Writings of Descartes Vol 1

نووسینە فەلسەفیی‌یەکانی دیکارت. لاپەڕە ١٣.

-١٠ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٤.

-١١ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٣.

-١٢ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٣٢.

-١٣

J.J. Rousseau. The first and Second Discourses

جان جاك ڕۆسۆ، یەکەمین و دووهەمین گووتار.

-١٤

J.J Rousseau. Emile, or on Education.

جان جاك ڕۆسۆ، ئیمێلی یان لەسەر پەروەردە.

# References:


Aristotle. 1941. The Basic Works of Aristotle. Edited and with an introduction by Richard McKeon. New York: Random House.

-----------. 1976. Ethics. Translated by J.A.K. Thomson. London: Penguin Books.

-----------. 1981. The Politics. Translated by T. A. Sinclair; revised and re-presented by Trevor J. Saunders. London: Penguin Books.

Arendt, Hanna. 1958. The Origins of Totalitarianism. New York, London: A Harvest-HBG Books.

------------------. 1958. The Human Condition. Chicago: University of Chicago Press.

------------------. 1994. Essays in Understanding, 1930-1954. Edited by Jerome Kohn. New York: Harcourt, Brace & Co.

Hegel.G.W.F. 1967. The Phenomenology of Mind. Translated, with an introduction and notes by J. B. Baillie. New York: Harper Torch Books.

Hobbes Thomas 1928. The Elements of Law, Natural and Politic. Cambridge, Eng.,U. P.

Machiavelli, Niccolo. 1950. The Prince and the Discourses. New York: The Modern Library.

Manuel, Frank Edward. 1956. The New World of Henri Saint-Simon. Cambridge: Harvard University Press.

Mannheim, Karl. 1936. Ideology and Utopia; an introduction to the sociology of knowledge. London, K. Paul, Trench, Trubner & co., ltd.; New York, Harcourt, Brace and company.

Marx, Karl. 1965.The German Ideology. London: Lawrence.

McIlwain, Charles Howard. 1932. The growth of political thought in the West from the Greeks to the End of the Middle Ages. New York: Macmillan.

Montesquieu. 1734. Considerations on the Causes of the Greatness of the Romans and their Decline. Translated, with Notes and an Introduction by David Lowenthal. New York: The Free Press.

----------------. 1973. Persian Letters. Translated with an introduction and notes by C.J Betts. London: Penguin Books.

----------------. 1994. The Spirit of the Laws. Translated and Edited by Anne M. Cohler, Basia Miller, and Harold Stone. New York: Cambridge University Press.

Plato. 1992. The Republic of Plato. Translated with Notes, an interpretive essay, and a new introduction by Allan Bloom. USA: Basic Books.

--------. 1997. Plato Complete Works. Edited by John M. Cooper. Cambridge: Hackett Publishing Company.

Rousseau, Jean-Jacques. 1967. The Social Contract and Discourse on the Origin of Inequality. New York: Pocket Books.

Sealey, Raphael. 1976. A history of the Greek city states, ca. 700-338 B.C. Berkeley: University of California Press.

Strauss, Leo. 1964. The City and Man. Chicago: Rand McNally.

---------------. 1991. On Tyranny. Edited by Victor Gourevitch and Michael S. Roth. New York: The Free Press.

---------------. 1993. Faith and political philosophy: the correspondence between Leo Strauss and Eric Voegelin, 1934-1964. Translated and edited by Peter Emberley and Barry Cooper. USA: Pennsylvania State University Press.

Thucydides. 1972. History Of the Peloponnesian War. London: Penguin Books.

Tocqueville, Alexis de. 1945. Democracy in America. Vol 1,2. New York: Vintage Books.

-----------------. 1955

by Stuart Gilbert. Garden City, N.Y: Doubleday.

------------------. 1985. Selected letters on politics and society. Edited by Roger Boesche . Translated by James Toupin and Roger Boesche. Berkeley: University of California Press.

Turnell, Martin. 1953. Baudelaire: a Study of His Poetry. London: Hamilton.

Waxman I. Chaim, ed. 1968. The End of Ideology Debate New York: Funk & Wagnalls.

